


گۆڤارێکی زانستی شەرعی و ڕۆشنبیری،وەرزییە
دەستەیەك لە مامۆستایانی ئاینی دەری دەکات

خاوەن ئیمتیاز و سەرنوسەر
م/ عبداللطیف أحمد مصطفی

---

# خطبة الحاجة

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله ، نحمده ، ونستعينه ، ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ، ومن سيئات أعمالنا ، من يهد الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له .

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له.

وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾.

(آل عمران:١٠٢)

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾

(النساء:١)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً . يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾.

(الأحزاب: ٧٠/٧١)

**أما بعد :**

فإن خير الحديث كتاب الله ، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ ، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار .

# خطبة الحاجة

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله ، نحمده ، ونستعينه ، ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفســـنا ، ومن سيئات أعمالنا ، من يهد الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له .

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له.

وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾.

(آل عمران:١٠٢)

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾

(النساء:١)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا . يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾.

(الأحزاب:٧١/٧٠)

**أما بعد :**

فإن خير الحديث كتاب الله ، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ ، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار .




بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە لە دڵی زۆرێك لە خوێنەرانی بەڕێز ڕەزامەنـدی بـۆ گۆڤاری ڕێگای ڕاست دانا ، بەشێوەیەکی وەها کەلەماوەیەکی زۆر کەمدا نوسخەکانی گۆڤار لە کتێبخانەکاندا نەمان و بە هەمولایەکدا بلاَو بوونەوە.

ئەم بلاَوبونەوەیە خێرایەش دوای فەزڵ و ویستی خوا دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێـك کـە لـە گۆڤارەکەدا بەدی دەکرێن :

١- گۆڤارەکە ژمارەیەك لە مامۆستایانی ئاینی و هەڵگرانی بڕوانامەی کۆلێژی شەریعەو دیراساتی ئیسلامیو زمانی عەرەبی، بەرهەمی تێـدا بـلاَو دەکەنـەوە، کـە تایبەتمەنـدن لـە بوارەکانی شەریعەتدا .

٢- جگە لە ڕەزابونی پەروەردگاریان مەبەستیان هیچ لە ماددەو زەعامەت نییە.

٣- جگە لە قورئانەکەی پەروەردگار و سوننەتەکانی نێرراوەکەی بۆ لای هیچ شتێکی تـر خەڵکی بانگ ناکەن .

٤. بانگەوازیکاری گروپێکی حزبی ، یاخود مەزهەبێکی فیقهی، یا تەریقەتێکی داهێنراو نین ، بەڵکو بانگەوازیەکەیان درێژبونەوەیەکی سروشتی(الامتداد الطبيعي) ئیسـلامەو هـەموو ئەو خەڵکە موسوڵمانە دەگرێتە خۆی کە لەسەر فیترەتی ئیسلامەتی ماون .

٥. هەوڵیان بۆ ئەوەیە خەڵکی دروست لە دینەکەی خوا حاڵی بن و زیاتر ئاشنای ڕێگـای ڕاست بن و بەردەوامییان هەبێت لەسەری بۆ ئەوەی بەختەوەری دونیاو قیامەت بن و بگـەن بە بەهەشت إن شاء الله .

٦. گۆڤارەکە لە پیاوانی ئەو گەلە کوردە موسوڵمانە دەردەچێت و هەر بۆ خزمەت کردنی ئەو گەلەشە .

وە داواکارم لە پەروەردگار زیاتر نیەتی هەموولایەکمان پاك بکاتەوەو هیدایەتمان بدات بۆ زیاتر خزمەت کردن لە پێناوی ڕەزامەندی خۆی .

لەگەڵ ڕێزی براتان : **سەرنوسەر**

## هەرکەسێک

**پابەند بێت بە ئیسلام ئەوە پابەندە بەقورئان،**

**وە قورئانیش حەقەو ،**

**حەقیش تەنها ڕێبازەکەی پێغەمبەرە ﷺ**

**کە لە ڕابردودا خۆی و هاوەڵانی لەسەر بووەو**

**ئێمەی لەسەر جێ هێشتوە** (ترَكنا عليه رسول الله).

**وە بووە بەڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ،**

**وە تەنها ئەو ڕێبازەش ڕێگای بەهەشتە.**

یاخود دەوترێت :

**هەر کەسێ پێشەواکەی پێغەمبەربێ (ﷺ)**

**وەشوێن کەوتەی ابوبکر وعمر وهاوەڵان بێ**

**(واتە لەسەر مەنهەجی سەلەف بێ)،**

**ئەوە شوێن حەق کەوتووە"**

**وەهەرکەسێکیش شوێن حەق کەوتبێ، شوێن ئیسلام کەوتووە"**

**وەهەرکەسێکیش شوێن ئیسلام کەوتبێ ، ئەوە شوێن**

**قورئان کەوتووەو قورئانیش ڕێگای ڕاستی خوایە و**

**گەیەنەرە بە بەهەشت.**

# بابەتەکان




بسم الله الرحمن الرحيم

دوای ئەوەی کە زانیمان ڕێگای ڕاست چۆنە و کامەیە لەژمارە (یەکی) گۆڤار ، بە پێویستمان زانی لەم ژمارەیەشدا بزانین **ڕێبوارانی ڕێگای ڕاست کێن وسیفەتەکانیان چین** .

خوای پەروەردگار لە ئایەتەکانی کۆتاییی(٦٣-٧٦) سورەتی فورقان باسی بەندە ڕاستەکانی خۆی دەکات، وەسیفاتە جوانەکانیان دەخاتە ڕوو. وە هەروەها باس لەو ڕێزو پاداشتە گەورەیەش دەکات کە پێیان دەبەخشێت .دەفەرموێت:

[وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ] واتە :بەندەکانی بەخشندە.

وە دوو جۆر بەندە هەیە چونکە بەندایەتی دووجۆرە :

**جۆری یەکەم** : بەندایەتی‌یەکی بێ ویست و ئیرادە بۆ پەروەردگارێتی خوای گەورە. واتە بەندەی کراو بەبەندە(**عبدٌ بمعنی مُعَبَّد**) بێ هەڵبژاردن وویست ومەبەستی بەندە خۆی.

ئەو جۆرە بەندایەتیەش هەموو بونەوەر دەگرێتەوە، بە گیاندارو بێ گیان . موسوڵمانان و کافر . هەر هەموویان مل کەچ و ژێرباری**ویستە قەدەریە بونەوەری یەکانی پەروەردگارن** و، پەروەردگارێتی خوای گەورە زاڵە بەسەریانەوە، کەس ناتوانێت ویست و ئیرادەی قەدەری خوا ڕەت کاتەوە. واتە کەس ژیان ومردن وتەمەن کورتی و درێژی ونێرێتی ومێیەتی و، سپێتی ورەشێتی و، ساغی ونەساغی خۆی بەدەست نییە.

[إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا][1] .

واتە هیچ یەکێك نیە لەئاسمانەکان وزەویدا ئیللا بەسیفەتی بەندە دەگەڕێتەوە بۆلای خوا

**دووەم**: بەندایەتیەك بە ویست و ئیرادەی بەندە خۆی بۆ لایەنی پەرستراوێتی خوای گەورە.ئەوەش بەندایەتی ئەوانەیە کە خۆیان بەویست وئیرادەی خۆیان، **ئیرادەی شەرعی‌و دینی خوا** بەجێ دێنن (**عبدٌ بمعنی عابد**).

(١) (مریم:٩٣) .

بەندایەتی کردنێکە ئەوپەڕی زەلیلی‌و، تەواوی خۆش ویستنی تێدایە بۆ پەرستراوێتی بەخشندەی خاوەن ناوە جوان وسیفاتە بەرزەکان .

ئەو بەندایەتی‌یەش تایبەتە بە بڕواداران لە پێغەمبەران و پیاو چاکان و دۆستان و خۆشەویستانی خوا .

وە ئەو بەندایەتی کردنەشیان فەزڵی خواو ڕەحمەت و بەخشندەییەکەیەتی کەوای لێ کردون بەوشێوەیە چاك بن. بۆیە خوای گەورە بە بەندەکانی بەخشندە (عبادُ الرحمن) ناوی ناون، چونکە ئەوان ڕەجای ڕەحمەتی ئەو دەکەن وئەویش ڕەحمی پێ کردون و هەڵیبژاردون بەبەندەی تایبەتی خۆی .

## سیفەتی یەکەم

## [خۆبەکەمگری‌وئارامی‌وسەنگینی]

## [التواضع والسكينة والوقار ]

(الذين يمشون على الأرض هونا)

واتە ئەوانەن کە دەڕۆن لەسەر زەوی بە نەرم و نیانی و خۆ بەکەم گری و ئەدەب و ڕێز و ئارامی و سەنگینی‌یەوە، بێ لە خۆبایی بوون و خۆ بەزل زانین وفیزو شانازی .

وەئەم سیفەتە جوانە تەنها سیفەتی ڕۆیشتنەکەیان نییەو تایبەتیش نییە بەو کاتەیانەوە، بەڵکو ئەوان ڕەوشتیان بەگشتی بەرزەو جوانەو کەسانێکی خۆ بەکەم گر

(متواضـع) و لەسـەر خـۆو بـەئارام و سـەنگین (حُلماء وقورين) وه له حەدیسدا هاتووه كه:

(المؤمنون هينون لينون كالجمل الأنـف ، إن قيد انقاد، وإن أنيخ استناخ)[٢].

واته بڕوادارانـی ڕاست لەسـەر خـۆو نـەرم و نيانن ...

وه پێغەمبـەری خـواﷺ بـە یـەكێ لـە هاوەڵانی فەرموو: تۆ دوو سیفەتت تێدانـە، كـە خوا خۆشی دەوێن : (( الحلـم والأنـاة [٣] ))[٤].

پشـوو درێـژی و سـەغلەت نـەبون و زوو هەڵنەچون،وه لەسەر خۆیی و بەئارامی.

وه پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: پێتـان بڵێم كێ ئاگری دۆزەخی لێ حەرامە ؟

وتیان بەڵێ:

فەرمووی:(على كل قريب هيِّنٍ سهل لين)[٥].

واته: ئـاگری دۆزەخ حەرامـە لەسـەر هـەموو بڕوادارێكی نزیك و ئاسـان و نـەرم و نیـان واتـە بڕوادارێك كـە خـۆ بەكـەم گـرو نزیك دابنـێ لـە ئاسـتی بـڕواداران وەڕەوشـتی هەڵسـوكەوتی ئاسان و سادەو نەرم بێت لەگەڵیان .

زانایانی تەفسیر فەرمویانە .

(٢) الترمذي: ((حسن لغيره)) (مشكاة المصابيح).

(٣) الأناة التثبت في الأمور. و(الحليم) هو الذي لا يسـتخفّه شيءٌ من عصيان العباد، ولا يستخفه الغضب الغضب عليهم، ولكنه جعل لكل شيء مقدارا فهو منته إليه.

(٤) [ م : ١٧ ].

(٥) ((أحمد والترمذي: (٢٤٩٠) صححه الألباني )).

(يحتمل أن يكـون ذلـك وصـف مشـيهم علـى الأرض أو وصـف أخلاقهـم في جميـع أحـوالهم ، وعـبر بالمشـي علـى الأرض عـن جميـع تصرفاتهم مدة حياتهم)[٦].

واتـه : دەگـونجێ ئەوسـیفەتە (هونـا) سـیفەتی ڕۆیشـتنەكەیان بێـت ، وه دەشـگونجێت وەسـفی ڕەوشـتەكانیان بێـت بەگشـتی لـە هـەموو حاڵەتێكیانـدا سـەرەڕای حاڵەتی ڕۆیشتنیان .

كەوابو مەبەست بـە ڕۆیشـتن لـە ئایەتەكـەدا تێكـڕای هەڵسـوكەوت و خوڕەوشـتیانە لـە ماوەی ژیانیاندا .

وه ئیمامی القرطبي فەرمویەتی :

(قال ابن عطية : ويشبه أن يتـأول هـذا علـى أن تكـون أخـلاق ذلـك الماشـي هونـا مناسـبة لمشيه ، فيرجع القول إلى نحو مـا بينـاه . وأمـا أن يكون المـراد صـفة المشـي وحـده فباطـل ، **لأنــه رب مــاش هونــا رويــدا وهــو ذئــب أطلس...)**[٧].

وه ابن عطية فەرمویـەتی: لـەوە دەچـێ كـە وەسف كراو بەوسیفەتە هەموو ڕەوشـتەكانی ئەوكەسە بێـت، بۆئـەوەی ڕەوشـتی وەكـو ڕۆیشتنەكەی به ئارام و بەڕێز بێت.

بـەڵام وا بزانرێـت كـە وەسـف كـراو بـەو سیفەتە تـەنها ڕۆیشـتنەكەیەتی، ئـەوە گومـان

(٦) ((التسهيل لعلوم التنـزيل)) (٥١٧)..

(٧) ((الجامع لأحكام القرآن )) (٦٧/١٣).

و لێکدانەوەیەکی پوچەڵ و ناحەقە ، چونکە زۆر کەس هەیە بە نەرمی و لەسەر خۆیی دەڕوات بەڵام لە ناخ و ڕەوشتیدا گورگێکی گەڕە کە پیس ترین و دڕ ترین گورگە، کە کوڵکی وەریوە لە فێڵبازیو دەرون پیسی و دڕندەیەتیدا .

کەواتە تەنها نەرم ڕۆیشتن مەبەست نییە، وە هەروەها ئایەتەکە مەدحی زۆر بەهێواشی و لاوازی ڕۆیشتنی وەك نەخۆش ناکات. وە پێشەوایانی سەلەف ڕقیان لەو جۆرە ڕۆیشتنانە بوو .

ابن کثیر لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: دەگێڕنەوە لە (عمر) ڕەزای خوای لێ بێت کە گەنجێکی بینی بەلاواز و هێواشی دەڕۆیشت. ئەویش پێی فەرموو : چیتە، ئەوە نەخۆشی؟! . وتی نەخێر . ئەویش داری لێ بەرزکردەوەو فەرمانی پێ کرد بەپتەوی بڕوات. چونکە عمر ڕەزای خوای لێ بێت چاك لەمانای ئایەتەکان تێ دەگەیشت، وە دەیزانی کە مەبەست بە (هونا) لاواز ڕۆیشتن نییە بەڵکو ڕەوشت بەرزی و خۆبەکەم زانینە

وە لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە پێشەوایانی سەلەف چەند بۆچونێکی لێك نزیکیان هەیە لەم شێوەیە:

١/ هونا: أي بالطاعة والمعروف والتواضع

واتە: لە زەویدا دێن و دەچن بە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خواو ئەنجامدانی کاری چاکەو خۆ بەکەم گری یەوە.

٢/ لا يمشون لإفساد ومعصية ، بل في طاعة الله والأمور المباحة.

واتە : ناگەڕێن بۆ خراپەنانەوەو تاوان کردن، بەڵکو بۆ تاعەتی خوا، وە بۆ کاری دروست .

وە خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا نەهی کردووە لە ڕۆیشتنی بەفیزو لەخۆبایی بوون :

[وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الْأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً ] [٨] [وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ] [٩]

واتە: لەسەر زەوی مەڕۆ بەفیز و خۆ بەزل زانی و لەخۆبایی بوون، چونکە تۆ ناتوانیت زەوی کون کەیت بە ڕۆیشتنە بە هێزەکەت لەسەری وە هەروەها بالآی تۆ ناگاتە بەرزی بالآی کێوەکان .

کەواتە تۆ دروست کراوێکی لاوازو بچوکیت لەسەر زەوی . خۆت لێ نەگۆڕێت . وە پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش ناوێن کە لە خۆبایین و شانازی بە خۆ دەکەن.

وە پێغەمبەرﷺ : فەرمویەتی:

(بينما رجل يمشي في حُلّة تعجبه نفسه ، مُرجّل رأسه، يختال في مشيته ، إذ خسف الله به، فهو يتجلجل في الأرض إلى يوم القيامة)[١٠].

---

(٨) (الاسراء:٣٧)

(٩) (لقمان: من الآية١٨)

(١٠) [خ (٥٧٩٠)م (٢٠٨٨)].

واته : له كاتێكدا كه پیاوێك دهڕۆیشت به پۆشاكێكی وا كه لهخۆی ڕازی بوو ، قژی داهێنا بوو، وه له ڕۆیشتندا فیزو زلی لهخۆبایی بونی تێدا بوو، خوای گهوره ڕۆی چواند بهناخی زهویدا . وه ئهو تائێستاش ههر پیایدا ڕۆدهچێت تا ڕۆژی قیامهت لهو حاڵهتهدا دهمێنێتهوه). پهنا بهخوا .

وه لوقمان فهرمانی به كوڕهكهی كرد به ڕۆیشتنێكی مام ناوهندی وهك قورئان باسی دهكات :

[وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ ][11].

**واته**: (اعتدل فيه ، ولا تُسرع إسراعا يدل على البطش والخفة ، ولا تبطيء إبطاء يدل على الفخر والبطر)[12].

واته: مام ناوهندبه لهڕۆیشتندا، واته بهپهله مهڕۆ پهلهیهكی وهها كه نیشانهی هەڵەشەیی وسوكیوكەم عەقڵیە .وەهەروەها واش به هێواشی مهڕۆ كه نیشانهی خۆبهزل زانین و به قورس دانان وشانازی بهخۆكردنه.

وه پێغهمبهرﷺ فهرمویهتی :

(إذا أتيتم الصلاة فلا تأتوها وأنتم تسعون وأتوها وأنتم تمشون، وعليكم السكينة ، فما أدركتم منها فصلوا وما فاتكم فأتموا)(فإن أحدكم إذا كان يعمد إلى الصلاة فهو في الصلاة)[13]

واته: ئهگهر بۆ نوێژ هاتنه مزگهوت بهپهله بۆی مهیهن ، بهڵكو بهو شێوهیه وهرن كه به ئارام بن و ڕێزو ڕهوشت بهرزیتان پێوه دیار بێت . وهخهمی دوا كهوتن و فریانهكهوتنتان نهبێ ، چونكه ئهوهندهی كه پێڕاگهیشتن بیكهن لهگهڵ ئیمامهكه بهجهماعهت . وه ئهوهش كه له دهستتان چوو خۆتان دوای سهلام دانهوهی ئیمام تهواوی بكهن.

وه ئێوه ههر لهو كاتهوه كه دهرچون بۆ نوێژ بۆتان حیسابه به نوێژ.

وه عبد الله ی كوڕی عباس رضي الله عنه فهرموی لهعهرهفهوه لهگهڵ پێغهمبهرﷺ گهڕامهوه بهرهو مزدلفه، فهرمووی: (أيها الناس عليكم بالسينة، فإن البر ليس بالايضاع)[14].

واته: ئهی خهڵكینه پێویسته هێمن و لهسهر خۆو به ئارام بن، چونكه چاكه بهپهلهكردن نییه.

وه شاعیرێك فهرمویهتی:

ولا تمش فوق الأرض إلا تواضعا
فكم تحتها قوم هم منك أرفع
و إن كنت في عز وحرز ومنعة
فكم مات من قوم هم منك أمنع

(11) (لقمان: من الآية١٩)).
(12) ((التسهيل))(٥١٧).
(13) [خ((٩٠٨)م (٦٠٢)] .
(14) [خ : (١٦٧١)م (١٢٨٢)]

واتە: لەسەر زەوی مەرۆ بە خۆ بەکەم گری نەبێت .

چونکە چەندان کەس کە لە ژێر گڵدان، لەتۆ بەرزتر بوون.

وەئەگەرچی تۆ لەعیززەت و دەسەلاٌت و پەناش دابیت. ئەوە چەندان قەوم مردون کە لەتۆ بەهێز ترو پارێزراو تربوون.

## ڕەوشت و عادەتی پێغەمبەرﷺ لە ڕۆیشتنیدا

علی کوڕی أبی طالب رضي الله عنه فەرموویەتی: وكان رسول الله ﷺ إذامشى تكفأتكفوا.كأنما ينحط من صبب. وقال مرة: إذا مشى تقلّع [(١٥)].

واتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەرۆیشت بەخشکە خشك نەدەرۆی (واتە قاچەکانی نەدەخشاند لەسەر زەویدا بەدوای خۆیدا ڕایانکێشی)، بەڵکو بەتەواوی لەزەوی بەرزدەبۆوەو جیادەبۆوە، وەکو ئەوەی لەبەرزاییەکی سەرەو لێژەوە دابەزێت و شۆڕبێتەوە .

((قال غير واحد من السلف : بسكينة ووقار من غير تكبر ولا تماوت ، وهي مشية رسول الله ﷺ ، فإنه مع هذه المشية كان كأنما ينحط من صبب ، وهذا يدل على أمرين:

(١) أن مشيته لم يمكن مشية بتماوت. ولا بمهانة. (٢) بل مشية أعدل المشيات.))[(١٦)]. وهي مشية الهَون والتكفؤ.

کەواتە مرۆڤ کە دەڕوات :

(١) یا بە لاوازی و خشەخش و بیٌ

(٢) دەسەلاٌتی و تەمبەڵی دەڕوات، وەك نەخۆش بەتەکان و پاڵ دەڕوات.

ئەمەش ڕۆیشتنێکی ناشرینە .

(٢) وە یا بە هەڵپە هەڵپ و هەڵبەزو دابەزو مشەوەشی و خۆشەڵەژاندن دەڕوات . وەك ڕۆیشتنی وشتری هەڵەشەو گەوج . کە ئەمەش ڕۆیشتنێکی ناشرینەو گەوجێتیو کەم عەقڵی خاوەنەکەی نیشان دەدات، بەتایبەتیش کە کاتی ڕۆیشتنەکەی زۆر مل بادات و سەری بۆ لای ڕاست و چەپ بسوڕێنێت .

(٣) وەیا بەلەسەر خۆییو ڕێزو خۆبەکەم گریو ئارامی بەسەر زەویدا دەڕوات کە ئەمەش ڕۆیشتنی بەندە ڕاستەکانی خوایە کە جوانترین ڕۆیشتنەو دوورە لە فیزو لە خۆبایی بوون ، وەهەروەها لە مردەڵۆکەییو ڕیایی .

تێبینی/* پێویستە موسوڵمان وریابێت لە ڕۆیشتنی لەسەر خۆی خۆ بەزل زانان، کە لە ڕۆیشتنەکەیان فیزو شانازی ناو دڵیان دەخوێندرێتەوە.

* وەهەروەها لە ڕۆیشتنیش بەسەیارە پێویستە ڕۆیشتنێکی بەڕەوشتانەو خۆبەکەم گرانەبێت. نەك بەهەڵەشەو پەلە پەل و دەرپەڕین و ئەولاو لاکردن و گاڵتە کردن ..

(١٥) تكفّى تكفيا: تمايل إلى قدام. ((النهاية ))(٨٠٥).

(١٦) ((زاد المعاد /١/١٦١)).

### سیفەتی دووەم

### [پشو درێژی و لێ بوردەیی لە جاهیل و نەفامان ]

### [الحِلْم، والعفو عن الجاهل ومقابلةُ المسيء بالإحسان،]

[وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً ]

وە ئەگـەر نەزانـەکان نەفامانـەو بـێ ڕەوشـتانە بەرامبـەریان دوان، ئـەوە وەڵامـی بـڕوادارە ڕاسـتەکان سـەلامەتیە، واتـە بـەر پەرچـی قسـەو تانـەو دوانـە ناشـرینەکانیان نادەنـەوە بەوێنـەی خـۆی وەکـو ئـەوان . وە خۆیـان ناهێننـەڕیزی ئـەوان، بـەڵکو بـە وتەیـەکی نـەرم و جـوان و سـەلامەت وەڵامیـان دەدەنـەوە بـە شـێوەیەکی وا کـە نەفامـەکان خۆیان تەریق بنەوەو شەرم بکەن .

وەیـا عـەفویان دەکـەن و لێیـان دەبـورن و بێ دەنگ دەبن بەرامبەریان وئیهمالیان دەکەن

[وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ ][17]

وە پێیـان دەڵـێن (سـەلام) واتـە سـەلامەت دەبن لە لایەنی ئێمەوەو هیچ ئـازارو وەڵامێکی ناشـرین نابیسـتن ، چـونکە ئێمـە وەکـو ئێـوە خراپـەتان بەرامبـەر ناکەینـەوەو وەڵامتـان نادەینەوەو خۆمان ناهێنینە ڕیزی ئێوە.

وەبـەردەوام ئەوشـێوە جوانـە سـیفەتی پێشەوایان بووە .

### سیفەتی سێهەم

### [ شەو نوێژ ]

### [ التهجُّد ]

[وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَقِيَاماً ]

لـەم ئایەتـە پیرۆزەشـدا ڕونکردنـەوەی حاڵیـانی تێدایـە لەبەرامبـەر پـەروەردگاریان واتـە **دوای ئـەوەی کـە باسـی حـاڵی ڕۆژانـەی ئـەوانی کـرد لـە نـاخی خۆیانـدا و لەگـەڵ دەوروبـەریش ، ئـەمجار باسـی حـاڵی شـەوانەیان دەکـات لەگـەڵ پـەروەردگاریان** کـە چـۆن لـە شـەواندا ، لـە کڕنـۆش بـردن و ڕاوەسـتانی نـاو نوێـژدا دەمێننـەوە بـۆ مـل کەچـی نوانـدن و بەندایـەتی کـردن بـۆ پەروەردگاریان .

کەواتە بەندە ڕاستەکانی خـوا ئەوانـەن کـە لـە شـەودا دەمێننـەوە بـۆ پـەروەردگاریان بـە تەنها، لە حاڵـەتی سـوجدە بـردن و ڕاوەسـتان بـۆی لـە نوێـژدا . واتـە شـەو نوێـژ دەکـەن. کەواتـە مانـەوەی شـەو و نەنوسـتنیان لەبـەر خوا پێویستە بە نوێـژو دوعـا و زیکـرو قورئـان خوێنـدن بێـت، وەك قورئـان ئامـاژەی بـۆ کـردووە بـە دوو وشـەی (سـجدا وقیامـا) لـەم سـورەتەدا، وە لەسـورەتی تریشـدا بەهـەمان شێوە باسی کردون وەك :

[ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّه ][18] .

---

(١٧) (القصص:٥٥)

(١٨) (الزمر: من الآية٩)

واتــە : ئایـا ئــەو کەسـەی کـە بەردەوامـە لەســەر عیبــادەتی خــوا، بەتایبــەتیش لــە باشـــترین کاتـــدا کـــەکاتی شـــەوەو دوورە لـــەڕیایی. بـــە بـــاش تـــرین عیبـــادەت کـــە عیبادەتی نوێـژە ، نوێـژی شـەو کـە زۆر تێیـدا ڕادەوەسـتێت و قورئـانی تێـدا دەخوێنێتـەوەو لــە سـوجدەدا دەمێنێتــەوەو دوعــا دەکــات وقورئـانی تێـدا دەخوێنێتـەوەو، لـە سـوجدەدا دەمێنێتـــەوەو، دوعـــا دەکـــات وخۆپـــارێزی دەکــات لــە ســزای دوا ڕۆژو، مەترســی ئــەو ڕۆژەی هەیەو، بە هیـوای بـەزەیی و ڕەحمـەتی پەروەردگاریشـیەتی وهـەوڵی دەسـت خسـتنی دەدات. ئایا ئەو عەبدە چـاکە وەکـو کەسێکی دوور لە خـواو بـیٚ ئاگـا لێی وایـە . نـەخێر بـیٚ گومان.وە دەفەرموێت :

[ تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ][19] .

واتـــە: لـــە شـــەواندا کەلەکـــەکانیان لـــە جێگاکانیــان دوور دەکەونــەوەو هەرخــەریکی خــەو و ئیسـراحەت نـین لـەناو جێگـادا، بـەڵکو شەو هەڵدەستن بۆ بەندایـەتی کـردن بـۆ خـواو داوا لێ کردنـی بـەترس و ئومێـدەوە، واتـە لـە نێـوان تـرس و ڕەجـادان، چـونکە زۆر لـە خـوا دەترســن و هیــوای زۆریشــیان بەڕەحمەتـــە فـــراوان و زۆرەکـــەی هەیـــە . لەبـــەر ئـــەوە ترسـەکەیان لـە خـوا دەیانگرێتـەوە لـە تـاوان،

وە ئومێدبونیان بەڕەحمەتی پاڵیـان دەنـێ بـۆ چاکەکان . وەدەفەرموێت:

[ كَانُوا قَلِيلاً مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ . وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ][20] .

واتـە ئـەهلی بەهەشـت –کـە لـە خۆشـترین حاڵدا دەبـن– ئەوانـەن کـە لـەدونیادا چـاکەکار بــون، وە کــەمێك لــە شــەودا دەخــەوتن، وە زۆربـەی شـەویان بـە عیبـادەتی خـوا دەبـردە سەر بە نوێژو قورئان خوێنـدن و زیکـرو دوعـا. وە لـــەکۆتایی شەوەکانیشـــدا لـــە پارشـــێوان دوای شەونوێژێکی درێژو عیبـادەتێکی خـالیس و بـەردەوام، داوای لێخـۆش بونیـان دەکـرد لـە خوا تا لە گوناهیان ببورێت .

ئەوە حاڵی چاکەکارانە : عیبـادەت کردنـی خـوا بـە گـوێرەی قورئـان وسـوننەت، وە بـە خالیسیو دوور لە ڕیـایی، لـەتاریکایی شـەواندا کـاتیٚ کـە خـەڵکی لـە خرپـەی خـەودان. وە دوای ئەو عیبادەت کردنـەش زیـاتر خۆیـان بـە کەمتەرخـەم دەزانـن نـەك لـە خۆبـایی بـبن و شانازی پێـوە بکـەن و خۆیـانی پـیٚ هەڵکێشـن بـەڵکو دوای ئـەوەش داوای لێبـوردن لـە خـوا دەکـەن ﴿والمستغفرين بالأسحار﴾. وە لـەخوا دەپاڕێنـەوە لـە گوناهیـان ببورێـت بـە فـەزڵ و ڕەحمەتی خـۆی، وە داوا دەکـەن لـەخوا بیـان پارێزێت لە سزای دۆزەخ .

وەك دەردەکەوێت لە:

---

(١٩) (السجدة:١٦)

(٢٠) (الذاريات:١٧-١٨).

## سیفەتی چوارەم

## [ ترسان لە ئاگر، وە پاڕانەوە لە پەروەردگار ڕزگاریان کات لێی ]

## [الخوف من النار ، والتضرّع لربهم أن يتجّيهم منها]

[وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا . إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا]

(الفرقان:٦٦،٦٥)

واتــە بەنـدە ڕاسـتەکانی خـوا ئەمانـەن کـە سـەرەڕای جـوانی و بـەرزی سـیفاتەکانیان و بـاش مامەڵـە کردنیـان لەگـەڵ خـەڵکیو چـاك عیبادەت کردنیـان بـۆ پـەروەردگار دەشترسـن لە سـزای خـواو دەڵێن : ئـەی پـەروەردگارمان سـزای دۆزەخمـان لەسـەر لادە، بـە لێخـۆش بونـت لـە گونـاهی ڕابردوومـان و پاراسـتنت بۆمان لە داهاتومان.

چونکە سزای دۆزەخ بەردەوامـەو پابەنـدەو لـە مـرۆڤ جیانابێتـەوە. واتـە : هـەر ئەوەنـدە مرۆڤ کەوتە ناویـەوە دوای ئـەوە پـەنا بـە خـوا — ئـەو سـزایەی لێ جیانابێتـەوە هـەروەکو چـۆن خـاوەن قـەرز واز لـە قـەرزدار ناهێنێـت و بەردەوام داوای لێ دەکاتەوەو بواری نادات.

[إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا] .

بەڕاسـتی دۆزەخ قەرارگاوشـوێن مانەوەیەکی زۆر خـراپ و ناخۆشـە، لەبەرئـەوە زۆر زەرورە پـەنای لێ بگیرێـت بـەخوا، وەخۆپارێزی بکرێت لە ڕێگاکانی.

## سیفەتی پێنجەم

## [مامناوەندیێتی لە بەخشینی ماڵدا، نەك ئیسراف، یابەخیلی]

## [ إخراج الواجب والمستحب في النفقات والتوسُّط في ذلك وترك الإسراف والإقتار]

[ وَالَّذِينَ إِذَا أَنْفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا ]

(الفرقان:٦٧).

بەنـدە ڕاسـتەکانی میهرەبـان ئەوانـەن کـە بەخشـینەکەیان لـە ڕێگـەی شـەرعیدایەو، مـام ناوەندیـیە لـە نێـوان ئیسـراف و بـەخیلی، وەدووره لە زێدەڕەوی و کورت ڕەوی .

کەواتــە لــەم سـیفەتە جوانــەی (عبـاد الرحمن) چەند لایەنێك بەرچاو دەگیرێت :

(١) بەخشین سیفەتی بەندەکانی خوایـە بـە هـەردوو شـێوەکەیەوە بەخشـینی واجـب و بەخشینی سوننەت و خێریش.

بەخشینی واجب وەك زەکـات و کـەفارەت و حەقی خۆت و خێزان و کەس وکارت،

(وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ )[٢١]

وە بەخشینی سوننەت وخێریش لـە پێنـاوی خـوا بـۆ بڵاوکردنـەوەی دینەکـەی و یارمـەتی قوتابیان و بانگەوازی کارانی ڕێی خوا.

[وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ][٢٢]

---

(٢١) (الاسراء: من الآية٢٦).

(٢٢) (البقرة: من الآية٣)

(٢) بەخشین نابێت زێدەڕەوی و دەست بڵاوی تێدابکرێت ولەسنوور بەدەربێت، چونکە ئیسراف کردن لە لایەنێك دەبێتە هۆی ئیهمال کردنی لایەنێکی ترو نەدانی حەقێکی تر.بەمەش زەرەرمەندو گوناهبار دەردەچێت.

وە خوای پەروەردگاریش نەهی کردوە لە ئیسراف و بە خراپی داناوەو عاقیبەتەکەیشی پەشیمانیو زەرەرمەندیەیە.

[وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيراً . إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُوراً][٢٣] .

[ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَحْسُوراً ][٢٤]

(٣) وە کەمتەرخەمی و بەخیلیو چروکی لە بەخشیندا گوناهێکی گەورەیە و سیفەتێکی ناشرینەو حەق خورانی خەڵکییە و قەرزدار بوونی حەقی خواییە.

[وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَحْسُوراً] .

(٤) هەربەخشینێك لە ڕێگەی بێ شەرعیدا بێت ئەوە زێدەڕەوییەو ئیسرافەو گوناهەو لێپرسینەوەو موحاسەبەی خوایی لەسەرە لە دوا ڕۆژدا . وەهەر ماڵێکیش لە ڕێگەی خوادا بەخیلی تێدا بکرێت، ئەوە کەمتەرخەمییەو دیسان لێپرسینەوەی دێتەسەر .

(٥) بەخشینی باش ئەوەیە کە لەڕێگا شەرعییەکاندا بێت و مام ناوەندی بێت .

*(والظاهر أن التوسط في الإنفاق الذي مدحهم به شامل لإنفاقهم على أهليهم، وإنفاقهم المال في أوجه الخير)[٢٥] .

*(فنهى عن الطرفين، وأمر بالتوسط بينهما وهو القوام، وذلك في الانفاق في المباحات وفي الطاعات، وأما الانفاق في المعاصي فهو إسراف، وإن قلّ)[٢٦] .

کەواتە: }مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کە بەندە ڕاستەکانی میهرەبان لە بەخشین و ماڵ خەرج کردنیان لە بوارە شەرعییەکاندا زێدەڕەوی و ئیسراف ناکەن، چونکە بەخشینی ماڵ لەلایەنێکدا زیاد لە حەقی خۆی، دەبێتە هۆی ئیهمال کردنی حەقی لایەنێکی تر ، یا برسی کردن و بەرەڵاکردنی خێزان و منداڵ.

وەهەروەها بەخیلیو چروکیش ناکەن لە بەخشیندا بەشێوەیەکی وەها کە حەقەکانی سەرشانیان نەدەن، یا ماڵ و منداڵیشیان برسیو ڕەزیل بکەن.

بەڵکو مام ناوەندن لە بەخشیندا و دادپەروەرانە حەقی هەموو بوارەکان لە بەرچاو دەگرن و هیچ لایەنێك ئیهمال ناکەن.

وە میان ڕەوێتی هەموو کەسێك بە گوێرەی حاڵ و گوزەران و منداڵ و ئەرك و

(٢٣) (الإسراء : ٢٧)

(٢٤) (الاسراء: ٢٦-٢٧/٢٩).

(٢٥) (أضواء البيان) الشنقيطي.(٢٣٧/٦).

(٢٦) ((التسهيل)) ص٤٧٢.

ئیمان و سەبرەکەی و تواناو کەسابەتیەتی.

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ڕێگەی دابە أبوبکر ﵁ هەموو ماڵەکەی ببەخشێت لە ڕێی خوا، چونکە زێدەڕەوی و ئیسراف نیە لە ئاستی پتەوی ئیمانی ئەبوبکرو قەناعەت و سەبری خۆی و خێزانی. بەڵام بە سەعدی کوڕی أبی وقاصی فەرموو:

(إنك أن تذَرَ ورثتك أغنياء خيرٌ من أن تذرهم عالة يتكففون الناس)[٢٧].

واتە: ئەگەر تۆ منداڵ و میرات گرەکانت بە دەوڵەمەندی و بێ پێویستی جێ بهێڵێت خێر ترە بۆت لە وەی کە هەموو ماڵەکەت بکەیتە خێرو بە شێوەیەك جێیان بهێڵێت موحتاجی خەڵکی بن[٢٨]. میانڕەوێتی و مام ناوەندێتی پێویستە لە هەموو کارێکدا بەگشتی، وەلە ژیان و بژێوی و ماڵ بەخشینیشدا بەتایبەتی:

ولا تغل في شيء من الأمور واقتصد

كلا طرفي قصد الأمور ذميم

**سیفەتی شەشەم**

**[خوا بە تەنها پەرستن و پاکی و دووری لە هاوەڵ بۆ خوا دانان و هاوار کردنە غەیری ئەو ]**

**[الإخلاص لله في عبادته والسلامة والنزاهة عن الشرك]**

[ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ... ](الفرقان:٦٨).

وەبەندە ڕاستەکانی خوای بەخشندە ئەوانەن کە باوەڕیان وایە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە لە بونەوەردا جگە لە (الله). وە هەرشتێك یا یەکێکی تر غەیری خوا – وەك پێغەمبەران و فریشتەکان و جنۆکەو پیاوچاکان و پەیکەرو وێنەکانیان و گۆڕو مەزرگاکانیان – کە موشریك و نەفامەکان کردویانن بە پەرستراو (آلە) هیچیان پەرستراوی حەق نین[٢٩]. **وە شیاوی ئەوە نین ئیعتیقادی پەرستراوێتیمان پێیان بێت،** یا داوایان لێ بکەین و هاواریان بکەینێ و سەربڕین و نەزریان بۆ بکرێت و زەلیلیان بۆ بنوێنرێت، یا سوێندیان پێ بخورێت، وەیا بیانکەینە واسیتەو داوای شەفاعەت بۆ کردن و لە خوا نزیك کردنەوەیان لێ بکەین وەك عادەتی موشریکەکان، چونکە خوای گەورە نابێت بچوێنرێت بە کار بەدەستێکی بێ ڕەحم تا پێویستیمان بە واسیتەو تکاکار بکات بۆلای ئەو. بەڵکو خوای گەورە بێ واسیتە لێمان نزیکە. وە کە داوای لێ بکەین وەڵاممان دەداتەوە و زۆر لێبوردەو بەڕەحمەو دەرگای تەوبەو گەڕانەوەی ئاواڵەیە بۆ تۆبەکاران و بەخشش و میهرەبانیشی والآیەو نزیکە لە داواکاران.

---

(٢٧) [خ:(١٢٩٥)، م: (١٦٢٨)].

(٢٨) بڕوانە ((تفسير القرطبي)):( ١٣/٧٢ )

(٢٩) ((لەگەڵ ڕێزێکی تەواو زۆر زۆر بۆ پێغەمبەران و پیاو چاکان ،خوای گەورە پارمەتیان بدات شوێنیان بکەوین و بەر شەفاعەتیان کەوین )).

## سیفەتی حەوتەم و هەشتەم

## ﴿پاکی و دووریان لە گوناهەگەورەکان و خوێن ڕێژیو داوێن پیسی﴾

## ﴿السلامة من كبائر الذنوب والعفة عن الدماء (القتل) والأعراض (الزنا)﴾

[ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ] (الفرقان:٦٨) .

وەهەروەها ئەو نەفسەش ناکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی حەرام کردووە بە هیچ شێوەیەك و لەبەر هیچ هۆیەك تەنها بەحەق نەبێت.واتە مەگەر هۆیەکی حەق هەبێت خوێنی ئەو نەفسە حەلاڵ کات وەك: هەڵگەڕانەوەی لە دین، یاخود زینا کردن دوای شوکردن یا ژن هێنان، وەیاخود کوشتنی نەفسێك بەناحەق.

﴿ولا يزنون﴾: واتە زینا ناکەن .

تێبینی/ لە سیفاتەکانی پێشوی (عباد الرحمن) کە لە ئایەتەکانی پێش ئەم ئایەتەی ئێستا باس کران، بۆمان دەرکەوت کە ئەوان بەندەی تایبەتی پەروەردگارن و ئیمانیان ئەوەندە سەلامەت و بەرزە کە گاریگەری هەیە بەسەر ڕەوشت و هەڵسوکەوتیشیاندا و عەمەلی چاکیان زۆرەو شەو نوێژو لەخوا ترسانیان هەیەو لە سنوری مامناوەندیش دەرناچن و بەردەوام زەلیلیو موحتاجیش دەردەبڕن بۆ لای خوا وەداوای لێ دەکەن بیان پارێزێت لە ئاگری دۆزەخ .

کەوا بوو لە سیفەتەکانیانەوە دەرکەوت کە ئەوان لەوە دوور ترو پاك ترن کە گوناهە گەورەکان بکەن وەك شەریك بۆ خوا دانان و پیاو کوژی بەناحەق و زیناو داوێن پیسی . وەگومانی ئەوەیان پێ نابرێت کە لەو جۆرە گوناهە گەورانە نزیك ببن . بەلاَم دەبینین پەروەردگار دووربیانی لەم گوناهانەش باس کردووە و بە پاك لەم تاوانانە وەسفی کردوون . ئەمەش لەبەر چەند شتێك :

١/ بۆ ئەوەی بەندە ڕاستەکانی خوا بە ئاشکرا لە سیفاتی موشریکەکان جیابکرێنەوە کە شەریکیان بۆ خوا دادەناو کوشتنی بەناحەقیان دەکردو کچیان زیندە بەچاڵ دەکردو منداڵیان لەترسی برسێتی دەکوشت و زیناو داوێن پیسیان حەلاڵ کردبوو و لایان ئاسایی بوو. واتە لەو ئایەتەدا ئەوە دەردەکەوێت کە بەندە ڕاستەکانی خوا دوورن لەوسیفات و ڕەوشتە ناشرینانەی کە دوژمنانیانی لەسەرن .

لەم بارەیەشەوە ئیمامی القرطبي فەرمویەتی :

[وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ . وَلَا ...]

(إخراج لعباده المؤمنين من صفات الكفرة في عبادتهم الأوثان ، وقتلهم النفس بوأد البنات ، وغير ذلك من الظلم ، والاغتيال والغارات ، ومن الزنى الذي كان عندهم مباحا)[٣٠]

---

(٣٠) ((تفسير القرطبي)) (٧٣/).

وه (آلوسي) دهفهرمويّت :

((والمــراد مــن نفــي القبــائح العظيمــة التعـريض بمـا كـان عليـه أعـدائهم مـن قـريش وغيرهـم . وإلا فـلا حاجـة إليـه بعـد وصـفهم بالصـفات السـابقة مـن حسـن المعاملـة وإحيـاء الليـل بالصـلاة ومزيـد خـوفهم مـن الله تعـالى ، لظهـور اسـتدعائها نفـي مـا ذكـر عـنهم ...) فكأنـه قيـل : والـذين طهـرهم الله تعـالى وبـرأهم سـبحانه ممـا انـتم عليـه مـن الاشـراك وقتـل الـنفس المحرمـة كـالموؤدة ، والزنـا)). (روح المعاني)

(٢) وههــهروهها بــه پــاكودوور ڕاگرتنــی بهنـده ڕاستـهكان لـه گوناهـه گـهورهكان دوای وهسف كردنيان بـه سيفاته چاكهكان ، لهبـهر ئهوهيه كـه مرۆڤـی واههيـه سيفاته باشـهكانی پێشوی تێدا ههنه،واته شهو نوێژ دهكـات و لـه خـوا دهترسـیّو لێـی دهپاڕێتـهوه لـه دۆزهخ بيپارێزێت و بهسـهبرو لهسـهر خـۆو بهئارامـه و نـهرم ونيانـهو خـۆ بـه كـهم گـره بـهلام سـهير دهكـهيتلـه شـيرك خـۆ پـارێزی نـهكردووهو ئيعتيقادی بهغهيری خوا ههيه كـهسودو زيـانی بـه دهست بێت و داوا له غهيری خـوا دهكـات و واسيتهوشهفاعهتكار دادهنێتلـهنێوانخـۆيیو خـوادا بـهبیّ ئيزنـی ئـهو، وهسـهر بڕينيـان بـۆ دهكات و پشتيان پیّ دهبهستێت ... هتد

كـه ئهمانـهش هـهموويان شـهريك دانـانن بـۆ خوا و ديـن و عـادهتی موشـريكهكان بـوو نـهك ئهو دينه بێت كه پێغهمبهر ﷺ لـه خـواوه پێـی هاتووه .

وه مرۆڤــی واش ههيــه بــه ڕواڵــهت موسوڵمانی باشه و زيكرو يادی خـوا دهكـات و شـهو نوێـژيش دهكـات بـهلام ئامادهشـه كـه تـوڕه بـوو لهسـهر شـتێكی ناحـهق پياوێك بـه ناههق بكوژێت .

وهههـهروهها خـوا پهرسـتی وا ههيـه كـه چـاكهو عيبـادهتی زۆره بـهلام كـه بـۆی برهخسـێت و كهسـی لیّ ديـار نـهبێت خـۆی ناگرێـت لهبـهردهم ئـارهزوی نهفسـی و زينـا دهكات ...!! پهنا بهخوا .

كهواته بـهم ئايهتـه دهردهكـهوێت كـه مـرۆڤ تــهنها بــه ئهنجامــدانی سـيفاته جوانــهكانی پێشـوو نابێتـه بهنـدهی ڕاسـتی خـوا تـاوهكو خۆشـی پـاك نهكاتـهوهو بـه دوور نـهگرێت لـه سـيفاته ناشـرينهكان و تاوانــه گــهورهكانی وهكو شيرك و كوشتنی نابهههق و زينا .

وه مــرۆڤ ئهگــهر شــهوانه بــهردهوام نوێــژ بكــات و ڕۆژانــهش بــه ڕۆژو بێــت و هــهموو ماڵهكهشی بكاته خێرو بـهردهوام يـادی خـواش بكـات و خۆيشـی بـهوهلی و پيـاو چـاك بزانێـت ئهگــهر خــۆی بــهدوور نــهگرێت لــه گوناهــه گهورهكان بهتايبهتيش ئهو سـیّ گوناهـه ئـهوه به پياوی باش و عهبدی ڕاسـتی خـوا دانانرێـت لای خواو له تهرازوی قورئان و سوننهتدا .

كهواته گرنگ ترين كـار ئهوهيـه مـرۆڤ خـۆی پاك بكاتهوه له سيفاته ناشـرينهكان و گوناهـه

گەورەکان (التحلية والتصفية). ئەوجار خۆی برازێنێتەوە بەسیفاتە جوانەکان(التحلية والتربية)

بەڵام وەسف کردنیان بە خۆڕازاندنەوە بەسیفاتە جوانەکان، پێش وەسف کردنیان بە خۆ پاك کردنەوە لە سیفاتە ناشرینەکان، وەك ڕێز لێنانێکە کە بە مەدح کردنیان بەسیفاتی تەواو دەستی پێ کردووە .

وەلەم بارەیەشەوە موفەسیران فەرموویانە :

١- آلوسي: ((وقد ذكر الإمام الرازي أن ذكر هذا بعد ما تقدم لأن الموصوف بتلك الصفات قد يرتكب هذه الأمور تدينا فبين سبحانه أن المكلف لا يصير بتلك الخلال ذلك كونه عباد الرحمن حتى ينضاف إلى ذلك كونه مجانباً لهذه الكبائر .

وجوز أن يقال في وجه تقديم التحلية على التخلية كون الأوصاف المذكورة في التحلية أوفق بالعبودية التي جعلت عنوان الموضع)).

٢- القرطبي: ((وإنما صح تشريق عباد الله باختصاص الإضافة بعد أن تحلّوا بتلك الصفات الحميدة وتخلّوا عن نقائض ذلك من الأوصاف الذميمة ،فبدأ في صدر هذه الآيات بصفات التحلي تشريقا لهم ، ثم أعقبها بصفات التخلي تبعيدا لها ، والله أعلم))[31].

﴿گەورەترینی تاوانە گەورەکان﴾

(عبدالله)ی کوڕی مسعود ﵁ فەرموی[32]:

وتم : ئەی پێغەمبەری خوا: کام تاوانە گەورەترین تاوانە لای خوا ؟

فەرموی: أن تدعوَ لله ندا وهو خلقك:

واتە شەریك و هاوشێوەو هاوبەش بۆ خوا دابنێیت لە ئیعتیقاد یا لە پەرستندا لە کاتێکیشدا کە هەر خوا بە تەنهاو بێ شەریکی تۆی دروست کردووە .

وتم: دوای شیرك گەورەترین تاوان چی‌یە؟

فەرمووی: (أن تقتل ولدك مخافة أن يطعم معك). واتە: منداڵەکەی خۆت بکوژی لە ترسی ئەوەی لەگەڵتا بخوات و خواردنت کەم کاتەوە . وتم: لە پاش ئەوە چی؟

فەرموی: (أن تزاني حليلة جارك)

واتە: زینا لەگەڵ ئافرەتی جیرانت بکەیت ئەو لە تۆ ئەمین و تۆش بچیت خیانەتی لێ بکەیت و زینا لەگەڵ ئافرەتەکەیدا بکەیت[33].

ئەو جار عبدالله فەرمووی :

خوای پەروەردگاریش دڵنیایی کرد لە قسەی پێغەمبەرەکەی ﷺ و بەڕاست دانانی فەرموودەکەی ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە :

[وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا]

[ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ]

---

(٣١) ((١٣/٧٤)).

(٣٢) خ: ٤٤٧٧.م: ٨٦.

(٣٣) ((قال ابن السعدي:ونص تعالى على هذه الثلاثة، لأنها أكبر الكبائر: فالشرك فيه فساد الاديان، والقتل فيه فساد الأبدان ، والزنا فيه فساد الأعراض )).

واتە: هەرکەسێك ئەو تاوانە گەورانە بکات ئەوە بە سزای گوناهەکانی خۆی دەگات.

وەسزاکەشی بریتی‌یە لە :
[يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا](٣٤) .

واتە: عەزابی بۆ دووقات دەکرێتەوە و لەو سزا توندە دووبارە بووەشدا دەمێنێتەوە بە زەلیلیو ڕیسوایی و سوکی. کەواتە هەردوو سزای لاشەیی‌و ڕوحی لەسەر دەبێت .

چەند تێبینی‌یەك :

١* ئەوە سزای ئەوکەسانە بوو کە خاوەنی ئەوسێ تاوانە گەورەیەن (وەبێ تۆبە مردون).عەزابێکی چەندبارە بوەوەیان دەدرێت لەسەر شیرك و کوشتنی بەناحەق و زینا کردنیان .

واتە لەسەر شیرك بەردەوام نابێت ئەگەرچی تەنها هیچ تاوانی گەورەی تریشی نەبێت .

بەڵام ئەی کە تاوانە گەورەکانی هەبوو جگە لەشیرك . ئایا ئەوەیان لەو سزا بەردەوامەدا دەمێنێتەوە ؟

نەخێر مرۆڤی خوا بەتەنها پەرست (موحد) لە دۆزەخدا بەردەوام نامێنێتەوە، بەڵکو بەبەڵگەی قورئان و سوننەت هەموو بڕوادارێك دەبێت بچێتە بەهەشت و هیچ یەکێکیان لە دۆزەخدا هەتا هەتایی نەمێنێتەوە هەر چەندە گوناهی گەورەشی بوو بێت مادام شەریکی بۆ خوا دانەنابێت. وە لەحەقی ئەودا وشەی (يخلد فيه) بەمانەوەیەکی زۆر تەفسیر دەکرێت نەك هەتا هەتایی و بەردەوامی.

٢* موسوڵمان ئەگەر پیاوی بەناحەق کوشت یا زینای کرد ئەوە شایستەی چونە دۆزەخ و مانەوەیەکی زۆرە تیایدا.

خۆ ئەگەر کوشتنی موسوڵمانێکی بێ تاوان بە حەڵاڵ بزانێت ئەوە هەرپێی کافر دەبێت و هەتاهەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە . وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت:
[وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً](٣٥) .

٣* مەبەست بە چەند بارە بونەوەی سزا (يضاعف له العذاب) ئەوەیە کە لەسەر کوفرەکەیشی یان مەبەست پێی سزایەکی توندە والله أعلم. چونکە سزای خراپە بە ئەندازەی خۆی دەبێت لە لایەن خوای دادپەروەرەوە نەك زیاتر. وەك فەرموویەتی:
[ وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلا يُجْزَى إِلَّا مِثْلَهَا ](٣٦) .

## سیفەتی نۆیەم :

## ﴿تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆلای خوا لە تاوان﴾

## [التوبة عند صدوور شيء من الأثم]

(٣٤) (الفرقان:٦٩).

(٣٥) (النساء:٩٣).

(٣٦) (الأنعام: من الآية١٦٠).

دوای ئـەوەی کـە زانیمـان سـزای تـاوان بـارانی تۆبـە نـەکردوو چـییە . ئـەمجارە پـەروەردگار باسـی ئەوانـەمان بـۆ دەکـات کـە تۆبـەیان کـردووەو لـە جیـاتی شـیرك و کـوفر ئیمانیان هێناوەو، لە جیـاتی تـاوان کـردەوەی چاکە دەکەن. دەفەرمویێت:

[إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً . فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ . وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً] (الفرقان: ٧٠)

واتـە: بـەڵام ئەوانـەی کـە تۆبـە دەکـەن و دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـواو دەسـت هەڵـدەگرن لـە شـیرك و تـاوان ، وە ئیمـانێکی پـاك دێـنن بـەتاك و تەنهایـەتی خـوای پـەروەردگاری پەرستراو بە حەق . وەکردەوەی چاك دەکـەن بـە خالیسـی بـۆ خـوا و بـە پێـی سـوننەت و شەریعەتی پێغەمبەری خواﷺ .

ئەوانە نـەك هـەر سـزای چـەندبارە بـوەوەو تێیدامانـەوەیان لەسـەر نـییـە بـەڵکو بـە هـیچ شێوەیەك سـزا نـادرێن و لـەجیاتی سـزا خـوای گـەورە پاداشـتی چـاکیان دەداتـەوە چـونکە پـەروەردگار خراپـەکانیان دەگۆڕێـت بـە چـاکە بۆیان. وە خوای گەورە لێبوردەو لێخـۆش بـوو و بەبەزەییە .

* کەواتە خـوای گـەورە لـە دونیـادا تەوبـە قـەبوڵ دەکـات لـە کـافریش و پیـاو کـوژیش و زینا کاریش .

وەسەبارەت بە شوێن و چـۆنیەتی گـۆڕینی خراپە بە چاکە رای زانایان بەم شێوەیە:

١. هەنـدێ لـە زانایـان فەرمویانـە: ئـەو گۆڕینەوەیە **لە دونیادایە** نەك لە قیامەت.

واتە: خـوای گـەورە تـەوفیقیان دەدات، لـە جیـاتی کـوفرو شـیرکی جـاران گۆڕیـونی بـە ئیمانـدار، وە لـە شـوێنی گومـان و دوو دڵـی دڵنیـایی. وە لـە شـوێنی داوێـن پیسـی داوێـن پاکی. وەلە شوێنی تاوان گوێڕایەڵی.

واتـە جـاران موشـریك و تـاوان بـارو داوێـن پـیس بـون، ئێسـتا دوای تەوبـەی بەڕاسـتی خوای گەورە کردنی بە ئیمانداری چاکەکار.

٢. وە هەنـدێ لـەزانایان فەرمویانـە **لـە قیامەتـدا** خـوای گـەورە خراپـەکانیان بـۆ دەگۆڕێتەوە .

واتە سزای گوناهـەکانیان لەسـەر لادەبـات و پاداشتی چاکەیان بۆ دادەنـێ لـە شـوێنی[٣٧] . ئەمـەش ڕای کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵان و شـوێن کەوتەکانیانە.

* وەهەنـدێ لـە زانایـان فەرمویانـە: پـەروەردگار**بـە هـەردوو شـێوە** خراپـەکان دەگۆڕێـت بەچـاکە واتـە **لـە دونیـاش و لـە دواڕۆژیـش**. وە بەخشـندەیی و میهرەبـانی پەروەردگار ئەوەندە زۆرە کە هـیچ سـەیرنییە لـە دوا ڕۆژیشـدا لـە جیـاتی سـزادان پاداشـتی تۆبـەکاری ڕاسـت بداتـەوە بەچـاکە، هـەتا لەسەر گوناهەکانیشی کە تۆبـەی لێ کـردون لـە

---

(٣٧) (فالجزاء من جنس العمل،فكما بدلوا هم أعمالهم السيئة بالحسنة، بدلها الله من صحف الحفظة حسنات، جزاءً وفاقاً).

دونیـــا. وەك زاهـــیری ئایەتەكـــە ئـــەوە دەگەیـەنێت[٣٨]. وەهـەروەها لـەو حەدیسـەی پێغەمبەریشدا ﷺ ئەمە دەردەكەوێت:

أبو ذر ﷺ فـەرموی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویەتی:

((إني لأعلم آخر أهل الجنة دخولاً الجنة ، وآخر أهل النار خروجاً منها. رجل يؤتى به يوم القيامة فيقال اعرضوا عليه صغار ذنوبه وارفعوا عنه كبارها فتعرض عليه صغار ذنوبه فيقال عملت يوم كذا وكذا، كذا وكذا، وعملت يوم كذا وكذا، كذا وكذا. فيقول نعم، لا يستطيع أن ينكر، وهو مشفق في كبار ذنوبه أن تعرض عليه فيقال له فإن لك مكان كل سيئة حسنة فيقول: يارب قد عملت أشياء لا أراها هاهنا]. فلقد رأيت رسول الله ﷺ ضحك حتى بدت نواجذه))[٣٩].

وقال أبو طويل: يارسول الله، أرأيت رجلاً عمل الذنوب كلها و لم يترك منها شيئا، وهو في ذلك لم يترك حاجة ولا داجة إلا اقتطعها فهل له من توبة. قال: ((هل أسلمت)) قال: أنا أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أنك عبد الله ورسوله. قال: ((نعم . تفعل الخيرات وتترك السيئات يجعلهن الله كلهن خيرات)). قال : وغدراتي وفجراتي يا نبي‌الله قال: ((نعم)). قال: الله أكبر ! فما زال يكررها حتى توارى[٤٠] .

واتە: }مـن دەزانم كـێ دوای هـەموو كـەس لـە دۆزەخ دێتـە دەرێ و دوای هـەموو ئـەهلی بەهەشـت دەچـێتە بەهەشـت . كـە پیاوێكـە رۆژی قیامەت دەهێنرێت. وە فـەرمان دەكرێـت گوناهـــە بچـــوكەكانی پیشـــان بدەنـــەوە و گـــەورەكانی لێ ئاشـــكرا مەكـــەن و نیشـــانی مەدەنـەوە. وە كـە ئـاوا تـەنها بچـووكەكانی پێش چاو دەخرێن پێی دەوترێـت : ئـەو رۆژەو ئـەو رۆژە فلاّنـە تاوانـەو فلاّنـە گوناهـەت كـرد .وەفلاّنە رۆژەش فلاّنە گوناهەت كـرد. ئـەویش دەڵێـت بـەڵێ وابـوو. وە ناتوانێـت ئینكـاری لێ بكـات بـەلاّم زۆر ترسـی ئـەوەی هەیـە گوناهـە گەورەكانیشی بە روودا بدرێنەوە.

ئـەوجا پێـی دەوترێـت : ئـەوە بـۆ تـۆ دەنوســرێت لـــە شـــوێنی هـــەر خراپەیـــەك چاكەیەك .

ئەویش كە زانـی فـەزڵ وبەخشـندەیی خـوا ئاوا زۆرە تەماعی پەیدا دەبێت ودەڵێـت: ئـەی پەروەردگارم كەوابوو مـن چـەند كردەوەیـەكی تری خراپم كـردوە كـە ئێستا لـە پـێش چـاوم نین و بەرووم دانەدراوەتەوە ! .

(٣٨) ئەم رایەش ئیمامی القرطبي وعبدالرحمن بن السعدي هەڵیانبژاردووە ، بڕوانە تەفسیرەكەیان.

(٣٩) [م : ١٩٠]

(٤٠) الطبراني ٧٢٣٥ قال الهيثمي: رجاله رجال الصحيح، غير محمد بن هارون وهو ثقة.

دوای ئـەوە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەسـتی کرد بە پێکەنین .

وە ئـەبو طویـل وتـی : ئـەی پێغەمبـەری خوا، پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك هـەموو تاوانـەکانی کردبن و هیچی نەبواردبن

ئایا ئەو پیاوە تۆبەکردنی بۆ هەیە.؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرموی :

ئایا تۆ موسوڵمان بویت؟

وتـی: بـەڵێ مـن شـایەدی دەدەم کـە هـیچ پەرسـتراوێکی بـە حـەق نیـە جگـە لـە الله کـە پەرسـتراوی حـەقی تـاك وتەنهایـەو شـەریکی نییە.

وەهەروەها تۆش بەندەو نێرراوی ئەویت.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموی:

کـەوابو بـەڵێ ، کردەوەچاکەکان بکـەیت و واز بهێنیـت لـە خراپـەکان (واتـە بـەکردەوە تەوبەیەکی ڕاست بکەیت)، ئەوە خـوای گـەورە هەموو گوناهەکانت بۆ دەگۆڕێت بەچاکە واتـە پاداشتی خێرت دەداتەوە لە جیاتی سزا.

کـابرا وتـی: ئـەی ئـەو غـەدرو خراپەیـەی کردومـە هـەمووی دەگـۆڕێن، ئـەی پێغەمبـەری خوا ؟

فەرموی :بەڵێ .

ئـەویش لـە خۆشـیان و سەرسـامیان وتـی: (الله أكبر). وەبـەردەوام دووبـارەی دەکـردەوە تا ون بوو لە پێش چاوان .[41]

[وَمَنْ تَابَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَاباً] (٧١)

واتــە: هەرکەســێك تەوبــەبکات : واتــە دەست هەڵگرێ بەتـەواوەتی لـە گوناهـەکانی و پەشـیمان بێـت لێیـان و بـە دڵێکـی ڕاسـت و پاکـەوە بگەڕێتـەوە لای خـوا ، وە کـردەوەی چـاکیش بکـات- نـەك تـەنها تەوبـەی بـەدەم و بـەدڵ- ئـەوە گەڕانەوەکـەی گەڕانەوەیـەکی باش و گیرایە بـۆ لای خـوا، بـە شـێوەیەکی وا کـە خـوای گـەورە لـە گوناهـەکانی بـوراوەو پاداشـتی خێـری بـۆ لـە شـوێن دانـاوە و لێـی ڕازییەو پێی خۆشە .

کەواتــە هەرکەســێ بــە دڵــیش و بــە کــردەوەش تەوبــە بکــات ئــەوە تەوبەکــەی باشەو بەڕاستی گەڕاوەتەوە لای خوا .

وەپەروەردگار دەفەرموێت :

[وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُوراً رَحِيماً][42] .

واتە: هەرکەسێ کردەوەیەکی خـراپ بکـات یـا زوڵـم لەنەفسـی خـۆی بکـات لەپاشـان بەڕاستی داوای لێخۆش بوون بکات لە خـوا بـە دڵ و زمـان و لاشـە ئـەوە دەبینێـت خـوای گەورە لێخـۆش بـوو و بەڕەحمـە بەشێوەیەکی وا کـە لـە گوناهـەکانی بـوراوەو سـەرەڕای ئــەوەش، زیـادە فـەزڵ و ڕەحمیشـی پـێ کردووەو خێریشـی نوسـیوە لەسـەر ئـەو داوای لێخۆشبون کردنەی .

(٤١) بـۆ زیـاتر تێگەیشـتن وسـود وەرگـرتن لـەم ئایەتـە بڕوانە:(مدارج السالكين: ١/٣٠١)(الهجرتين: ٢٤٥-٢٤٧) ابن القيم.

(٤٢) (النساء: ١١٠)

**سيفەتی دەیەم و یانزەهەم :**

**﴿ئامادە نەبونی دانیشگایەك كە كردارو گوفتاری خراپی تێدا بێت، وە خۆ بەبەڕێزو بەرز گرتن لە قسەو باسی پوچ و بێ سود﴾**

*** عدم حضور مجالس المنكر والفسوق القولية والفعلية. ورفعة الأنفس عن الخوض فيها.**

[وَالَّذِينَ لاَ يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا]

وەسیفەتێكی تری بەندەكانی خوا ئەوەیە كە بەعەمدی شایەدی بەناحەق نادەن لەسەر كەس . وە هەروەها ئامادەی شوێنێك یا كۆڕێك و دانیشگایەك نابن كە كردار یا گوفتاری بەناحەقی تێدابێ .

وە وشەی ***يشهدون*** دوو مانا دەگەیەنێت :

**یەكەم شایەدی دان:** (لا يشهدون شهادة الزور) واتە شایەدی نادەن بە شایەدی بەناحەق .

وە ئەم شایەتی دانە بەناحەقە لە گوناهە گەورەكانە وەك یەكێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر بەناوی أبوبكر ڕەزای خوای لێ بێت فەرموی[٤٣]: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەرێ پێتان نەڵێم گەورەترینی گوناهە گەورەكان كامانەن؟. وتمان بەڵێ. فەرموی :

١/ شەریك بۆ خوادانان .

٢/ وە ئازاردانی دایك و باوك .

٣/ وەشایەتی دانی بەناحەق .

وە بەردەوام پێغەمبەری خوا دەیفەرموو وەشایەتی دانی بەناحەق، وە دوبارەی دەكردەوە هەتا وتمان خۆزگە بێدەنگ دەبوو! .

**دووەم/** بەمانای **ئامادەبوون** (الحضور).

وەزۆربەی زانایان لەسەر ئەم ڕایەن .

**بەڵام كەوابوو وشەی (الزور) یەعنی چی؟**

* الواحدی فەرمویەتی : زۆربەی موفەسسیرەكان وتویانە لێرەدا (الزور) یەعنی **شیرك**. وە الزجاج فەرمویەتی : الزور یەعنی : درۆ . هیچ درۆیەكیش لە شیرك گەورەتر نییە، چونكە شرك گەورەترین بوهتان و درۆ **هەڵبەستنە بۆ خوا**.

كەواتە مانای ئایەتەكە بەم شێوەیەیە :

**بەندە ڕاستەكانی خوا ئەوانەن كە ئامادەی شیرك و هاوەڵ بۆ خوا دانان نابن.**

* محمد بن الحنيفه فەرموویەتی:

**ئامادەی قسەی پوچ و گۆرانی نابن (اللغو والغناء).**

* زوهری فەرمویەتی :

**(ئامادەی كۆڕی شەراب خواردنەوە نابن).**

* وە عمر بن قيس فەرمویەتی:

**ئامادەی دانیشگای خراپەو قسەی سوك و ناشرین نابن.**

* وە أبو العالية وطاوس وابن سيرين والضحاك و الربيع بن أنس و غيرهم . فەرمویانە:

---

(٤٣) [خ: (٢٦٥٤) ، م: (٨٧)]

**ئامادەی جەژن و ئاهەنگەکانی موشریکەکان نابن** . واتە ئامادەی هیچ جەژنێك نابن غەیری دوو جەژنەکەی تێکڕای موسوڵمانان.

* قەتادە : فەرمویەتی : **یارمەتی خراپ کاران و ناحەقان نادەن لەسەر ناحەقی.**

* وە شەوکانی فەرمویەتی: باشتر وایە تایبەت نەکرێ بە جۆرێك لە جۆرەکانی پێشوو ، بەڵکو هەموو ناحەقێك دەگرێتەوە.

**واتە بەندە ڕاستەکانی خوا ئەوانەن کە ئامادەی هیچ جۆرە ناحەقی‌یەك نابن.**

کەواتە سیفەتی بەندە ڕاستەکانی خوا ئەوەندە بەرزە کە نەك هەر کردارو گوفتاری ناحەق ناکەن ، بەڵکو ئامادەشی نابن ، بەلاّم ئەگەر بەبێ مەبەست ، بەقەزاو قەدەری خوا وا ڕێك کەوت بەلای شتێکی پوچەڵ و نارێکدا ڕۆیشتن ئەوە خۆیان زۆر لەوە بەبەرێزتر دەزانن کە لای بوەستن و ئامادەی ببن یا بچنە ناوی ، بەڵکو بەرێزەوە تێدەپەڕن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت :

{ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَاماً } (الفرقان: من الآية٧٢).

واتە ئەگەر بەلای کەسانی خراپ و دەم شڕدا ڕۆیشتبان و جنێو یا قسەی ناشرینیان پێ بوترابایە ئەوە بەرێزەوە دەڕۆیشتن و خۆیان تێك نەدەداو وەلاّمیان نەدەدانەوە و چاو پۆشیان لێ دەکردن و خۆیان نەدەهێنایە ریزی ئەوان. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئاوا وەسفیان دەکات :

[وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ. سَلامٌ عَلَيْكُمْ .لا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ](٤٤)

وە هەروەها پێشەوامان ئیبراهیم علیە السلام بە هیچ شێوەیەکی ناشرین وەلاّمی هەڕەشەو قسە ناشرینەکانی باوکە دڵ ڕەقە نەفامەکەی نەدایەوە، بەڵکو لە وەلاّمی ئەو هەموو قسانەی باوکی ئەو وتی: (سلام علیك).

وە لە دێرە شیعرێکدا ئەو سیفەتە جوانە باس کراوە کە دەڵێت :

ولقد أمرّ على اللئيم يسبُّني

فمضيت ثَمَّت قلتُ لا يعنيني

### سیفەتی دوانزەهەم :

## ﴿ پێشوازی کردن لە قورئان و ئامۆژگاریەکانی بە تێگەیشتن لێیان و باوەڕ بون و کارکردن پێیان ﴾

## ﴿ مقابلة آيات الله بالتفهُّم لمعانيها والإعتقاد والعمل بها ﴾

[وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمّاً وَعُمْيَاناً] (الفرقان:٧٣).

واتە: بەندە ڕاستەکانی خوای بەخشندە ئەوانەن کەکاتێك ئایەتەکانی قورئان کە پەندو ئامۆژگاریان تێدایە بۆیان باس بکرێت و بخرێتەوە یادیان، ئەوا ئەوان بەحاڵەتی کەڕی و کوێری ملی بۆ کەچ ناکەن.واتە هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو ئایەت و ئامۆژگاریانەی کە

(٤٤) (القصص:٥٥).

دەیانبیستن بەو شێوەیە نییە کە کەڕبن لەتێگەیشتنیانداو کوێرین لە بینینیاندا. بەڵکو ئەوان بەدڵێکی نەرم و بەئاگاوەو بەچاوی بیناو گوێی کراوەو بیسەرەوە ڕوو دەکەنە ئایەتەکانی قورئان وسەیریان دەکەن وگوێیان بۆ شل دەکەن و بیریان لێ دەکەنەوەو زەلیلیو مل کەچی لە ئاستیاندا دەنوێنن ودڵیان پێیان خۆش دەبێت و ئیمان و تەسلیم بونیان پێیان زیاد دەکات .

به پێچەوانەی بێ باوەڕ، کە کاتێك ئایەتی قورئانی بۆ دەخوێندرێتەوە، یەکسەر ملی دەسوڕێنێت و پشتی تێ دەکات هەر وەك نەیبیستبێت و گوێی لێ نەبێت. وە لە ئاستی بیستنوبینینیئەوحەقوپەندو ئامۆژگاریەی کە لە ئایەتەکاندایە، کەڕو کوێرە، بۆیە زیاتر سەرکەش ودڵ ڕەق ویاخی دەبێت کاتێ قورئان دەبیستێت و ئامۆژگاری دەکرێت .

وەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت :

[وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ][٤٥]

[وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِي أُذُنَيْهِ وَقْرًا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ][٤٦]

### سیفەتی سیانزەهەم

### ﴿دوعا کردنیان بۆ باش بونی خێزان و منداڵەکانیان.وە بۆ بەرز بونەوەی ئاستی تەقوای خۆیان بۆ بەرزترین پلە کە پێشەوایەتی دینییە﴾

### ﴿الدعاء لأزواجهم وذرياتهم في صلاحهم، ولأنفسهم ببلوغ درجة الإمامة في الدين والقدوة للمتقين﴾

[وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا] (الفرقان:٧٤)

واتە: وە بەندە ڕاستەکان ئەوانەن کە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان ببەخشە پێمان لە خێزان و منداڵ و نەوەو وەچەکانمان ساردی و فێنکی چاوان. واتە ئەوان باش بکەو یارمەتیان بدە لەسەر گوێڕایەڵی و پابەندبوون بەو ڕێگا ڕاستەی خۆت، بە شێوەیەکی وەها کە چاوەکانمان پێیان فێنك و ڕۆشن بنەوەو، دڵەکانیشمان پێیان بگەشێتەوە.

تێبینی: ئەم دوعایە واش پێویست دەکات کە باوکان خۆشیان هەوڵی تەواو بدەن لەگەڵیان بە ئامۆژگاری و فێرکردنی حەق بۆ بونیان بە عەبدی چاك ، **چونکە هەرکەسێ حەز لە شتێك بکات و دوعایشی بۆ بکات ، ئەوە پێویستە هەوڵیشی بۆ بدات بە گوێرەی توانای** ، وەك شیخ عبد الرحمن بن ناصر السعدی لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێ :

(٤٥) (التوبة:١٢٤).

(٤٦) (لقمان:٧).

(( ومن لوازم ذلك ، سعيهم في تعليمهم، ووعظهم ونصحهم، لأن من حرص على شيء، ودعا الله فيه، لابد أن يكون متسببا فيه))[٤٧]

[وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ]

وە ئەی پەروەردگار بمانکە بە پێشەوا بۆ تەقواداران ، لە تەقواو چاکەدا چاو لە ئێمە بکەن و شوێن ئێمە بکەون بۆ لای تۆ.

تێبینی: ئەو دوعایە داوای **ڕوکنەکانی پێشەوایەتیشی** تێدایەو، هەوڵدانیشە بۆ هێنانە بونیان لەخۆدا ، کە بریتین لە **سەبرگرتن و یەقین** . وە شیخ الاسلام ابن تيميه دەیفەرموو : (بالصبر واليقين تُنال الإمامة في الدين) واتە: بە سەبرو یەقین پێشەوایەتی دەست دەکەوێت لە دیندا.

وە شیخ عبد الرحمن بن ناصر السعدی لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێ :

(( ومن المعلوم أن الدعاء ببلوغ شيءٍ ، دعاء بما لا يتم إلاّ به، وهذه الدرجة-درجة الإمامة في الدين- لا تتم إلاّ بالصبر و اليقين، كما قال تعالى:

[وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ][٤٨] .

فهذا الدعاء يستلزم :(١) من الأعمال، والصبر على طاعة الله، وعن معصيته، وأقداره المؤلمة. (٢) ومن العلم التام، الذي يوصل صاحبه إلى درجة اليقين، خيرا كثيرا وعطاء جزيلاً، وأن يكونوا في أعلى ما يمكن من درجات الخلق بعد الرسل))[٦٦] .

تێبینی: ئەم ئایەتە بەڵگە نییە لەسەر خۆش ویستنی زەعامەت و لێپرسراوێتی و کاربەدەستێتی، بەڵکو باس لەوەوە دەکات کە موسوڵمان حەز کات بەوەی خوای گەورە بیکاتە مایەی هیدایەت بۆ تەقواداران و ئەوان لەوەوە فێری دین ببن و، شوێنی کەون لە چاکەداو، قودوەیەکی عەمەلی بێت و، ڕێنمای خەڵکی بکات بە کردارو گوفتاری .

وەلەم بارەیەشەوە پیشەوایانی سەلەف فەرموویانە :

* ابن عباس : اجعلنا أئمة هدى. (وجعلنا منهم أئمة يهدون بأمرنا).

* مكحول :اجعلنا أئمة في التقوى يقتدي بنا المتقون.

* ابراهيم النخعي : **لم يطلبون الرياسة ، بل بأن يكونوا قدوة في الدين . وعلماء عاملين .**

* القشيري: الإمامة بالدعاء لا بالدعوى .

* النيسابوري : **قيل: في الآية دلالة على أن الرياسة الدينية مما يجب أن تطلب ويرغب فيها، والأقرب أنهم سألوا الله أن يبلغهم في الطاعة المبلغ الذي يشار إليهم ويقتدى بهم )**[٤٩].

* قال ابن كثير : وقال غيرهم هداة مهتدين دعاة إلى الخير فأحبوا أن تكون عبادتهم متصلة

(٤٧)((تيسيرالكريم الرحمن في تفسيركلام المنان))ص٥٨٨

(٤٨) (السجدة:٢٤)

(٤٩) **بروانە**(( تفسير الشوكاني)) (٤/١٢٠).

بعبادة أولادهم وذرياتهم ، وأن يكـون هـداهم متعدياً إلى غيرهم بالنفع ، وذلك أكثـر ثوابـاً، وأحسن مآباً .

ولهذا ثبت في **صحيح مسلم** عن أبي هريـرة رضي الله عنه قال: قال رسول اللهﷺ (إذا مات أبـن آدم انقطع عمله إلا من ثلاث:ولد صالح يدعو له، أو علم ينتفع به من بعده ، أو ولد صالح يدعو له ، أو علم ينتفع به من بعده ، أو صدقة جارية).

## جیاوازی هەیە لە نێوان حەزکردن بە زەعامەت و دوعای بون بەپێشەوایەتی:

• حـەزکردن بـە زەعامـەت هەوڵدانـە بـۆ گەورە کردنی نەفس و خزمەت کردنی .

• بـەڵام داوا لـە خـوا کـردن بـۆ بـون بـە پێشـەوای تـەقواداران ، هەوڵدانـە بـۆ بەگـەورەدانانی خـواو فەرمانـەکانی ، چـونکە داوا دەکا خوای گـەورە تەقوایـەکی زۆری پـێ ببەخشێت و بشیکات بـە نمونەیـەکی بـاش بـۆ تـەقواداران، بـۆ ئـەوەی ئـەوانیش چـاو لـەو بکـەن و وەکـو ئـەو تـەقوای خـوا بکـەن، نـەك مەبەست خۆی بێت، بـۆ ئـەوەی خـەڵکی ببنـە بەندەو خزمەت کاری ئەو ، مل کەچی بـۆ ئـەو بنوێنن و ئەو بەگەورە دابنێن .

## نیشانەکانی خۆش ویستنی زەعامەت

نیشـانەکانی زۆرن، جـا کـە هـەموویان یـا هەنـدێکیان لـە مرۆڤـدا هـەبوو ئـەوە بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی مەبەستی ئەو کەسـە تـەنها خـوا نییـە بـە خالیسـی، بـەڵکو مەبەسـتی خزمـەت کردنی نەفسی خۆیەتی بە شـوێن کەوتـەکانی، وە ڕاکێشـانی دڵـی ئەوانـە بـۆ لای خـۆی، نـەك بـۆلای خـوا. وە پێشـەوای دینـی نیـە بـەڵکو زەعیمێکـەو خزمـەتکاری ئارەزوەکـانی خۆیەتی .

**وە نیشانەکانیشیان ئەمانەن :**

(١) زوڵـم کـردن لـە بەرامبـەری خۆیـان و حەسـادەت بـردن پێیـان وە دەم ودەسـت درێژی کردنە سـەر هـەر کەسێك کـە وا گومـان ببرێـت دەگاتـە پلـەی ئـەوان ومونافەسـەیان دەکات.

(٢) دیفـاع کردنێکـی زۆر، بەحـەق و بەناحـەق لـە ڕەفتـارو گوفتارەکـانی خۆیـان ئەگەر پێچەوانەی شەرعیش بـن، وە پاسـاو بـۆ هێنانـەوەیان بـە شـوبهەی پـوچ، کـە چـاوی خـەڵکی سـاویلکەو شـوێن کەوتـەکانیانی پـێ دەبەستن بەناوی خزمەت کردنی دین .

بەڵام پێشـەوایانی دیـن بەڕاسـتی ئەوەنـدە گوێیـان نەداوەتـە نەفسـی خۆیـان و دیفـاع کردن لێی وەك هەوڵی دینەکە دەدەن .

(٣) وە ئەگـەر بڕیارێکیـان دا ئامـادە نـین لێی پەشـیمان ببنـەوەو نەفسـی خۆیـان بشکێنن ئەگـەر پێچـەوانەی شـەرعیش بێـت و گوێش نادەنـێ ئەگـەر دەیـان و سـەدان کـەس بەهۆی بڕیارەکەیانەوە توشـی گێـژاو و فیتنـەو لەناو چوون بن .

(٤) نیشـانەیەکی تریـان ئەوەیـە کـە هەرشتێك شوێن کەوتـەکانی و جـەماوەر لایـان پـیرۆز بێـت ئـەوانیش بـەزاهیری بـە پـیرۆزی

وەبەشـێوەی فـەرمان دەفـەرمووێت پـەروەردگارتان "الله عزَّوجَـلّ" بپەرسـتن وهـاوەڵی بـەهیچ شـێوازێك بـۆ دامـەنێن، بـەڵام ئـەمڕۆ دەبیـنین خـەڵی ئامـادەن فەرمانەکانی خوای پەروەردگار وەك(نوێژ ورۆژوو حەج و...) جیٚبەجیٚ بکەن، بەڵام گـــەورەترین فـــەرمانی کـــە(توحیـــد الإلوهیـة)یـە جیٚبـەجیٚ ناکـەن" لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە گـەورەترین ولەپێشـترین فەرمان فەرمانی(توحید)ە، بەڵام خەڵکی بەگشـتی بیٚئاگـان لێـی، خـۆ ئەگـەر فـەرمانی(توحیـد) جیٚبـەجیٚ بکـەن ئـەوا فەرمانەکانیتر جیٚبەجێش نەکەن یاخود بـەکاڵ وکرچـی جیٚبـەجیٚی بکـەن ئـەوە هەر مایەی ڕزگار بوونیانە .

٢. وەهـــەروەها بەشـــێوەی (حـــرام) قەدەغـــەکراوەکان (المنهیـــات) باســـی هەڵوەشـێنەرەوەی (توحیـد الإلوهیـة)ی کردووە. دەفەرمووێت:

﴿ قُل تعالوا أَتلُ ما حرَّمَ رَبُّكُم عليكم أَلّا تُشرِكوا به شيئاً ﴾ [٥].

واتە ئاگادارتـان بکـەم بەسـەرئەوەدا کەپـــەروەردگار لەســـەرتانی(حـــرام) وقەدەغـــەکردووە ئـــەویش هاوبەشـــی پەیداکردنـــە" کـــەوابوو هاوبەشـــی پەیدامەکەن بەهیچ شێوەیەك.

وەهـــەروەها بەشـــێوەی (حـــرام) دەفەرمووێت:

﴿ قُل لا أَجِدُ في ما أُوحيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً على طاعمٍ يَطعَمُهُ إلا أن يكونَ ميتةً أو دماً مَسفوحاً أو لحمَ خنزيرٍ فإنَّهُ رِجسٌ أو فسقاً أُهلَ لغيرِ الله به ﴾ [٦].

وە دەفەرمووێت:

﴿ إنما حرم عَلَيْكُمُ الميتَةَ والدمَ ولحمَ الخنزيرِ وما أُهلَ به لغيرِ الله... ﴾[٧].

وەهـــەر بـــەم شـــێوەیە لەســـورەتی (المائـــدة: ٣)و(النحـــل: ١١٥) باســـی کـــردووە. وەلـــەڕیزی (فـــواحش) واتـــە هەموجۆرە تاوانەکانـدا باسـی کـردووە، دەفەرمووێت:

﴿ قُل إنما حَرَّمَ رَبِّيَ الفواحشَ ما ظهرَ منها وما بَطَنَ والإثمَ والبغيَ بغيرِ الحقِّ وأن تُشرِكوا بالله ما لم يُنَزِّل به سُلطاناً ﴾ [٨].

ئەمە هەندێك لەو ئایەتانـە بـوون کـە حەرامەگـەورەکانیان نیشـانە کـردووە، بەتایبەتی هاوبەش پەیداکردن(الشرك).

بـەڵام سـەیر لەوەدایـە ئـەو خەڵکـە بەگشتی ئەوەندەی لە(حرام)ەکانی خوار شـیرکەوە خۆیـان دەپـارێزن ئەوەنـدە لـە(شـرك) خۆیـان ناپـارێزن" هـەروەك حەرام نەبێت وایە. هەروەهافاطمة (خوای لێ ڕازی بێـت) دەفـــەرموێت: " أعـــدل العـــدل

---

(٥) (سورة الأنعام:١٥١).

(٦) (سورة الأنعام:١٤٥).

(٧) (سورة البقرة:١٧٣).

(٨) (سورة الأعراف:١٣٣).

التوحيد وأظلم الظلم الإشراك بـالله تعـالى" واتە گەورەترین تاوان و(حرام) هاوبەشی پەیداكردنە.

تائێستا بەدوو شێوە سەلماندمان كە بوونی(توحيد الإلوهية) و نەمانی (شرك) لەهـەموو كەسـێك داواكـراوە بەشـێوەی (الأمر) لەگەڵ (النهي)دا، وەهەموو یاساو (شەرعی) پەروەردگار لای زانایـان پـێی دەوترێـت (الأمـر والنهـي). واتـە چـۆن ئامـادەن هـەموو جۆرەكـانی (الأوامـر والنـواهي) جێبـەجێ بكـەن ئـەبێت زۆر لـەوان باشـتر ئامـادەبن سـەری(الأمـر والنهـي) یـەكان وەرگـرن كـە(توحيـد الإلوهية)وهەڵوەشێنەرەوەكەیەتی (الشرك).

٣. وەبەشێوەی سێهەم باسـی بەشـی دووەمی(توحيد) كـراوە ئـەویش (حـقّ)ە واتە ماف و(حقّ) ی پـەروەردگار بەسـەر بەندەكانیەوە.

وەكـــو(معــاذ) ی كـــوڕی جبـــل دەفـەرمووێت (مـن لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ بووم...فەرمووی: يامعاذ أتدري ما حقّ الله على العباد ..... قلت الله ورسوله أعلـم، قال: حق الله على العبـاد أن يعبـدوه ولا يشركوا به شيئاً)[٩]

فەرمووی: ئـەی(معـاذ) ئـەزانی مـافی خوای پەروەردگار بەسەر بەندەكانیـەوە چـــیە؟، وتم: خـــوا وپێغەمبـــەر ﷺ ئـەزانێت، فـەرمووی: مـافی پـەروەردگار بەسەر بەندەكانیەوە ئەوەیە بیپەرستن وهاوبەشـــی بـــۆ پەیدانەكـــەن بـــەهیچ شـــێوەیەك...).بـــەم شـــێوەیە بۆمـــان دەردەكەوێت مـافی پـەروەردگار بەسـەر بەندەكانیـەوە (توحيـد الإلوهيـة) بـەڵام بەداخـــەوە ئـــادەمیزاد لەهــــەموو سەردەمێكدا مافی خۆی پێش مافی خـوا خسـتوە، ئـەی نـابینین ئـەمڕۆ داواكـاری هەموو جۆرەكانی مافی هەیە هەرلە مافی منداڵ وئافرەتان ومـافی مـرۆڤ وتەنانـەت مافی گیانلەبەرانیش.

بەڵام ئەگەر كۆمەڵێكی باوەڕدار هەوڵ وتەقـەلا بـدەن وبانگـەوازیی بـۆ مـافی پـەروەردگار بكـەن بەهـەموو شـێوەیەك نـامۆن لـە نـاو خەڵكدا ،لێرەدا بۆمـان دەردەكەوێت بە شـێوەی (الأمـر والنهـي والحـق) باســی (توحيــد) و ترســناكی (شــرك) لــە قورئانــدا هــاتووە ،واتــە هەركەسێك هاوبەشی بۆ خوا پەیدا بكـات لــە یــەك كاتــدا فــەرمانێكی خــوای پــــەروەردگاری شــــكاندووەو (حـــرام) وقەدەغە كراوێكی پەروەردگاری ئـەنجام داوەو مـــافی پـــەروەردگاری پێشـــێل كـردووە لـەم كاتـەدا پێـی دەووترێـت تـاوانێكی زۆر گـەورە، لـە زۆر شـوێن لـە قورئانـدا (ظلـم ) بـەمانای (شـرك) دێـت هەروەك لەسەرزمانی لوقمان دەفەرموێت:

---
(٩) متفق عليه).

(يا بنيّ لاتشرك بالله إنّ الشرك لظلم عظيم)[١٠]

وەکو (إبن تیمیّة) دەفەرموێ (أظلم الظلم ألأشراك بالله ) گەورەترین تاوان هاوبەشی پەیدا کردنە بۆ خوا ، وەپێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت : ألا أنبئكم بأكبر الكبائر ، قلنا بلى يارسول الله ،قال: الإشراك بالله ....."[١١]. واتە :(ئایا هەواڵتان بدەمێ دەربارەی تاوانە هەرە گەورەکان ، ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەر ئەویش فەرمووی بریتی یە لە هاوبەش بۆ خوا دانان .....). وەپەیمان و وەعدێکی نەشکاوی خوایە کە لە (شرك) وموشریکان خۆش نابێت ، وەك دەفەرموێت:

(إنّ الله لايغفر أن يشرك به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء )[١٢]

خوای پەروەردگار لەهاوبەش پەیداکەران خۆش نابێت بەڵکو لە (مادون ذلك) ئەو تاوانانەی لەخوارووی (شرك)ەوەن لێ خۆشبوون دەیان گرێتەوە بۆ هەرکەسێ خوا بیەوێت ، واتە هەموو تاوانیك لەخوار(شرك)ەوەیە هەروەك لە فەرموودەکەی پێشوو دیاری کرد لەپێش هەموو تاوانە گەورەکانەوەیەو تاوانەکانی تر لە دوای (شرك)ەوەن. وەبۆیە دەبینین ئەم پەیمانەش بە نەشکاوی باسکراوە لە فەرموودەکەی (عائشة ) خوای لێ ڕازی بێ کەئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

(الظلم ثلاثة؛ فظلم لايتركه الله، وظلم يغفر، وظلم لايغفر؛ فأما الظلم الذى لايغفر فالشرك لايغفره الله وأما الظلم الذى يغفر فظلم العبد فيما بينه وبين ربّه فأما الظلم الذى لايترك فظلم العباد فيقتصّ الله لبعضهم من بعض)[١٣]. واتە ستەم سێ جۆرە ستەم هەیە پەروەردگار وازی لێ ناهێنێت و ستەمێك لێی خۆش دەبێت و ستەمێك لێی خۆش نابێت ئەویش هاوبەش پەیدا کردنە ، ئەوستەمەی لێی خۆش دەبێت ستەمی بەندەیە لە نێوان خۆی و خوادا وەئەو ستەمەش کە وازی لێ ناهێنێت ستەمی بەندەکانە لە نێوان خۆیاندا .

بەکورتی : گەورەترین و دادپەروەر ترین ئادەمیزاد و بەرزترین پلەی ژیری و خواناسی کەسێکە کە (توحید) ی پێ بێت و لەسەری پەروەردەبێت وە مەبەست پێی (توحيد ألألوهية)یە ، وەبە پێچەوانەوە ستەمکارترین و نەفامترین ئادەمیزاد ئەو کەسانەن هاوبەش بۆ خوا بڕیار ئەدەن .

درێژەی باسەکەمان لە زنجیرەی داهاتوودا بە یارمەتی خوا تەواو دەکەین.

(١٠) (لقمان: ١٣).
(١١) (متفق عليه).
(١٢) (النساء ٤٨).
(١٣) الصحيحة برقم (١٩٢٧)




جۆری دووەم لە شیرك

**شیرکی بچوك (الشرك الأصغر)**

زانایان بە چەند شێوەیەك پێناسیان کردوە بۆ ئەوەی هەموو جۆرەکانی بگرێتەوە، ئەمەش شێوەکانن :

**(١) ما جاء في النصوص تسميته شركا ولم يصل إلى حد الأكبر .**

هەرمەبەستێك (إرادە) وە کردارێك وە گوفتارێك کە بەشیرك ناو برابێت لە دەقەکانی قورئان و سوننەت دا وە نەگەیشتبێتە پلەی شیرکی گەورە ، ئەوە شیرکی بچوکە .

**(٢) هو كل مانهى عنه الشرع من الإرادات والأقوال والأفعال التي هي ذريعة إلى الشرك الأكبر، ووسيلة للوقوع فيه،ولم تبلغ رتبة العبادة. وإن لم يطلق الشرع اسم الشرك عليه[1].**

(١) (القول المفيد على كتاب التوحيد) ابن عثيمين ٢٥٦/١ . (القول السديد شرح كتاب التوحيد) ابن سعدي ص ٤٥ (فتاوى اللجنة الدائمة) (٥١٧/١).

-كالغلو في المخلوق الذي لم يبلغ رتبة العبادة.

واتە : هەموو ئەو نیەت و مەبەست و گوفتار و کردارانەی کە نەگەیشتبنە پلەی عیبادەت و سەربکێشن بۆ شیرکی گەورە هۆی تووش بوونی بن. ئەوە شیرکی بچوکە. ئەگەر لەشەرعیشدا ناوی شیرکی لێ نەنرابێت.

وەك زێدە رەوی کردن لە مەدح وپیاهەڵدانی پیاوچاکان ، بە ئەندازەیەك کە نەگەیەنرابێتە پلەی پەرستن.

**(٣) وجعل سبب لم يجعله الله سببا لا شرعا ولا قدرا فهو شرك أصغر[2].**

واتە دانانی شتێك بە هۆ (سبب)ێك بۆ ئامانجێك " کە پەروەردگار ئەو شتەی بە هۆ(سبب) دانەنابێ و نەیکردبێ بە سەبەبی ئامانجەکە،وە نەلەشەرعدا وە نە لەقەدەرو کەوندا،ئەوەشیرکیبچوکە.

(٢) (الفوائد المنتقاة من شرح كتاب التوحيد) ص٩ .

وەك لە دەست كردنى ئاڵقەيەكى مس يا هەر مادەيەكى تر يا پەڕۆو شاڵ بەو بيرو باوەڕەى كە هۆ (سبب)ى شيفايەوبەلاَو نەخۆشى لادەبات.

وە بێ گومان ئەم جۆرە شتانە سەبەبى شيفانين نە لەشەرعدا وە نە لە قەدەرو واقع و تەجروبەدا .

(٤)**الشرك الأصغر**[3] :**هو تسوية غير الله بالله في هيئة العمل ، أو أقوال اللسان**.

**فالشرك في هيئة العمل** : هو الرياء .

**والشرك في أقوال اللسان**: هو الألفاظ التي فيها معنى التسوية بين الله وغيره كقوله(ماشاء الله وشئت)و(عبد الحارث).

واتە : شيركى بچوك بريتىيە لە يەكسان كردنى غەيرى خوا بە خوا ، لە شێوازى كردار يا گوفتارى زمان .

نمونەى شەريك بۆ خوا دانان لە شێوازى كردار، پێش چاوى (الرياء)ە

وە نمونەى شەريك دانان لە گوفتارى زمان " ئەو وتەو گوفتارانەن كە يەكسان كردنى تێدا بەدى دەكرێت لە نێوان پەروەردگار و دروستكراوەكانيدا . وەك ئەو وتەيە كە دەڵێن .

خوا حەزكات و تۆش حەزكەيت !

**وە شيركى بچوك لەهەريەكێك لە نيەتى دڵ و وتەى زمان وكردەوەى لاشەدا ڕوو دەدات .بەم شێوەيەى خوارەوە :**

## (أ)شيرك لە نيەت و مەبەستە ون و ناديارو شاراوەكانى دڵ (الشرك في الارادات الخفية)

وەك :

١. ڕياو پێش چاوى خەڵك (الرياء).

واتە : لە خوا پەرستندا مەبەستت تەنها خوا نەبێت بەڵكو مەبەستت پێش چاوى خەڵكيش بێت بۆ ئەوەى لاى ئەوان بەگرنگ و مەزن دابنرێيت و ڕێزت لێ بگيرێت .

٢. بەگوێ دادانى خەڵك (التسميع).

واتە : لە وتەكاندا مەبەستت ئەوە بێت خەڵكى گوێ بيستت بن كە تۆ چەند باش و چاكيت . لە حەديسدا **هاتوە** :

(إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر. قالوا : وما الشرك الأصغر ؟ قال: الرياء ؛ يقول الله عز وجل لأصحاب ذلك يوم القيامة إذا جازى الناس : اذهبوا إلى الذين كنتم تراؤن في الدنيا ؛ فانظروا هل تجدون عندهم جزاء ؟!)[4].

---

(٣) المدخل لدراسة العقيدة الإسلامية . د. ابراهيم البريكان ص١٢٧ و١٣٩

(٤) أحمد (٥/٤٢٨) البغوي في (شرح السنة) (٤/٢٠١/١). (الصحيحة) (٩٥١).

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی : بەڕاستی ترسناك ترینی ئەو مەترسیانەی کە لە سەر ئێوەم هەیە شیرکی بچوکە(٥)

دوای ئـــەوە هـــاوەڵان فـــەرمویان : شیرکی بچوك چیە ؟

فەرمووی : (الریاء) بریتیە لە ڕیایی و پێش چاوی کردنی خـەڵکی . واتـە لـە نوێـــژو پەرســـتندا بـــۆ خـــوا زیـــاتر بیڕازێنێتەوە و بە تـەواوی دەری خـەیت کاتێك یەکێك سەیرت دەکات بۆ ئـەوەی لە پێش چاوی ئـەو کەسـە بـە عەبـدێکی بـاش دەرکـەویت و ڕێـزی تایبـەتت لێ بگیرێت ! !

وە پێغەمبـــەرﷺ فـــەرمووی:خـــوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا کاتێك پاداشتی خەڵکی دایەوە بە ڕیاکاران دەفـەرموێت: ئێـــوە بـــۆ وەرگرتنـــەوەی پاداشـــتی کردەوەکانتـــانْ کـــەڕیاییتان تێـــدا کردوە– بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کـە پێش چاوی ئەوانتان دەکرد لە دونیـاداو مـــەراییتان دەکـــردن. بـــزانن هـــێچ پاداشـــتێکتان دەســـت دەکـــەوێت لای ئەوان؟!

وە( سومعە) ئەوەش دەگرێتـەوە کـە تۆ کردەوەکەت بشاریتەوە لەخەڵکی لـە کاتی کردنیدا بۆ ئـەوەی تـەنها خـوا لێی ئاگادار بێت بـەڵام دوایـی لـەلای خـەڵکی باسی بکەیت بۆئەوە عیبادەتی تۆ ببیستن

وە هەردوو سیفەتی ڕیـایی و سـومعە (واتـــە پـــێش چـــاو کـــردن و بـــەرگوێ خستن). سیفەتی خراپن و لە بنەڕتدا هی مونافیقەکانن .

وە هەرکەسێ ئەم سـیفەتانەی ببێـت لـە دونیـا ئـەوە لەوانەیـە لـە دونیـا تـا ماوەیەك بەمەبەسـتی خـۆی بگـات واتـە خەڵکی بە پیـاوێکی بـاش ببیـنن و نـاو بانگی ببیستن . بەڵام زۆری پـێ ناچـێت

---

(٥): واتە : لە زۆرشت دەترسم توشتان بێت . بـەڵام لـە هەموویان زیاتر مەترسی شـیرکی بچوکە، بە تایبـەتیش ئـەو شیرکە بچوکەی کەون و شاراوەیە (الشـــرك الخفـــي) چـونکە خۆڕزگـار کـردن لێی ئیخلاصـی زۆرو هەوڵـدانی دەوێـت بـە یارمـــەتی خـــوا . بۆیـــە یـــەکێ لـــە پێشـــەوایانی ســـەلەف فەرمویەتی :

(ما جاهدت نفسي على شيء مجاهدتها على الإخلاص).

واتــە : مانـدوو بـوون و هــەوڵ و تێکۆشـانم لەگـەڵ نەفسم نە کردووە بۆ ژێربار کردنی بـۆ هـیچ کارێـك بـە ئەندازەی هەوڵ دان لەگەڵی بۆ مل کەچ بوونی بـۆ پـاك بونـەوەی تـەواو لـە نیـەتی ڕیـاو پـێش چـاوی و یـەك لابونـەوە بـە خالیسـی بـۆ خـوا !!. لـەو شـتانەی کـە پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ لێیـــان ترســـاوە کـــە توشـــی ئوممەتەکەی بن :

* الأئمة الضلون : پێشەوا گومڕاکارەکان

* الدجال .

* الدنيا والتنـــافس فيهـــا . پـێش بڕکـێ کـردن لـە وەدەست خستنی دونیا .

خــواى گــەورە پــەردە لەســەر نیەتــە ناپاکەکەی هەڵدەماڵێت و لە پێش چاوی خەڵکی سوك دەبێت . وە لە دوارۆژیشدا بــە یــەکجاری خــوای گــەورە ســوك و ریسوای دەکات لە پـێش چاوی خـەڵکی بـە ئاشـکرا لـەو ڕۆژەدا کـە نهێنـیو ڕازو نیازە شـاراوەکانی نـاو سـنگ و دڵـەکان دەردەخرێن و ئاشکرا دەبن. وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

[يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ][6] و[ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ . وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ][7]

وە لە حەدیسدا هاتووە کە :

(من سمّع سمّع الله به.ومن يرائي يرائـــي الله)[8]

وە لـــە چـــەند ریوایـــەتێکی تـــردا دەفەرموێت:

[ من قام مقام رياء وسمعة راءى الله به يوم القيامة وسمع به][9].

[ مامن عبد يقوم في الدنيا مقام سمعـــة ورياء إلا سمع الله به على رؤوس الخلائـــق يوم القيامة][10]

واتـــە : هەرکەســـێ ریـــایی لـــە کردەوەکانیدا بکات لە دونیا وە باسیان بکات لای خەڵکی بۆ ئەوەی پلـەی بـەرز بێتەوە لای خەڵکی و ڕێزی لێ بگرن و بە پیاوێکی باشی دابنـێن . ئـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا خـوای گـەورە لـەپێش چـاوی خـەڵکی و سـوك و ریسـوای دەکـات و خەڵکیش هەواڵی سوك کرانـی دەبیسـتن بەویستی خوا. پەنا بەخوا

پـــەروەردگار داوا لـــە تـــۆ دەکـــەم بمانپارێزیـت لـە سـومعەو ریـایی . وە ئیخلاسمـان پـێ ببەخشـیت. يـا حـي يـا قيوم ياذا الجـلال والكـرام داوامـان قبـوڵ کەیت .

٣. وە مەبەست بونی دونیا بەهەنـدێ کردەوە (إدرادة الدنيا ببعض الأعمال).

## (ب) شیرك لە وتەکانی زماندا (الشرك في أقوال اللسان)

ئـەم جۆرەشـیان نمونـەی زۆرن لـە ژیانی ڕۆژانەماندا، وەك :

١- سـوێند خـواردن بەغـەیری خـوا بەمـەرجێك مەبەسـتی ئـەوە نـەبێت کـە ئەو کەسەی یا ئەوشـتەی سـوێندی پـێ خوارد گەورەو مەزن و پیرۆز بێت وەکو خوا " ئەگینا دەبێت بە شیرکی گەورە .

٢- وتنی (أحكم الحاكمين) و (قاضي القضاة)(شاهنشاه)بەحاکمێك جگە لەالله

٣- ناونـان بـە (عبـد الـنبي) و (عبـد الرسول).

---

(٦) (الطارق:٩)

(٧) (العاديات:١٠)

(٨) خ (٦٤٩٩) م (٢٩٨٦).

(٩) احمد والدرامي

(١٠) (الطبراني) بڕوانە (فتح الباري) (١٣/١٣٧).

٤- وتنی خوا بیەوێت وتۆ بتەوێت! (ما شاء الله وشئت)! (لەپەنای خواو تۆدا)!. (لە سایەی خواو سەری تۆدا)!
(لە خواو ئێوە بەزیاد بێت)!.
(خواو پێغەمبەر بتپارێزن)!
(بەناوی خواو پێغەمبەر)
(بەیارمەتی خواو پێغەمبەر).

**لە چەند حەدیسێکدا هاتوە کە :**

(١) عن قُتَيْلة بنت صفيّ امراة من جهينة قالت: (إن حبرا جاء إلى النبي(ﷺ) فقال: إنكم تشركون ! تقولون: ما شاء الله وشئت، وتقولون: والكعبة، فقال رسول الله(ﷺ) : قولوا ما شاء الله ثم شئت، وقولوا: ورب الكعبة)[11].

**واتە : ئافرەتێکی جوهەینە کە ناوی قوتەیلەی کچی صەیفی یە ڕەزای خوای لێ بێ وتی : زانایەکی جولەکە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وە وتی : (ئێوە شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن " دەڵێن : خوا بیەوێت و تۆ بتەوێت (وەیا دەڵێن : خوا حەز کات و تۆش حەز کەیت)) ;**

**وە پێغەمبەرﷺ فەرموی : بڵێن : ئەگەر خوا حەزکات و*لە پاشان* تۆش حەز کەیت . وە بڵێن :سوێند بە پەروەردگاری کەعبە .**

(١١) أحمد (٦/٣٧١-٣٧٢). (الصحيحة ١٣٦)

(٢) عن الطفيل بن سخبرة أخي عائيشة لأمها: ((أنه رأى فيما يرى النائم ، كأنه مرّ برهط من اليهود فقال: من أنتم ؟ قالوا نحن اليهود.

قال : إنكم أنتم القوم لولا أنكم تزعمون أن عزيرا ابن الله فقالت اليهود : وأنتم القوم لولا أنكم تقولون : ما شاء وشاء محمد!

ثم مر برهط من النصاري ، فقال من أنتم؟ قالوا : نحن النصارى.

فقال: إنكم أنتم القوم، لولا أنكم تقولون: المسيح ابن الله!

قالوا : وإنكم أنتم القوم لولا أنكم تقولون: ما شاء الله و ما شاء محمد.

فلما أصبح أخبر من أخبر ، ثم أتى النبي (ﷺ) فأخبره فقال :هل أخبرت بها أحدا ؟

قال: نعم . فلما صلوا خطبهم ، فمحمد الله ،وأثنى عليه ، ثم قال:

(إن طفيلا رأى رؤيا ، فأخبر بها من أخبر منكم ، وإنكم كنتم تقولون كلمة كان يمنعني الحياء منكم أن أنهاكم عنها ؛ قال: ((ألا تقولوا: ما شاء الله وما شاء محمد))[12]

[فقولوا : ماشاء الله ثم شاء محمد][13]

(١٢) أحمد (٥/٧٢)

(١٣) أحمد (٥/٣٩٣) وابن ماجه (٢١١٨). و(الصحيحة)١٣٨،١٣٧.

واته : یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ناوی طفیل کە داك برای عائیشەیە ڕەزای خوایان لێ بێت . لە خەونیدا وای بینی کە بەلای کۆمەڵێك لە جولەکەدا ڕۆیش ، وەپێی وتن : ئیوە کێن ؟ وتیان : ئێمە : جولەکەین . ئەویش پیێی وتن: ئێوەن قەومێکی باش ئەگەر ئەو گومان و بیرو باوەڕە شیرکیە پوچەڵەتان نەبوایە کە دەڵێن : پێغەمبەر عوزیر کوڕی خوایە ؛.

ئەوانیش وتیان : ئێوەش ئەی موسوڵمانان قەومێکی باش ئەگەر نەتان وتبا : خوا حەزکات و محمد حەزکات ؛

لەپاشان بەلای کۆمەڵێك لە گاورەکاندا ڕۆیشت وە وتی : ئێوە کێن ؟.وتیان: ئێمە گاورین (نصاری) ئەویش پێی وتن: ئێوەن گەلێکی باش ئەگەر ئەو باوەڕە شیرکیە پوچەڵە تان نەبوایە کە دەڵێن عیسی کوڕی خوایە !

ئەوانیش وتیان : ئێوەش ئەی موسوڵمانان قەومی باشن ئەگەر نەتان وتبایە : خوا حەزکات و محمد حەزکات !

وەکە (طفیل) بەیانی کردەوە خەونەکەی لای هەندێ کەس باس کرد . ودوایی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وە خەونەکەی بۆ گێڕایەوە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ئایا بەکەست ڕاگەیاندووە؟ فەرمووی: بەڵێ ، ئەویش (ﷺ) کاتێك نوێژیان کرد وتاری بۆ خەڵکەکەدا بەم شێوەیە کە سەرەتا حەمدو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردوو دوایی فەرموی :

بەڕاستی (طفیل) خەونێکی بینیوە . وە بەهەندێکتانی ڕاگەیاندوە . وە ئێوە لە ڕابردوودا قسەیەکتان دەکرد و وشەیەکتان بەکار دەهێنا کە من ڕقم لێی بوو بەلام لەشەرمی ئێوە نەمدەتوانی لێتان قەدەغە بکەم و بە ڕووتاندا بدەم کە وشەیەکی خراپ دەڵێن .

بەلام ئەوە ئێستا پێتان دەڵێم :

مەڵێن : خوا حەزکات و محمد حەزکات . بەڵکو بڵێن : خوا حەزکات لە پاشان محمد ))

واتە ناوی من لەگەڵ خوا بەیەکەوە کۆمەکەنەوەویەکسانمەکەن،چونکەئەوە شیرکە . بەڵکو ئەگەر ناوی منتان هێنا ئەوەلەدوایناویخوابڵێنلەپاشان محمد .

(٣) عن ابن عباس – رضي الله عنه – قال : جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فراجعه في بعض الكلام، فقال : ما شاء الله وشئت!

فقال رسول الله (ﷺ) :(أجعلتني مع الله عدلا ؟! (وفي لفظ : ندّا ؟! ).

لا ؛ بل ما شاء الله وحده)[١٤].

---

(١٤) وابن ماجه (٢١١٧). (الصحيحة):١٣٩.

واتە : (عبدالله)ی کوڕی عەباس رضي الله عنه فەرمووی : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وە هەندێ دوا لەگەڵیداو وتی: خوا حەزکات و تۆ حەزکەیت. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ئەوە تۆ منت کردە هاوەڵ و یەکسان و شەریکی ؟!

نەخێر جارێکی تر وا نەڵێیت بەڵکو بڵێ: گەر خوا حەزکات بەتەنها).

چونکە هەر شتێك خوا بیەوێت هەر ئەوە دەبێت " ئێمە بمانەوێت یان نا !!.

کەواتە ئێمە شیاوی ئەوە نین ناومان بخرێتە پاڵ ناوی خوا لەم شتانەدا یا خود بکرێینە شەریکی ئەو .

## (ج)شیرك لە شێوازی کردەوەکانیدا (الشرك في هيئة الأعمال)

وەك : (١) ڕەش بینین بە هەندێ شت یا بە هەندێ کات وشوێن (التشاؤم والتطير).

(٢) هاتن بۆ لای فاڵ گرەوەو باوەڕ پێ کردنی وە چوون بۆ لای شوێن هەڵگر بۆ دۆزینەوەی دز .

وە باوەڕ کردن بە ساحیرو جادوکەرو فنجان و ئاوێنە گرەوەو بەخت گرەوە .

(٣) نوێژ کردن بۆ خوا لای قەبری پیاو چاك و سوجدە بۆ خوا بردن تیایدا و خوێندنەوەی قورئان بەو نیەت و بیروباوەڕەوە کە لەلای قەبر عیبادەت باش ترە – بەگومانی خۆیان –[١٥]

(٤) تەبەروك کردن بە شوێنەواری پیاوچاکان و لاشەیان لە ژیانیاندا یا لە دوا مردنیان : واتە ئیعتیقاد بون بە بونی بەرەکەت و پیرۆزی وخێری زۆرو دەستکەوتنی ئەو خێرە لە شوێنەوارو لاشەی پیاو چاکاندا . ئەگەرچی باوەڕیشی وا بێت بەرەکەتە لە خواوەیە، هەر شیرکی بچوکە . بەڵام گەر باوەڕی وابێت بەرەکەتەکە لە پیاو چاکەکەوەیە ئەوە شیرکی گەورەیە .

(٥) التوسل البدعی : واتە هەوڵی خۆ نزیك کردنەوە لە ڕەزا بون و خۆش ویستنی خوا بە ئەنجامدانی عیبادەت بۆ خوا لای گۆڕی پیاوچاکان بەتایبەت . یاخود بڵێی: خوایە بۆ خاتری ئەوان لێمان خۆش ببەو داوامان قەبوڵ بکە ! .

(٦) هەڵواسینی پەڕۆو میروە شینکە و ناڵی گوێ درێژ و شتی تری خوڕافی لەم بابەتە بۆ لادان و نەهێشتنی چاوەزارو حەسادەت و زەرەروزیان (لبس الحلقة والخيط لاتقاء العين.)

**تێبینی**:

شیرکیبچوك جۆری وای هەیە لەوانەیە بگاتە شیرکی گەورەش . ئەوەش کاتێك

---

(١٥) ص ١٧٤ البريكان

کـه بیروبـاوەڕی دڵـی لەگەڵـدا بـوو وەك شیرکی گەورە. بۆ نمونە :

(١) سـوێند خـواردن بـە غـەیری خـوا شیرکی بچوکە . بەڵام ئەگەر سوێند پـێ خوراو بەگەورە دانرا لە دڵەوە وەکو خوا ، ئەوە دەبێت بەشیرکی گەورە .

(٢) پـێش چـاوی (الریـاء) شـیرکی بچوکە . بەڵام ئەگەر لە بونی ئیمـان بـە خوا ڕیایی هەبێت واتە ئیمان هێنانەکەی بە خـوا تـەنها لەبـەر خـوا نـەبێت بـەڵکو لەبەر ئەوەش بێت کە خەڵکی موسوڵمان بـە موسـوڵمانی دا بنـێن ئـەوە شـیرکی مونافیقەکانە و گەورەیە یـاخود ڕیابـازی تێکـەڵی هـەموو کردەوەکـانی بێـت وە هیچ کارێك بە تایبەتی بۆ خوا نـەکات یـا مەبەسـتی دونیـا بێـت بەگشـتی لـە کردەوەکانیدا وە مەبەستی خوا نەبێت .

بەڵام ئەگەر مەبەستی لـە کـردەوەی چاکدا وەك حەج بۆ نمونە پەیدا کردنـی ماڵ بێت یا ئافرەت یان جیهاد بکـات بـۆ غەنیمەت یا دەرسی شەرعی دەخوێنێـت تـاوەکو وەزیفـەو پیشـەیەکی دەسـت کەوێت ئەوە شیرکی بچوکە.

(٣) لە دەست کردنی جـۆرە ئاڵقـەی تایبەت بۆ لادانی چاوەزارو حەسادەت !

ئەگـەر تـەنها گومـانی وابێـت ئـەو ئاڵقەیـە سـەبەبی خـۆ پارێزیـە لـە چاوەزار ئەوە شیرکی بچوکە

وە ئەگـەر باوەڕیشـی وابـوو خـودی ئاڵقەکـە پـارێزەرە لـە چـاوەزار یـا لـە نەخۆشی ئەوە شیرکی گەورەیە .

(٤) **الاستسـقاء بـالأنواء** : واتـە ئیعتیقـاد بـوون بـە ئەسـتێرە وەك سەبەبێك بۆ باران بارین شیرکی بچوکە. بەڵام کە ئیعتیقادی وابێت باران بارین لە ئەسـتێرەوەیە واتـە ئەسـتێرە بـاران دەبارێنن ئەوە شیرکی گەورەیە.

## حوکمی شیرکی بچوك

هەرکەسـێ لـە هـەردوو جۆرەکـەی شـیرك -گـەورەو بچـوك- ڕزگـاری بـوو ئەوە بەهەشتی مسۆگەرە بەفەزڵی خوا.

وە هەرکەسێ شیرکی گەورەی بوبێت و لەسـەری مردبـێ پـێش تەوبـە کـردن" ئەوە دۆزەخی بەردەوامی مسـۆگەرە بـە عەدل و دادپەروەری خوا .

وە هـەر کەسـێ لـە شـیرکی گـەورە ڕزگاری بێت و توشی هەندێ لـە شـیرکی بچـوك بوبێـت بـەڵام کـردەوەی چـاکەی زیاتر بێت لـە تاوانەکـەی ئـەوە دەچـێتە بەهەشت بە یارمەتی خوا .

وە هەرکەسـێ لـە شـیرکی گـەورە ڕزگاری بوو، وە توشی شیرکی بچوك بوو بەزۆری تاوەکو لای تاوانەکەی زیاتر کات لە چاکەکانی ئـەوە دەچـێتە ئـاگرەوە . پەنا بەخوا .

## جیاوازی لە نێوان

## شیرکی گەورە و شیرکی بچوك

| شیرکی گەورە | شیرکی بچوك |
|---|---|
| ١- تەوحید لە بنەڕەتەوە ناهێلێت و مرۆڤ پیی لە دین دەچێتە دەرەوە | * لە گوناهە گەورەکانە وتەواوێتی تەوحید ناهێلێت. بەڵام مرۆڤ پێی لە دین دەرناچێت |
| ٢- هەموو کردەوەکانی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە. | * تەنها ئەوکردەوەیە هەڵدەوەشێنێتەوە کە زاڵ بووە تیایدا، یا لەبنەڕەتەوە هەر لە سەرەتاکەیەوە تێی کەوتووە . |
| ٣- خاوەنەکەی هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە و بەهەشت لەسەری حەرامە. | * سزای بەردەوامی دۆزەخ بۆ خاوەنەکەی دابین ناکات . بەڵکو هۆی چونە ناو دۆزەخەو ئەگەر خوا بیەوێت دەیخاتە ناوی و ئەگەریش بیەوێت لێی دەبورێت. |
| ٤- خوا دوای مردنی خاوەنی ئەو شیرکە، پێش تۆبە" لەو شیرکە گەورەیە خۆش نابێت. | * لێخۆش بوون لەو جۆرە لە ژێر ویست و مەشیئەتی خودایەو مەجالی لێ بوردنی هەیە |
| ٥- خاوەنەکەی خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت بەهۆی شیرکی گەورە. واتە : دروستە خوێنی برێژرێت وماڵی بە غەنیمەت بگیرێت" چونکە لە موسوڵمانان ناژمێردرێت ، بۆیە پارێزراو نابێت. | * خوێن و ماڵی خاوەنەکەی پارێزراو دەبێت چونکە خاوەنەکەی بە موسوڵمان دەژمێردرێت .<br>بەڵام موسوڵمانێکی تاوانبارو کەم باوەڕە. |




# مەرجەکانی بانگەوازکار و خووڕەوشتەکانی

# ﴿ شروط الداعية وصفاته ﴾

مامۆستا عبد الكريم محمد

سوپاس بۆ ئەو خوایەی فـەرمانی پـێ کـردووین بـە شـوێن کـەوتنی پێغەمبـەر (ﷺ)، هەروەها فەرمانی پێ کردووین بـە بانگـەواز کردنـی خـەڵکی بـۆ هاتنـە نـاو دینی ئیسلام .

بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ هاتنـە نـاو دینی ئیسـلام، ڕێگـەی پێغەمبـەر (ﷺ) و شوێن کەوتوانیەتی ، **قال تعالى:**

[ قُلْ هَـٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ][1].

بانگـەواز کردنـی خـەڵکی بـۆ شـوێن کەوتنی ئیسلام کاری سەرەکی و گرنگـی هەموو نێرراوەکـانی خوایـە ، هـەردەبێت کـاری گرنگـی شـوێن کـەوتوانی نێرراوەکـانی خـواش بێـت ، بـۆ هێنانـە دەرەوەی خەڵکی لە تاریکی‌یەکانەوە بۆ ڕوناکی ئیسلام ، لە بـێ باوەڕی‌یـەوە بـۆ باوەڕهێنان ، لەهاوبەش پەیداکردنەوە بۆ بەتـەنها و بەحـەق خواپەرسـتی ، بـۆ ڕزگارکردنیان لەدۆزەخەوە بۆ بەهەشت ، ئەم بانگەوازە حەقـە ڕاوەسـتاوە لەسـەر چەند بنچینەیەکی سەرەکی ، هـەرکاتێك یەكێك لەو بنچینە گرنگانـە نەهاتـە جـێ ئـەوە بـێ گومـان ئـەو بانگـەوازە ڕاسـت نابێـت و بەرهـەمی داواکـراو پێویسـتی نابێت ، هـەر چـەند هـەوڵی بـۆ بـدرێت و کاتی تیا بفـەوتێت ، هـەروەکو چۆن لـە زۆربەی بانگەوازەکانی ئەمڕۆدا بە ئاشکرا ئەیبینین . ئەم بنچینە گرنگانە کـە هـۆی سـەرەکین بـۆ سـەرکەوتنی بانگـەوازی ڕاست ، ئەو بنچینانەن کە قورئانی پیرۆز و سـونەتی پێغەمبـەر (ﷺ) بەڵگـەن لەسەری .

**بنچینەگرنگەکان بریتین لە :-**

**یەکەم: ( العلم بما يدعوا اليه ) :-**

زانیاری بەسوود و پێویست بەشەرعی ئیسـلام کـە وەرگیراوبێـت لـەدوو سەرچـاوەی حـەق کەسـێ‌هەمی نی‌یـە (كتاب الله وسنة رسوله (ﷺ)) .

---

(١) (سورة يوسف:١٠٨) .

پێویسته لەسەر بانگەوازكار زانیاری هەبێت بەوشتەی كە بانگەوازی خەڵكی ئەكات بۆ جێبەجێ كردنی . لەبەرئەوەی ئەگەر كەسێكی نەزان بێت بەكەڵكی ئەوە نایەت بانگەواز بكات چونكە زیانی زیادتر دەبێت تا سوودی ، هەروەها بانگەوازی نەزان پێچەوانەی بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ)و شوێن كەوتووەكانیەتی .

**قال تعالى:**[ قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ][2].

((بصيرة)) واتە : زانیاری .گومانی تێدانیە بانگەوازكار (الداعیة) ڕووبەڕووی زانایانێكی گومڕا ئەبێتەوەو چەندەها گومانی ڕووبەڕوو دەكەنەوە، (مناقەشەی) بەتاڵی لەگەڵدا ئەنجام ئەدەن، بۆ ئەوەی حەقێكی شەرعی بشارنەوە بۆیە پێویستە لەسەر بانگەوازكار زانیاری شەرعی تەواوی ببێت تا بتوانێت هەموو گومان و (مناقەشە) بەتاڵە كانیان هەڵبوەشێنێتەوە بەحەق .

ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەصەحیحەكەیدا سەرباسێكی داڕشتووە بەم شێوەیە (باب: العلم قبل القول والعمل).

واتە: زانیاری بوون پێشی هەموو قسەو كردارێكەو بەڵگەش لەسەری:

[فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ][3].

واتە تۆ بزانە هیچ بەرستراوێك نیە بەحەق تەنها ذاتی الله نەبێ ، هەموو بانگەوازێك بێ زانیاری بێت گومانی تێدا نیە ئەو بانگەوازە لادان لەحق و گومڕایی تێكەڵ ئەبێ .

### پێویستە زانیاری بە سێ شت هەبێت

١- ئەو شتەی كە دەیگەیەنیت بە خەڵك پێویستە لەسەر زانیاری بێت .

٢-زانیاریت بەو كەسەی كە بانگی دەكەیت بۆشوێن كەوتنی دینی ئیسلام .

٣-زانیاری بەشێوازی بانگەوازەكە ، واتە:لەسەر خۆبیت دووربینی تیادابكرێت

دووەم: ( **العمل بما يدعوا اليه** ).

كردەوە كردن بەو حەقەی دەیگەیەنیت بەخەڵك ، تارێگە ڕۆشن كەرەوەیەكی باشبێت بۆ خەڵكی ، كردەوەكانت ڕاستی قسەكانت بسەلمێنێت خوای گەورە دەربارەی بانگەوازی (شعیب)پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت كاتێك كە ئامۆژگاری گەلەكەی ئەكرد :

[ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ ][4].

واتە: نامەوێت ئەوەی كە فەرمان

---

(٢) (سورة يوسف:١٠٨) .

(٣) (سورة محمد:١٩) .

(٤) (سورة هود:٨٨) .

ئەكەم بە ئێوە لە چاكە خۆم پێچەوانەی جێبەجێ بكەم ، لەئایەتێكی تردا ئەفەرموێت ):

[ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً ][5]

واتە : كێ لەوكەسە قسەی چاكترە كە خەڵكی بانگ بكات بۆ شوێن كەوتنی دینی ئیسلام، خۆشی كردەوە بكات بەبانگەوازە حەقەكەی كەلەسەریەتی ، واتە: **هیچ** كەسێك نیيە بگاتە ئەو پلە بەرزەی كەلەسەریەتی .

**هەندێك لەزانایانی (سەلەف) دەفەرموون** :- (ئەگەر بتەوێت خەڵكی فەرمان بەچاكەو قەدەغەكردنی خراپت لێ وەربگرن: كەفەرمانت كرد بەچاكەیەك خۆت یەكەم كەس بە جێبەجێی بكەیت، كە خراپی شتێكت باس كرد خۆت یەكەم كەس بە لەدوور كەوتنەوە لێی) .

**سێیەم: ( الإخلاص ) .**

واتە: مەبەست لەقسەو كردار تەنها بۆ ڕزامەندی پەروەردگار بێت(تبارك وتعالى) ئەمەش چەند خاڵێك دەگرێتەوە :-

١- مەبەستی بانگەوازكردنی خۆدەرخستن نەبێت لای خەڵكی .

٢- بانگەوازی بۆ بەدەست هێنانی ماڵ نەبێت .

٣- بانگەوازی بۆ بەدەست هێنانی پلەو پایەی دنیا نەبێت .

٤- بانگەوازی بۆ ئەوە نەبێت تا ژنێكی بدەنێ .

٥- بانگەوازی بۆ ئەوە نەبێت تا خەڵكی پێی بڵێن زانایەكی بلیمەتە .

٦- بانگەوازی بۆ ئەوە نەبێت (مناقەشە) بكات لەگەڵ زانایاندا یان بۆ بە چاوی سووك سەیركردنی نەخوێندەوارەكان .

٧- بانگەوازی بۆ ئەوە نەبێت دەخلی خەڵكی پێ خڕبكاتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی .

خوای پەروەردگار ئەفەرموێت دەربارەی بانگەوازی نێرراوەكانی خۆی :

[ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً ][6] .

واتە : بلێ لەبەرامبەر ئەم بانگەوازەدا ئەجرو پاداشتێكم لە ئێوە ناوێ

[ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً ][7] .

واتە : داوای ماڵتان لێناكەم .

**چوارەم ( البداءة بالأهمّ )**

لەپێشدا بایەخ بەگرنگترین چاكە (معروف) بدات لە بانگەوازیدا وخەڵكی وریا بكاتەوە لە ترسناكترین گوناه (منكر) :

(٥)(سورة فصلت:٣٣) .

(٦) (سورة الانعام:٩٠) .

(٧)(سورة هود:٢٩) .

گــرنگترین چــاکە بریتییـەیــــە لــــە چارەسەرکردنی بیرو بـاوەڕ ، فـەرمانیان پـــێ بکـــات پەرســـتنیان تـــەنها بـــۆ پـــەروەردگاربێت . ئاگاداریـــان بکـــات هاوبەش بۆ خـودا پەیدانەکـەن . پاشـان فـــەرمانیان پـــێ بکـــات بـــەکردنی نوێـــــژەکانیان بەمەرجەکانیـــــەوە ، وەدەرکردنـــــی زەکـــــاتی ماڵیـــــان ، وەجێبـــەجێ کردنـــی واجبـــەکانی تـــرو دورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان ئابەم شـێوەیە نێراوەکـانی خـوا هـــەموویان بانگـــەوازیان کـــردووە خـــوای گـــەورە فەرموویەتی:

[ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ][٨] .

خـوای گـەروە هـــەواڵی پێـداوین بـــە دڵنیاییـــەوە ناردوویـــەتی بـــۆ هـــەموو کۆمەڵە خـەڵکێك نێراوێکـی خـۆی پێیـان ڕابگەیەنێت تەنها پەرستنتان بۆ خوا بێت وخۆتـــان بپـــارێزن پەرســـتنتان بـــۆ دروستکراوەکانی خوا نەبێت .

خــــوای گــــەورە فەرموویــــەتی لــــە ئایەتێکی تردا :

[ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ] {سورة الانبياء:٢٥} واتە :

ئێمە بەر لەتۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر ئـەوە کـە نیگامـان (وحي) مـان بـۆ نـاردوون بێجگـە لـە مـن پەرســتراوێکی بەهـــەقی دیکەنییـــە، جـــا کەوایـــە تـــەنیا مـــن بپەرســـتن. هـــەروەها کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) (معـاذی) نـارد بـۆ شاری (یەمەن) پێی فەرموو:

( انك تأتي قوماً من أهـــل الكتـــاب ، فليكن أول ما تدعوهم اليه شهادة أن لااله الا الله ، فان هم أجابوك لذلك فـــأعلم أن الله افترض عليهم خمس صلوات في اليـــوم والليلة .....))[٩] الحديث .

واتە : دەگەیت بـە گـەلێك لـە گـاورو جولەکە ، یەکەم شـتێك کـە بانگـەوازیان بکەیت بۆ جێبەجێ کردنی، بانگـەوازیان بکە با بەتەنها و بەحـەق پەرستنیان بـۆ (الله) بێـت ، ئەگـەر وەڵامیـان دایتـەوە فێریان بکە کە پەروەردگار هەموو شەو و ڕۆژێـك (٥) پێـنج نوێـژی فـەرز کـردووە لەسـەریان .......... ، هـەروەها ئەگـەر بـەجوانی بنواڕینـە شـێوازی بانگـەوازی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبینین خێرترین و تەواو تـرین شـێوەی بانگـەوازی لـەدوای خـۆی بەجێ هێشـتووە بۆمـان ، ئـەوە بـوو بـۆ مـاوەی (١٣) سـیازدە سـاڵ بانگـەوازی خـەڵکی ئـەکرد بـۆ ئـەوەی بەتـەنها و بەحـەق ذاتـی الله بپەرسـتن و قەدەغـەی

---

(٨) (سورة النحل:٣٦) .

(٩) أخرجه : بخاري (٤٣٤٧) ، ومسلم (١٩) .

ئەکرد لێیان هەموو شێوازێکی هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، پێش ئەوەی بانگیان بکات بۆ کردنی نوێژ و زەکات و ڕۆژو حەج ، هەروەها پێش ئەوەی قەدەغەیان بکات لە سوو لەزینا ولەدزیو لەکوشتنی مرۆڤەکان بەناهەق ، بەم شێوەیە زانیمان پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن بایەخی سەرەکی داوە بەگرنگترین شت لەئیسلامدا کەبرتییە لەپاك کردنەوەی بیرو باوەڕی خەڵکی پێش هەموو جۆرەکانی تری خوا پەرستی .

**پێنجەم : ( الصبر )**

ئارام گرتن لەسەر ئەو ناخۆشیانەی کەدێتە ڕێگەی بانگەواز کار لەکاتی بانگەوازەکەیدا ، لەبەر ئەوەی ڕێگەی بانگەوازی خوا بەگوڵ و گوڵزار نەڕازاوەتەوە بۆ بانگەواز کاران، بەڵکو ڕێگەی بانگەوازی خوا چوار دەوری تەنراوە بەناڕەحەتی و ناخۆشی ، جا خێرترین پێشەواپانێك بۆ ئێمەی موسوڵمان کە سوود وەربگرین لە ئارام گرتنیان لەکاتی بانگەوازیاندا بریتین لەپێغەمبەران (ﷺ)، کە چۆن تووشی گاڵتە پێ کردن و ئازاردان بوون لەلایەن گەلەکانیانەوە . خوای گەورە فەرموویەتی:

[ وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ](١٠) .

واتە : وە بەڕاستی پێغەمبەرانێ کەبەر لەتۆ بوون کەوتبوونە بەر گاڵتەپێ کردنی خەڵکی . بەڵام سەرئەنجام ئەوانەی گاڵتەیان دەکرد بەپێغەمبەران ، گاڵتە کردنەکە خۆیانی گرتەوە و سزای خوایان بۆ هاتە خوارەوە .

خوای گەورە فەرموویەتی: [ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَى مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ](١١) .

واتە : وە بەهەقیقەت پێغەمبەرانی بەر لەتۆ بە درۆ خرانەوە و لەبەرامبەر بەدرۆ خستنەوەی ئەواندا ئارامیان گرت و لەو ڕێگایەی بانگەوازیاندا ئازاریان دی تا کاتێ کەیارمەتی ئێمەیان پێگەیشت .

واتە : تۆش ئەی پێغەمبەری خوا محمد (ﷺ) وابە و ئارام بگرە ، هەر بەو شێوەیە شوێن کەوتوانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) تووشی ئازارو ئەشکەنجەو ناڕەحەتی ئەبن لەکاتی بانگەوازیاندا بە گوێرەی ئەنجام دانی بانگەوازەکەیان بۆلای دینی ئیسلام .

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆرینەی براو خوشکی موسوڵمانم زۆر ناڕەحەت دەکرێن

---

(١٠) (سورة الانعام:١٠) ، (سورة الانبياء:٤١) .

(١١) (سورة الانعام:٣٤) .

له بازاڕدا ، له قوتابخانەدا ، لەماڵدا ، لە کۆلاَندا ، له زانکۆ دا .

بە دڵنیای یەوه دەڵێم : زۆر لە گەنجەکانمان سکالاَ دەکەن لە دەست دایکیان وباوکیان کەناڕەحەتییان بۆ دروست ئەکەن ، ڕەفتاری ناشەرعی و ناشرین ئەدەنه پاڵ جگەر گۆشەکانیان . ئەو براو خوشکانەم پرسیار دەکەن و دەڵێن هەڵوێستمان چی بێت بەرامبەر دایك و باوکمان ؟

- پێویسته لەسەرمان ئارام بگرین و بەهیوای پاداشتی خوا بین و هەر بەردەوام بین لەسەر بانگەواز کردن ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك به فەرمانی خوا دەستی کردبە بانگەوازی حەق ئایا ئازار نەدرا ؟ دەربەدەر نەکرا ؟ بێگومان بەڵێ .

چەند نموونەیەك لە ئارام گرتنی پێغەمبەر (ﷺ) باس ئەکەین بۆ ئەوەی بانگەواز کاران سوودی لێ وەربگرن و شوێن کەوتەی پێغەمبەرین (ﷺ) لە ئارامگرتندا .

*** نموونەی یەکەم :** کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای هۆزی (ثقيف) له شاری (طائف)، تا بانگەوازیان بکات بۆ لای دینی خوا .

ئایا چییان پێکرد ؟ هۆزی (ثَقيـف) فەرمانیان کرد بە نەفامەکانیان لەڕاست و چەپی ڕێگاکەوه بوەستن پاشان کەوتنە بەرد باران کردنی پێغەبەر (ﷺ) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چیکرد ؟ بەجێی هێشتن لە کاتێکدا لەوپەڕی ناڕەحەتیدا بوو بۆیە کاتێك هۆشی هاتەوه گەشتبۆوه لای تەپۆڵ کەیەکی بچووك کە پێی دەوترێت (قَرْنُ الثعالِب)، ئەفەرموێت سەرم بەرزکردەوه ، پەڵە هەورێکم بینی سێبەری بۆ کردم و سەیرم کرد (جبريل) (عليه السلام) ، لە ناو پەڵە هەورەکەیدایه و بانگی لێ کردم و ووتی :

دڵنیابە خوا بیستی قسەی قەومەکەت بۆ تۆ و چۆنیش وەلاَمیان دایتەوه، ئەویشی بیست ئالەم شوێنەدا بوو (جبريل) (عليه السلام) گەیشتە لای پێغەمبەر (ﷺ) مەلائیکەی فەرمان پێ کراوی کێوەکان لە گەڵ (جبريل) (عليه السلام) بوو ، (جبريل) (عليه السلام) فەرمووی خوای گەورە مەلائیکەی کێوەکانی ناردووه ، چیت ئەوێت بە مەلائیکەی کێوەکان بڵێ ئەویش جێبەجێی دەکات ، مەلائیکەی کێوەکان سەلامی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) پاشان ووتی : ئەی محمد خوا بیستی قسەی قەومەکەت و من مەلائیکەی کێوەکانم ، دڵنیابە خوا منی ناردووه بۆ لای تۆ تا فەرمانم پێ بکەیت چۆن ئەتەوێت ؟، ئەگەر ئەتەوێت هەردوو شاخەکە ئەدەم بەیەکدا و ئەیانکەم

بەیەك تا هەموویان لەناو بچن ، ئایا بڕیاری پێغەمبەری خوا چی بێت ؟ -

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە مەلائیکەی کێوەکان (( بەهیوای خوام لەنەوەی ئەمانە کەسانێك لەدایك ببن بەتەنها و بەحەق ذاتی (الله) بپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن بە هیچ شێوەیەك))[١٢] .

ئەم فەرموودەیە شێوازی بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون دەکاتەوە، کەتا چ ڕادەیەك ئارامی گرتووە لەبەرامبەر ئازاردانی خەڵکی و چەندێك دووربینی کردووە و نائومێد نەبووە لە هیدایەتی خوا ، کەسانێك سوودی تەواوی لێ وەردەگرن کە بیرو باوەڕیان پاك بێت و پلەی بەرزی پێغەمبەر (ﷺ) بزانن لەلای خوا .

ئەوەش بزانین : کارەساتی هۆزی (ثقیف) لە دڵی پێغەمبەردا (ﷺ) ناڕەحەت تربوو لە جەنگی أُحُد : بۆیە کاتێك دایکمان عائشە (رضي الله عنها) پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد ئایا ناڕەحەتی قورسترت بەسەردا هاتووە لە ڕۆژی أُحُد قورسترو ناڕحەت تر بێت ؟ پێغەمبەر (ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی لەأُحُد ناڕەحەت تر ئەوە بوو کە بانگەوازی (ابن عبد یالیل بن عبد الكُلال)م کرد وەڵامیان نەدامەوە و بەدەم بانگەوازەکەمەوە نەهاتن .

*** نموونەی دووەم :**

(( پێغەمبەر (ﷺ) لەسوجدەدا بوو لە ژێر (کەعبەدا) خوا پەرستی دەکرد لە شوێنێکدا لە هەموو شوێنەکان هێمن ترو بێ ترستر ، تەنانەت لای هۆزی (قوڕەیش) یش (کعبە) لە هەموو شوێنەکان بێ ترس تر بوو تەنانەت پیاوەکانیان بکوژی باوکی خۆیان ئەبینی لای (کعبە) نەیان ئەکوشت . بەڵام ئایا کاتێك پێغەمبەریان بینی (ﷺ) لەسوجدەدا بوو لای (کعبە) چییان لەگەڵدا ئەنجامدا ؟ فەرمانیان دەرکرد خراپترین پیاویان بچێت ناوسکی ووشتری فڵانە کەس بهێنێ لەکاتی سوجدەی پێغەمبەردا (ﷺ) فڕێی بداتە سەر پشتی !!.

خراپترین پیاویان بریتی بوو لە (عُقْبَة بن أبي معَيط) کە ئەم کارە خراپەی ئەنجامدا !!.

براو خوشکی موسوڵمانم چی ئەڵێن دەربارەی ئەم ئازاردانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەمێژووی نەفامیشدا وێنەی نەبووە ؟!!. لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (ﷺ) ئارامی گرت و بەئومێدی پاداشتی خوابوو ، بەو شێوەیە مایەوە لە

---

(١٢) أخرجه : البخاري (٣٢٣١) ، ومسلم (١١١) .

سوجدەدا تا کچە بچوکەکەی (فاطمة) (ﷺ) هات و ناوسکی ووشترەکەی لەسەر پشت و ناو شانی باوکیلابرد ، دوای تەواو بوونی لە نوێژەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەستەکانی بەرز کردەوە و سێ جار دوعای کرد خوایە قورەیش لە ناو بەریت بە سزای خۆت سزایان بدەیت ))[١٣] ، جا براو خوشکە موسوڵمانەکانم ئارام بگرن ، برا گەنجەکانم ئارام بگرن ، بەردەوام بن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی حەق ، باش بزانن خوا یارمەتی ئەو کەسانە ئەدات ، کە بەردەوام گوێڕایەڵن و چاکەکارن .

**ئایا لەگەڵ ئارام گرتندا بانگەوازی کەس و کارمان بکەین ، یان تورەبین و بێ دەنگ بین ؟!**

لەوەڵامدا ئەڵێین بەردەوام ئەبین لە بانگەواز کردنیاندا ، نائومێد نابین . بەڵام بە لەسەرخۆی و دوور لەتوندی و تیژی ، لەبەر ئەوەی هەندێ لەخەڵکی لەئەنجامی غەم خواردنی بۆ دینی خوا توند وتیژی بەکار ئەهێنێ بۆیە خراپە کاری زۆر ئەبێت تا چاك کردن ، لەبەر ئەوە پێویستە هەموو بانگەواز کارێك ئەوەندە لەسەر خۆبێت تا هەموو کارەکانی لە شوێنی گونجاوی خۆیدا ئەنجام بدات .

(١٣) أخرجه : البخاري (٢٤٠) ، ومسلم (١٧٩٤) .

باش بزانین کە خەڵکی لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا ناگەنە ئەو ئاستەی ئیسلام وەربگرن بە چاکی ، بەڵکو بڕیاری خوا وایە کەم کەم ڕاستیەکان قەبوڵ ئەکرێت زۆربەی موسوڵمانان شارەزای ئەوەن کە پێغەمبەر (ﷺ) (١٣) ساڵ مایەوە لە شاری (مکە) بانگەوازی خەڵکی ئەکرد ، لەگەڵ ئەوەشدا وەکو پێویست وەڵامی بانگەوازەکەیان نەدایەوە ، مانەوەشی لە شاری (مدینة) زۆر بوو دوای (٢٣) ساڵ خوای گەورە دینی ئیسلامی بۆ تەواو کرد ، تۆش گومانت وایە خەڵکی ئەگەڕێنەوە بۆ دینی خوا لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا لەگەڵ ئەو هەموو پێچەوانەی‌یاندا بەرامبەر ئیسلام! ! زۆر جار پرسیاری ئەوەش ئەکەن .. ئایا قسەیان لەگەڵ دابڕم ؟ ئایا تەلەفزیۆنەکە یان ڕادیۆکە یان تسجیلەکە بشکێنم ؟ ئەمانەو گەلێك پرسیاری تر ...

لەوەڵامدا ئەڵێین بانگەواز بکە بۆ شوێن کەوتنی ئیسلام بەلەسەر خۆی و هێمنی ، ئەگەر سوودی نەبوو دروست نی‌یە لەگەڵیان دابنیشیت و ئەوانیش خەریکی تاوان کردنن ئەمەش مانای ئەوە نی‌یە لە ماڵدا نەمێنیتەوە بەڵکو بچۆ ژورێکی تر ، تائەتوانی خۆت لەسەیرکردنی تاوان و بیستنی تاوان

بپارێزە لەبەر ئەوەی هەر کەسێك دابنیشێ لەگەڵ تاوان باراندا کە تاوان دەکەن ئەوەی دانیشتووە لەگەڵیان هاوبەشی تاوان باران دەبێت لە تاواندا .

قال تعالى:

[ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ ](١٤) .

مانای ئایەتەکە : وە خوای گەورە لە قورئاندا (ئەم حوکمەی) بۆ ئێوە ناردووە تا هەرکاتێك کەبیستان کوفر و گاڵتە ئەکرێ بە ئایەتی خوا لەگەڵیان دامەنیشن،تا ئەچنە سەر قسەیەکی تروئەو قسەی پێشوو ئەگۆڕن ، ئەگەر لەگەڵیان دابنیشن ئێوەش وەکو ئەوانتان لێدێ .

پێویستە لەسەر بانگەواز کاران بە ئارام بن ئەوەی ئەمڕۆ چاك نەبێت سبەینێ چاك ئەبێت ان شاء الله تامانەوەت خێری تێدا هەبێت لەگەڵیاندا ئەوەخێرە ، لەبەر ئەوەی چاك ئەزانین دروست کردن قورسترە تاڕووخاندن ، دروست کردن لەسەر خۆیی زۆر دەوێت، بۆ نموونە:

دروست کردنی کۆشکێك ئەگەر سێ ساڵ بخایەنێت تێکدانی کەمتر لە سێ کات ژمێری دەوێت ، جا دروست کردن وچاك کردنی و پاك سازی نەتەوەیەك ماوەیەکی زۆری دەوێت بۆیە پێویستە زۆر ئارام بگرین .

ئامۆژگاریشمان بۆ دایکان و باوکان و خزمانمان ئەوەیە :-

کاتێك ئەبینن کوڕان و کچانتان ڕێبازێکی چاکیان گرتۆتە بەر و لەسەر ڕێگای ڕاستن ، حەڵاڵ نییە بۆ ئێوەی باوکان و دایکان ببنە کۆسپ لە ڕێگەی جگەر گۆشەکانتاندا ، بەڵکو حەق وایە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە، کە کوڕو کچی خۆتانە ڕێنمونیتان ئەکەن بۆ خێر وچاکە و ئاگادارتان ئەکەنەوە لە خراپەکاری و شەڕ خوازی ، سوێند بە خوا چاکێتی کوڕو کچتان خێرترە بۆتان لە بوونی ماڵ و کۆشك و سەیارە .

پێویستە لەسەرتان سوپاسی خوای گەورە بکەن زیاتر هانی کوڕ و کچتان بدەن بۆ خێر و چاکە کاری ، قسەی خێریان لێ وەربگرن و بە دڵ خۆشییەوە پێشوازیان لێ بکەن .

### شەشەم: على الداعية أن يكون متحليا بالخلق الحسن مستعملا للرفق واللين في دعوته

واتە : لەسەر بانگەوازکار پێویستە خۆی بڕازێنێتەوە بە خووڕەوشتی جوان، تا بانگەوازەکەی سوودمەندبێت ، هەروەها نەرم و نیان بێت تا خەڵکی بانگەوازەکەی لێ وەربگرن ، وەکو چۆن

---

(١٤) (سورة النساء:١٤٠) .

خـوای گـەورە فـەرمان ئـەكات بـەدوو نێراوی خۆی (موسـى وهـارون) ، نـەرم و نیـان بـن لـەكاتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی سەركەش تـرین بـێ بـاوەڕی سـەر ڕووی زەوی كە(فرعون)ە كە داواكاری خوایەتی ئەكرد ، خوای گەورە پـێی فەرموون:
[ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى ][15] .

مانای ئایەتەكە : جا بە نەرم و نیانی قسـەی لـە گەڵـدا بكـەن تـا بـەڵكو بـیر بكاتەوەو پەند وەربگرێ یا لەخوا بترسێ
خـوای گـەورە بـە (موسـى)ی (ﷺ) فەرموو:
[ اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى * فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَى أَن تَزَكَّى * وَأَهْدِيَكَ إِلَى رَبِّكَ فَتَخْشَى ][16] .

مانای ئایەتەكە : بڕۆ بۆلای فیرعەون ئـەویاخی بـووە ، جـا پـێی بڵـێ : ئایـا ئەتەوێ پاك ببیتەوە ، وە تۆ ڕێنمویی بكەم بۆلای پەروەردگارت تا لێی بترسی.
خـوای گـەورە فەرموویـەتی لەحـەقی پێغەمبەرماندا (ﷺ):
[ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ][17] .

مانای ئایەتەكـە: بـە هـۆی ڕەحمـەتی خـوای گــەورە بــوو كــە بــۆ شــوێن كەوتوەكانت نەرم بووی ، جائەگەر توندو تــورەو دڵ ڕەق بویتایــە لێــت دوور دەكەوتنەوە .

خووڕەوشــتی بــەرزی بانگــەوازكار پێویسـتە دیـار بێـت لـە بـیرو باوەڕیـدا ، لەپەرسـتنیدا ، لــە هــەموو هەڵســوو كەوتێكیـدا ، ئەگـەر پێچـەوانەش بێـت دڵنیـابن لـە بانگەوازەكەیدا سـەركەوتوو نابێت ، ئەگـەر سـەركەوتووش بـوو كـەم سوود دەبێت بۆ نموونە :

١- بانگەوازكارێك باس لە حـەرامێتی سـوو (ربـا) بكـات ، لەهـەمان كاتیشـدا خـۆی كـارو ئیشـی بـە سـوو جێبـەجێ ئـەكات ئایـا خووڕەوشـتی بانگـەوازكار ئاوایە ؟! نەخێر !! .

٢- پیـاوێكی تـر بـاس لـەوە دەكـات نـەكردنی نوێـژ بـە كۆمـەڵ لـە مزگـەوت كـارێكی خراپـە بـۆ پیـاوان كـە (عـذر) بەهانـە یـان نـەبێت ، وەپێیـان دەڵێـت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:
(( إن أثقل صلاة على المنافقين صلاة العشاء وصلاة الفجر، ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبواً ......))[18] .

مانای فەرموودەكە : قورسترین نوێـژ لەسـەر دووڕووەكـان نوێـژی خـەوتنان و بەیانییە، ئەگەر بیـان زانییایـە چـەندێك خێریان هەیە لای خوای گـەورە، ئـەهاتن ئەگەر بەگاگۆڵكێ بووایە وەكو منداڵ. لە

(١٥) (سورة طه:٤٤) .
(١٦) (سورة النازعات:١٧-١٩) .
(١٧) (سورة آل عمران:١٥٩) .
(١٨) أخرجه : البخاري (٦٥٧) ، ومسلم (٤٢) .

هەمان کاتیشدا خۆی ناچێت بۆ نوێژی خەوتنان و بەیانی .

ئایا خوڕەوشتی بانگەوازکار ئاوایە ؟ ! نەخێر !! .

٣- پیاوێکی تر باس لە خراپێتی باس کردنی خەڵکی ئەکات (الغيبة) خۆیشی بەوکارە هەڵئەستێت و هیچ گوێی پێ نادات ، ئەم کارەش خووڕەوشتی بانگەوازکار نىیە .

٤- پیاوێکی تر باس لە خراپی و حەرامی قسەهێنان وبردن (النميمة) ئەکات بۆ ئاژاوە نانەوە بۆیان ڕوون ئەکاتەوە کە ئەم کارە هۆیە کە بۆ سزادانی ناو گۆڕ،لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بەم کارە خراپە هەڵدەستێت و گوێی پێ نادات ، ئایا ئەمەش ئەبێ خووڕەوشتی بانگەوازکار بێت ؟ ! نەخێر !! .

لەکۆتایىدا ئەڵێم: زۆر پێویستە بانگەوازکار خۆی چاك بکات بە ڕەوشتی بەرزی ئیسلام پێش ئەوەی داوا لە خەڵکی بکات ڕەوشتیان چاك بکەن ، هەروەها بانگەوازکار کاتێك بانگەوازەکەی بەسوود ئەبێت کرداری پێچەوانەی وتاری نەبێت .

**حەوتەم: على الداعية أن يكون قوي الأمل لاييأس من تأثير دعوته وهداية قومه ....**

پێویستە لەسەر بانگەوازکار هیواو ئومێدی بەهێز بێت بەرامبەر بانگەوازەکەی وە نابێت نائومێد بێت، نەڵێت بانگەوازەکەم کاریگەری نىیە لەسەر خەڵکی قەومەکەم ڕێگای ڕاست ناگرنەبەر ، هەروەها نەڵێت خوا یارمەتیم نادات هەرچەندە ڕۆژگاری پڕ ناڕەحەتی درێژ بخایەنێت . با بەچاکی لە پێشەواکانمان بڕوانین و نێراوەکانی پەروەردگار خێرترین پێشەوامانن .

بۆ نموونە :

- پێغەمبەر نوح (ﷺ) مایەوە لەناو قومەکەیدا (٩٥٠)ساڵ بانگی ئەکردن بۆ لای خوای خۆیان کە ذاتی (الله)یە .

خوای گەورە فەرموویەتی:

[ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَاماً ] {سورة العنكبوت:١٤}.

مانایئایەتەکە: وەبەحەقیقەت ئێمە (نوح) مان بە پێغەمبەری (ﷺ) ناردەلای هۆزەکەی جا ئەو هەزار ساڵ بێجگە لە پەنجا (٩٥٠) ساڵ لە ناویاندا ژیا بانگەوازی ئەکردن .

٢-ڕووداوی (طائف)یش کەبەسەر پێغەمبەردا هات (ﷺ)، نموونەیەکی پڕخێرو بەرەکەتی ترە بۆ پەند لێ وەرگرتن .

٣-پێغەمبەر إبراهيم (ﷺ)، لەسەر بانگەوازکردنی بۆ بیرو باوەڕی پاك و

ڕاست خرایە ناو ئـاگرەوە و هـەر ئـارامی گرت ، کاتێکیش گەلەکەی (قەومەکـەی) بەجێ هێشت دوعای شەڕیشی لێ نەکردن .

٤- ئـازاردانی (أصـحاب)، هاوەڵـە بـەڕێزەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)، وەکـو : یاسر باوکی عمّار ، سميَّة دایکی عمّار ، بـلال بـن ربـاح ، صُـهیب ، چـەندین (أصـحاب) هـاوەڵی تـر- سميّـة دایکـی عمّـار سـزا درا هـەتا مـرد لەبـەر ئـەوەی خـاوەنی ئـەو بیروبـاوەڕە ڕاسـت و پاکـە بـوو ، نـەك لەبـەر ئـەوەی سُـميَّە سـەرکردەیەکیڕامیاری بووبێـت بۆیـە سزادرا !!! ، مجاهد دەفەرموێت : (أول شهيدة في الاسلام سُميَّة والدة عمّار .

امـا أبـو جهـل فطعنهـا بحربـة في قُبُلها)[19] .

أبو جهل (لعنهُ الله) حەربەیەکی کـرد بـە عـەورەتیا و شـەهیدی کـرد ، بـوو بەیەکەم شەهیدی ئیسلام .

**هەشتەم: التمسك بالكتاب والسنة**

دەسـت گـرتن بـە قورئـان و سوونەتەوە .

ئەم بانگەوازە هەقە، سوپاس بۆ خـوا هـەموو شـتێك دەگرێتـەوەو گشـتیـیە لـە هەموو وولاَتانی ئیسلامدا، بەلاّم پێویستە هەموو کـات ئـەم بانگـەوازە لەسـەر ئـەو بنچینە بەهێزە بمێنێتەوە کە بریتیـیە لە قورئان سوننەت بە تێگەیشتنی پێشین و پێشەوایانی ئوممەت . ئەگەر بەوشێوەیە نەبێت ئەوە بێ گومـان بانگـەوازێکی لارو ناتەواو ئـەبێت و دورنیـیە وێـران کردنـی زۆر تربێت تا دروست کردن .

لای قوتابیـانی زانسـتی شـەرعی شـاراوەنییە چـیرۆکە درێژەکـەی (أبـو سفيان) (ﷺ)، کاتێك بۆ بازرگانی چووە (شام) کۆبووە لەگەڵ پاشای (شام)دا کە بریتی بوو لە (هِرَقْل)ی پاشای شام، ئـەو کاتە أبو سـفيان بـێ بـاوەڕ بـوو ، هرقـل چـەند پرسـیارێکی لـە ابـو سـفيان کـرد دەربـارەی پێغەمبـەر (ﷺ) ابـو سـفيان لەوەلاّمدا ووتـی : ئـەڵێت : (( أعبـدوا الله وحده ولاتُشركوا به شيئا واتركوا مايقول آبـاؤكم ، ويـأمر بالصـلاة ، والصِّـدق والعفاف والصلة ))[20]. واتـە : ئـەڵێت : بەتـەنها پەرسـتنتان بـۆ پـەروەردگارتان بێت و هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا مەکـەن . وازبهێـنن لـەو قسـە خراپانـەی کـە بـاو باپیرتـان وتویـەتی و کردوویـەتی وپێچەوانەی ئیسلامە ، فەرمان ئەکات بە نوێژ کردن ، ڕاست گۆیی ، داوێن پاکی ، سەردانی خزم و دۆستان ، هرقل وتی :

(١٩) أخرجه : ابن سعد في الطبقات (٨/٢٦٤-٢٦٥) .

(٢٠) أخرجه : البخاري (٦) .

( ان کان ماتقول حقّاً فسیملك موضِع قَدَميَّ هاتَينْ)، واتە: ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێ ی ڕاست بێت ، ئەم شوێن ودەسەڵاتەی منیش دەکەوێتە ژێر حوکمی ئەو .کێ ئەیزانی کاتێك هرقل ئەم قسەیە ئەکات هێشتا عەرەبەکان مل کەچی بانگەواز نەبووبوون ، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کردبوو ، (مکە) ئازاد نەکرابوو ، هەرقلیش ئەم مژدە دەدات بە ابو سفیان .

ئایا ئەم قسەیەی هرقل هاتەجێ یان نا ؟ ئایا پێغەمبەر (ﷺ) شامی ڕزگار کرد؟ چۆن شام ڕزگارکرا ، لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) مرد هێشتا شام ڕزگار نەکرابوو ؟!!

– لەوەڵامدا ئەڵێم : بەڵێ شام کەوتە ژێر دەسەڵاتی حوکمی ئیسلام بە بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ)، نەك خودی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لەبەر ئەوەی بانگەوازەکەی سەر ڕووی زەوی گرتەوە.

بانگەوازی حەق شوێنەواری بت وبت پەرستانی ڕامالی و زەوی پاك کرایەوە لەهاوبەش بۆ خوا پەیداکردن وشامیش ئازاد کرا لەسەردەمی (خەلیفە ڕاشیدەکاندا) دوای پێغەمبەر (ﷺ) ئازادیان کرد بە بانگەواز و شەریعەتی پێغەمبەر (ﷺ) .

کەواتە ئەڵێم : ئەگەر ئوممەتی ئیسلامی بگەڕێنەوە بۆلای دینی خوا بە ڕاستی بە کاربەدەست و بە یارمەتی دەرانی کاربەدەستان وە بەڕاستی بگەڕێنەوە بۆ دینی خوا ، خاوەن باوەڕەکان بە دۆستی خۆیان بزانن وبێ باوەڕکان بە دوژمنی خۆیان بزانن ، ئەو کاتە دەسەڵاتدارێتی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان بەهۆی دەست گرتنیان بە قورئان وسوننەتەوە ، ئەوەش بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە [وَمَا ذَلِكَ عَلَى اللهِ بِعَزِيزٍ][21]

ئەم بانگەوازە سوپاس بۆ خوای گەورە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو گەشەکردن دەڕوات ، ئەگەر بە چاکی پەیوەست نەبین بە قورئان و سوننەت بەتێگەیشتنی پێشەوایانی پێشینییەوە، مەترسی ئەوە ئەکرێت زیانی زۆر تربێت تا سوودی .

### نۆیەم: الفهم لمقاصد الشريعة

تێگەیشتن لە مەبەستەکانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) لە شەریعەتدا لە (أمر ونهي وحەلاڵ وحرام).

واتە : تێ گەیشتن لە مەبەستی پەروەردگار ، هەروەها مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەمەش زۆر گرنگە لەبەر

(٢١) (سورة ابراهيم:٢٠) .

ئـەوەی زۆر لەخـەڵکی زانیاریـان هەیـە بەڵام تێگەیشتنیان لاوازە ، تـەنها لەبـەر کردنـی قورئـان و سـوننەت بـەس نیـیە بەبێ تێگەیشتن، ئەنجامی تێنەگەیشتنە لەناو زۆر قەومدا هەڵە ڕوو دەدات کاتێك ئایـەتێك یـان فەرموودەیـەك ئەهێننـەوە بەبەڵگـە بـۆ ڕووداوێـك بـەبێ ئـەوەی مەبەسـتی پـەروەردگار یـان پێغەمبـەر (ﷺ) ئـــەوە بووبێـــت ، لەئـــەنجامی تێنەگەیشتندا ئەکەونە ناو گومڕایییەوە ، خاڵێـك کـە جێگـەی ئاگـادار کردنـەوەی هەموو لایەکە ئەوەیە : هەڵـە کـردن لـە تێگەیشـتندا ترسـناکی زۆر تـرە لەهەڵـە کـردن لــە نەزانینــدا ، لەبــەر ئــەوەی مرۆڤەکە هەڵە ئەکات بەهۆی نەزانینەوە ئـەزانیت نەزانـە و پێویسـتی بـەئاگادار کردنەوە و فێر بوونـە و هـەوڵی فێربـوون ئـەدات . بـەڵام ئـەو کەسـەی بەهەڵـە تێگەیشتووە لەناخی خۆیدا بیرو بـاوەڕی وایــە کــە شــارەزایە ، واش ئــەزانێ تێگەیشتنی ئەو ، مەبەستی خوایـە یـان مەبەستی پێغەمبەرە (ﷺ) .

بۆ نموونـە : کاتێـك دوو قاپـت لابێـت یەکێکیان ئاوی شلەتێنی تێدا بێت وئەوی تریان ئاوی سارد وەرزەکەشی زسـتانە ، پیاوێـك هـات و یسـتی خـۆی بشـوات ، هەندێ لە خـەڵکی پـێی ئـەڵێن : چـاکتر وایە ئاوە ساردەکە بـەکار بهێنـێ لەبـەر ئــەوەی بــەکارهێنانی ئــاوی ســارد نارەحەتی زیاترە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی:(( ألا أدُلُكُمْ على مـا يمحو الله به الخطايا ويرفع بــه الــدرجات قالوا: بلى يارسول الله ، قال إسباغ الضوءِ على المكــاره .... ))[٢٢] . پـێی ئـەڵێین مەبەسـتی پێغەمبـەر (ﷺ) بـەکارهێنانی ئاوی ساردە ، چونکە دەست نوێژ گـرتن بە ئاوی سـارد زیـاتر نارەحـەتت ئـەکات بۆیـە چـاکترە لـە ئـاوە گەرمەکـە . ئـەم پیــاوە (فــەتوای) داوە بــەوەی بــە کارهێنانی ئاوی سارد چاکترە، بەڵگەشی فەرموودەکە بوو .

ئایا ئێستا هەڵەکە لە زانیاریدایـە یـان لە تێگەیشتندا یە ؟!

ئاشکرایە هەڵە لە تێگەیشتندا یە !!

لەبــــەر ئــــەوەی پێغەمبــــەر (ﷺ) فـەرمووی (إسباغ الوضوء على المكــاره) واتە : تەواو کردنی دەست نوێژ لە کـاتی سەرمادا هەرچەند بۆ گرتنی دەست نوێژ نارەحەت بیت . نەیفەرموو : ئاوی سـارد هەڵبژێرە بۆ دەست نوێژگرتن .

بێگومان پـەروەردگارمان ئاسـانی بـۆ بەندەکانی ئەوێ نەك قورس کردن ؟

پەروەردگار دەفەرموێت:

[يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ][٢٣] .

(٢٢) أخرجه : مسلم (١/٢٥١) .

(٢٣) (سورة البقرة:١٨٥) .

هـــــــەروەها پـێغـەمبـــــــەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( إن الدِّين يُسْرٌ ))بەشێکە لەفەرموودەی إمامی بخاری ژمارە(٣٩) .

بەهەموو گەنجانی بانگەوازکار دەڵێم : پێویستی تێگەیشتن زۆر گرنگـە ، بۆیـە پێویســتە تــێ بگـــەین ئایـــا ویســـتی پەروەردگار بۆ بەندەکانی چـیە ؟ ئایا پەروەردگار دەیـەوێت بەنـدەکانی خـۆی تووشی نارەحەتی بکات بۆ بەجێ هێنانی پەرستشـی ، یـان پـەروەردگار ئاسـانی دەوێت بۆ بەندەکانی ؟

–گومـانی تێدانیـیـە پـەروەردگارمان ئاســانی ئـــەوێت بــۆ بەنـــدەکانی نـــەك قورسکردن .

## دەیەم:

## الحكمة : دانایی و کار بەجێیی

دانـــایی لـــە بانگـــەوازدا لـــە کـــارە گرنگەکانـە . دانـایی زۆر قورسـە لەسـەر ئـەو کەسـانەی کـە دانـایی یـان نیـیـە . بانگەواز کردن بـۆ دینـی خـوا بـە دانـایی ئـەبێت پاشـان بـە ئامۆژگـاری بـاش بـە گفتوگۆ بە جوانی بۆ غـەیری سـتەمکار ، پاشـــان بـــەکردەوە ســـتەمی ســـتەمکار دابمرکێنیتەوە ئەگەر لـە تواناتـدا هـەبوو هـــەروەها بەرژەوەنـــدی زیادتربێـــت لـــە خراپە .

کەواتـە قۆناغـەکانی بانگـەواز چـوارە بەبەڵگەی فەرموودەی پەروەردگار:

[ ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ] {سورة النحل:١٢٥}

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی:

[ وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ ] {سورة العنكبوت:٤٦}.

دانایی : واتە : بەوردی لە کاروبارەکە تێبگات و هەرشتە لـە شـوێنی گونجـاوی خۆیدا جێبەجێ بکات . لە دانـایی نیـیـە پەلەبکەیت و بتەوێت خەڵکی بگۆڕیت لەو بارو دۆخەی کە تێیدان بـۆ بـارو دۆخـی ڕۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ)، لەماوەی شـەو و ڕۆژێکـدا ، هەرکەسـێك ئابـەو شـێوەیە بیەوێت لـەو مـاوە کەمـەدا خـەڵکی چـاك ببن بەداخەوە ئەڵێم کەسێکی بێ ئەقڵە و دورە لە ژیرییەوە ، لەبەر ئەوەی کـاری بەو شێوەیە لەگەڵ دانایی پـەروەردگاردا ناگونجێت، بەڵگە بۆ ئەم قسـەیە ئەوەیـە ئـــەبینین پێغەمبـــەر (ﷺ) قورئـــانی بـــۆ هاتۆتـــەخوارەوە لای پەروەردگاریـــەوە ، جێبەجێ کردنـی داواکـاری پـەروەردگار پلە پلـە جێبـەجێ کـراوە تـا لەدڵەکانـدا جێگیر بووبە تەواوی .بۆ نموونە :–

**١**– نوێـــژ کـــردن لەشـــەوی (معـــراج) بەسێ ساڵ پێش کۆچ کـردن فـەرزبووە، لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەم شـێوەیەی ئێسـتا فەرز نەبوبوو ، یەکەمجار تەنها دووڕکات بـــوو لـــەنیوەڕۆ و عەصـــر و خـــەوتنان و بـــەیانی ، شـــێوان ســـێڕکات بـــوو لەبـــەر

ئـەوەی (وتـر) تـاكی ڕۆژە ، دوای كـۆچ كـردن بـۆ شـاری (مدینـة) و تێپـەڕبوونی (١٣) سـیانزە سـاڵ بانگـەواز لەشـاری (مكـە) دوای ئـەم پلـە برینـە ڕكـاتی نوێـژەكان زیـادكرا لـە كاتێكـدا كـە موسڵمان لە شاردایە نوێژی نیوەڕۆ بو بە چوار ڕكات ، عەصر بو بە چوار ڕكات و خـەوتنان بـو بـە چـوار ڕكـات ، نوێـژی بـەیانی مایـەوە وەكـو خـۆی دووڕكـات شێوانیش (٣) سێ ڕكات .

٢-زەكـات : لـە سـاڵی دووی كۆچـی لـە شاری (مەكە) فـەرزبوو ، بـەڵام چـەندێك فـەرزە و ماڵەكـە بگاتـە چـەند، دیـاری نەكرا، هـەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) كەسـی نەنارد بۆ كۆكردنەوەی زەكـات تـا سـاڵی (٩)ی كۆچـی ، قۆناغـەكانی فـەرزبوونی زەكات بەسێ قۆناغدا تێپەڕی :-

١- لـە شـاری (مكـە) خـوای گـەورە دەفەرموێت [وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِه ][24] . بـەڵام چەند واجبە دیاری نەكرا و خەڵكی ئـازاد بوون تێیدا .

٢- لە ساڵی (٢) كۆچی بڕی پێویست دیـاریكراو ماڵكـەش چـەندبێت و بگاتـە چەند دیاری كرا .

٣- لـە سـاڵی (٩) كۆچـی پێغەمبـەر (ﷺ) نوێنـەری دەوڵـەتی ئیسـلامی نـارد بۆلای خـاوەن ئـاژەڵ و جوتیارەكـان بـۆ وەرگرتنی زەكاتـەكانیان . جـوان بڕوانـە بارودۆخی خەڵكی وشێوەی هەڵسەكەوتی شەرعی خوای گەورە لەگەڵیاندا چـەندێك تەواو و بە بەزەییە .

٤- ڕۆژوو :ڕۆژو گرتن ئەمیش پلەپلە بـوو پلـەی یەكـەم خـەڵكی ئـازاد بـوون بـەڕۆژووبن یـان خـواردن ببەخشـن بـە خـەڵكی هـەژاریان، پاشـان لەپلـەی دووەمـدا ڕۆژوو دیـاری كـراو خـواردن بەخشـین مایـەوە بـۆ ئـەو كەسانەی كـە نـاتوانن بـەڕۆژووبن ، كەواتـە: بـە دڵنیاییـەوە ئـەڵێم دانـایی ڕێگـە نـادات جیهان بگۆڕێت لەماوەیەكی كەمدا. ئـەو حەقـەی لای برایەكتـە كـە ئـەمڕۆ وەری گرتـووە وەریگـرە و پلەپلـە لەگەڵیـدا هەنگاو بنێ تابەتـەواوی لـە خراپـەكاری دوری دەخەیتەوە ، بەیەك چاو سـەیری خەڵكی مەكە لە بانگەوازدا جیاوازی زۆرە لە نێوان كەسانێكی نەزان و نەشارەزا بە دینیئسلام لە گەڵ كەسانێكی یاخیدا. بۆ كەسـانێكی نـەزان پێویسـتە ئـەو پـەڕی نـەرمو نیـانی بـەكار بهێـنن لەگەڵیانـدا . والله زۆر دڵخۆشـم كـە ئـەبینم گـەنجێكی موسـڵمان بـە پەرۆشـە بـۆ ئیسـلام و بـەجۆش و خرۆشـەوە هـەوڵ ئـەدات خراپەكاری نەهێڵێت یان كـەمی بكاتـەوە وەیان ڕاستی بكاتـەوە وەیـان ڕاسـتیەك

(٢٤) (سورة الانعام:١٤١) .

بچەسپێنێ ، بەلام سوێند بەخوا پێم خۆشە لە کانگای دڵمەوە ئەو گەنجە (حکمة) دانایی بەکار بهێنێت بۆ هەر کارێك پێش ئەوەی دەستی بداتێ ، برای خۆشەویستم جێبەجێ کردنی شەرع بەگوێرەی شەریعەتی پەروەردگارت جێبەجێ بکە ، نەك بە هەوسی خۆت . گومانی تێدانییە پەرۆشی بۆ ئیسلام چاکترە لە دڵ مردن بەلام دانایی لە هەمووی چاکترە ، دڵی مردوو دڵێکە بەرامبەر ناشەرعییەکان هیچ هەستێکی نەبێت ، هەروەها دەربارەی چاکەکانیش هەر وابێت ، هەر کەسێك بەو شێوەیە بێت سوێند بەخوا ئەوە شەڕە ، بەهیچ شێوەیەك بێ هەڵوێستی ئابەو شێوەیە نا گونجێت لەگەڵ ڕەوشتی ئومەتی ئیسلامدا . لەبەر ئەوەی ئومەتی ئیسلامی فەرمان دەکات بە چاکە و خراپە قەدەغە دەکات ، وەبانگەوازی خەڵکی دەکات بۆ شوێن کەوتنی دینی خوا ، بەکار نەهێنانی دانایی خراپەیە ، بەلام بە ژیری بانگەواز کردن لەگەڵ ووشیاری دڵدا و جولانەوە بۆ حەق ئەوە خێر وچاکەیە .

داوا لە گەنجەکانمان دەکەم ئەوانەی بەپەرۆشن بۆ ئیسلام باپابەند بن بەدانایی و ژیرییەوە لەبانگەوازیاندا بۆ پەروەردگاریان . ئەمەش بەهەڵە تێنەگەن ناڵێم نەجولێن ، ناڵێم بانگەواز مەکەن ، ناڵێم واز لەخەڵکی بێنن ، خراپەکار باخراپەی خۆی بکات و گوێڕایەڵیش با گوێڕایەڵی خۆی بکات ، نەخێر واناڵێم ، بەڵکو ئەڵێم هێندەی لە تواناتاندا هەیە بەپێی ئامۆژگارییەکانی دینی خوای گەورە خراپە قەدەغەبکەن ، فەرمان بکەن بەچاکە ، بانگەوازتان با بەردەوام بێت ئەوەندەی لەتواناتاندا هەیە شەو ڕۆژ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: [اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ] {سورة آل عمران:٢٠٠}.

بۆ نموونە دەڵێم : ئایا کاتێك خراپەیەکمان بینی لەهەر کۆمەڵگایەکدا ، ئایا گونجاو ئەوەیە هێرش بکەینە سەر ئەو خراپەیە و بیشکێنین یان پارچە پارچەی بکەین یان بەتوندی و تیژی لەگەڵ بکەری خراپەکەدا قسەبکەین ؟ ئەمەچاکە یان گونجاو ئەوەیە بۆمان بەهێمنی و نەرم و نیانی قسەی لەگەڵ بکەین ئەگەر سوودی هەبوو پێویستی سەر شانمانە جێبەجێ کردووە ، ئەگەر ئامۆژگاری خێر سوودی نەبوو ئاگاداری کەسانێکی تر بکەین کەزیاتر توانایان هەیە بەو کارە هەڵبستن و بیگەێننە سەروتر تا بنەبڕ بکرێت بەیەکجاری . گومانی تێدانییە لای هەموو مرۆڤێکی

ژیر لەسەر خۆیەتی‌یە کە چاکترو بەسوود تـرە . لەبـەر ئـەوەی پـەروەردگارمان فەرموویەتی [ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ][٢٥] بـەلام ئەگەر هێرشمان بکردایەتـە سـەر بکـەری خراپە کاری‌یەکە و تیٚکوپیٚکمـان بدایـە ، چارەسەرەکە سوودی پیٚویستی نەدەبوو وەرزگارمان نەدەبوو لە ئـازار و ئەشبوو بە پەلەیەك بەسەر بانگەوازەکەماندا .

## پانزەیەم: التآلف والتواد و اقامة الزيارات والرحلات بين الشباب

پیٚکـەوە ژیـان و خۆشەویسـتی و دلسۆزی یەکتری و ریٚکخستنی سەردان و سەیران لەنیٚوان گەنجاندا .

پیٚویسـتە لەسـەرمان لـەناو ئـەم بانگـەوازە حەقـەدا لـە نـاو دینـی هەلبـژیٚراوی پەروەردگارمانـدا بەبرایەتی‌یەکی ئیمانداری پیٚکەوە بژین و یـەکترمان خـۆش بویٚت . لەبـەر ئـەوەی پەروەردگارمان فەرموویـەتی: [إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ][٢٦] . وە پیٚغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی :

(( وكونوا عباد الله إخوانـاً ))[٢٧] . مانـای ئـەم برایەتی‌یـە ئەوەیـە هـیچ موسـولمانیٚکمان دەسـت دریـٚژی نەکاتـە سەر هیچ برایەکی موسولمانی ، کەسمان ستەم لە کەسمان نەکەین ، هەول بـدەین ئوممەتمان یەك بیٚت . پاچە پارچە نەبین لەدینی خوای گەورەدا بەهۆی هەوەس و بۆچـوونی تـاك رەوی‌یـەوە . بـەگویٚرەی ئەمەی باسمان کـرد ، پیٚویسـتە سـەیری نـاکۆکی نیٚـوان هەنـدیٚ لـە گـەنجانمان بکەین ، لەو کیٚشەی کەوتۆتە نیٚوانیـان . لە راستیدا دینی ئیسلام فراوانە لە بواری تیٚکۆشـانی زانایانـدا لـە بەلگـە شەرعی‌یەکاندا بواری بۆ چوونی جیـاواز هەیـە ، بـەلام هەنـدیٚك لـە خـەلکی دەیانـەویٚت بەنـدەکانی پـەروەردگار مـل کەچ بکەن بۆ بۆچوونەکانی خۆیان بەتاك رەوی بە بیانوی ئەوەی ، ئەوەی کە ئەو دەیلیٚـت راسـتە و هیچـی تـر ، باپیٚچەوانەکەشـی راسـت بیٚـت گـویٚ بەقسەی نادات ، لەبەر ئەوەی مەبەستی سەرەکی ئەوەیە خـەلکی کۆبکاتـەوە لـە ژیٚـر بۆچـونی تایبـەتی خۆیـدا ، ئەگـەر خەلکی بەقسـەی نەکـەن ئـەوا بەهەلـە و گـومرا لـە قەلـەمیان دەدات ، ئـەم بـۆ چـوونەش پیٚچـەوانەی هەلسـوکەوتی (أصـحابەکانی) هاوەلـەکانی پیٚغەمبـەرە (ﷺ) لەگەل یەکتریدا .

دەلـیٚم ئەگـەر بـەجوانی سـەیری نوسـراوی زاناکـان بکـەین ئـەبینین بـۆ

---

(٢٥) (سورة التغابن:١٦).

(٢٦) (سورة الحجرات:١٠) .

(٢٧) أخرجه : البخاري (٦٠٦٥) ، ومسلم (٢٥٥٩) .

چونی جیاوازیان زۆره ، لەگەڵ ئەوەشدا پێکەوە ژیان و خۆشەویستی‌یان بۆیەکتری ئاشکرا کردووه و کەسیان ئەوی تریانی بە گومڕا لەقەڵەم نەداوه ، بەڵکو بە پێویستیان زانیوه لەسەر خۆیان و ئەوانەش کە بەئامۆژگاری‌یەکانیان هەڵسو کەوت دەکەن شوێن حەق بکەون لای هەرکەسێك بوو ، لەبەر خاتری یەکتری حەق نەشارنەوه و پشت گوێی نەخەن . پێویستە لەسەر هەموو گەنجێك قواتبی زانستی شەرعی ئامۆژگاری کەسانێك وەربگرن کە لەحەقەوه نزیکە ، عەزر بێنێتەوە بۆ بۆچوونی هاوتای ئەگەر جیاوازی‌یەکە بەگوێرەی بەڵگە بوو،دەڵێم هەموو کەسێك دەیەوێت و پێویستی دەکات لەسەر خەڵکی شوێنی بکەون لە هەموو شتێکدا ، ئەمەش داوا کردنی پلەی پێغەمبەرێتی‌یە (ﷺ) ئەگەر بەخۆیان بزانن ، ئەم بۆچوونەش زۆر هەڵەیه .

**ئایا داد پەروەرێتی‌یە تێ‌گەشتنی خۆت بکەیتە بەڵگە بەسەر غەیری خۆتەوه و تێگەیشتنی غەیری خۆت نەکەیتە بەڵگە بەسەر خۆتەوه ؟**

زۆر مرۆڤ هەیەدڵپیس ڕقاوی بەرامبەر بە ئیسلام ، دوژمنی ئیسلامە ، زۆر کەیف خۆش دەبێت کەئەو جیاوازی‌یە هەبێت لە نێوان گەنجەکانماندا ، هەوڵ دەدات ناکۆکی نێوانیان زیاد بکات بۆ بەرژەوەندی‌یە گڵاوەکانی خۆی . پەوەردگارمان فەرموویەتی:

[ وَلا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ][28] .

واته : ناکۆکی لەنێوان تاندا نەبێت چونکە سەرەنجام ترسنۆك دەبن و شکست دەهێنن وهێزتان نامێنێت ، هەوڵ بدەین هەمووممان ئەوەندەی لە تواناماندا هەبێت ناکۆکی‌یەکان نەهێڵین بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام ، ودڵنیاش بین چارەسەر هەیە ، بەڵام پێویستمان بەمەبەست پاکی هەیە لەگەڵ یەکتردا و هەموومان مل کەچێتی حەق بکەین ، هاندانی گەنجان بۆ ڕێکخستنی سەردان لەنێوان خۆیاندا تا خۆشەویستی و برایەتی‌یان پتەوبێت و پێکەوە ژیان لەگەڵ یەکتردا بە چاکی بەسەر بەرن ، لێکۆڵینەوە بکەن لەسەر بارو دۆخی خۆیان و نەتەوەکەیان . تاوەکو وەك یەك دڵ ویەك پیاو ویەك لاشەیان لێ‌دێت. ئەم جۆرە سەر دانانە بەرهەمی گەورەی دەبێت ئەگەر سەردانەکان سەیرانی دوور یان نزیکی لەگەڵدا ئەنجام بدرێت سوودی زۆری دەبێت بۆ گەنجان تا زیاتر لەنزیکەوە یەکتری بناسن ، پێویستە

(٢٨) (سورة الانفال:٤٦) .

لەسەر پەروەردەكار لە مامۆستايان و بەرێوە بەران هەڵسن بە بەشێكی زۆری ئەم سەردانە و ڕێنموونی پێویست بۆ قوتابیان بخەنە ڕوو بەوپەڕی دڵسۆزییەوە .

**دوانزەیەم: كسر الحواجز بين الداعية وبين الناس**

نەهێشتنی بەربەست لەنێوان بانگەوازكار و خەڵكیدا.

زۆرێك لەبرا بانگەوازكارانم كاتێك دەبینی گەلێك خراپەیەكیان تێدایە ، جۆش و خرۆشی بۆ ئیسلام ورق بوونەوەی لەو خراپەیە وای لێ دەكات نەچێت بۆلایان و ئامۆژگاریان ناكات ، ئەمەش هەڵەیە ، بەهیچ شێوەیەك كاری وا لەگەڵ ژیریدا ناگونجێت ، بەڵكو ژیری ئەوەیە بچیت بۆ لایان بانگیان بكەیت بۆ شوێن كەوتنی حەق ، هانیان بدەیت ، مژدەی خۆشی خوای گەورەیان پێڕابگەیەنی و بیان ترسێنی لە سزای خوای گەورە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو خراپەكارییە نەڵێیت ئەوانە خراپەكارن و ناگونجێت دابنیشم لە گەڵیان . جا ئەگەر تۆی بانگەواز كار ئامادەنەبیت لە گەڵیان دابنیشی و هاتوو چۆیان نەكەیت و بانگیان نەكەیت بۆ شوێن كەوتنی حەق كێ سەرپەرشتیان دەكات ؟! . ئایا كەسێك وەكو خۆیان سەرپەرشتیان دەكات ؟! یان كەسانێك دەبنە سەرۆك كاریان كە هیچ شارەزاییان نییە ؟! پێویستە لەسەر بانگەواز كار ئارامی لەخۆیدا دروست بكات ، ئەو بەربەستە نەهێڵێ لە نێوان خۆیی و خەڵكیدا ، تابتوانێت بانگەوازی حەق بخاتە پێش چاویان ، ئەو بانگەوازە حەقەی كە ئەوان زۆر پێویستیان پێیەتی باخۆشیان بێبەش بووبن لێی . بەلام ئەگەر بڵێت من پێویست نییە لەسەرم بچم بۆ لایان ، هەر كەسێك هات بانگەوازی دەكەم ، ئەگەر نەهات ، پەیوەندیم پێوە نییە .

ئەم كارە بەم شێوەیە پێچەوانەی شێوەی بانگەوازی پێغەمبەرە (ﷺ) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەكو ئاشكرایە هەركەسێك لە ژیانی شارەزابێت دەزانێت پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژەكانی حەج دا دەچووە ناو خەڵكی و بانگی دەكردن موسوڵمان بن بەبێئەوەی كەس ناچار بكات . دەچووە شوێنی هاوبەش پەیداكەرەكان و بانگەوازی دەكردن بەتەنها و بەحەق پەروەردگاری خۆیان بپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدا مەكەن .

لەو ڕۆژگارەدا داوای لێ دەكردن پەنای بدەن و بەرگری لێبكەن تا دینی خوای گەورە بگەیەنێت . لەبەرئەوەی هۆزی (قورەیش) قەدەغەیان كردبوو .

عن جابر (ﷺ) قـال كـان الـنبي (ﷺ) يعرض نفسه بالموقف ، فقال :

(( ألارجل يحملني الى قومه ، فإن قريشاً قد منعوني أن أبلغّ كلام ربي ؟! ))(٢٩).

جا ئەگـەر پێشـەوای خۆشەويسـتمان كاری بەردەوامی بەو شـێوەيە بووبێـت ، پێويستە لەسەر ئێمـەش بەچـاكی شـوێن كەوتەی ئەو بين .

## سيانزەيەم: إتساع صدور الشباب للخلاف بين العلماء

( سنگ فراوانـی گـەنجانمان بەرامبـەر بـە جيـاوازی نێـوان زانايـان) . پێويسـتە لەسـەر گـەنجانی بانگـەوازكار سـنگيان فـراوان بكـەن بەرامبـەر بـە ڕوودانـی جيـاوازی لـەنێوان زانايـانی سـوننیدا . ڕوبەڕوی جياوازیيەكان عذر بهێننەوە بۆ ئـەو زانايانـەی كـە بۆچـوونت وابێـت بەهەڵەداچـوون . ئەمـەش خـاڵێكی زۆر گرنگـە پێويسـتە هـەموو كاتێـك لەيادماندابێت . لەبـەر ئـەوە هەنـدێك لـە خـەڵكی دەگـەڕێت بەشـوێن هەڵـەی زانايـاندا تا هەڵوێسـتێكی ناشـياو ئـەنجام بـدات بەرامبـەريان ، نـاو بانگيـان لـەناو خەڵكيـدا دەشـێوێنێ . ئـەم كـارەش لەگـەورەترين هەڵەكانـە . جـا ئەگـەر باسـكردنی خـەڵكانێك زانـانين لەگوناهـە گـەورەكان بێـت ، بێگومـان باسـكردنی زانايـان گونـاهێكی زۆر گـەورەترە ، لەبەرئـەوەی باسـكردنی زانايـان بەشـێوەيەكی ناشـياو زيـانی تـەنها بـۆ خـودی زاناكـە نیيـە ، بـەڵكو زيـانی بـۆ زاناكـەو زانياريەكەشـی هەيـە كـە هـەڵی گرتووە ، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ئـەوەی كـە خـەڵكی گـوێ نـەگرن لـە ئامۆژگـاری زانايان و زانياريەكەيان بە چـاوی سـووك سەير بكرێت ، ئەمـەش زيـانی ترسـناكی هەيەو گوناهێكی گەورەيە ، پێويستە لـە سەر گەنجی موسـوڵمان جيـاوازی نێـوان زانايـان بەشـێوەيەكی ئاسـاييەوە وەربگرێت و عذر يان بـۆ بهێنێتـەوە لـەو شـتانەی كـە بەهەڵـەدا چـوون ، قەدەغەنیيـە بتوانيـت لەگـەڵ زانايـان خۆيـان قسـەبكەيت لـەو شـتانەدا كـە بەهەڵەيان دەزانيت ، تاڕوون بێتەوە ئايا ڕاسـتە بەهەڵـەدا چـوون يـان هەڵـە لـەو كەسـانەدايە كـەدەڵێن زانايـان بەهەڵەداچوون ، لەبـەر ئـەوەی زۆر جـار دەگونجێـت قسـەی زانايـەك بەهەڵـە بزانرێـت بـەڵام دوای وتوێـژی هـێمن دەردەكەوێت قسەكەی ڕاستە .

پێغەمبەريش (ﷺ) فەرموويەتی:

(٢٩) انظر : (صحيح ابن ماجة) (٢٠١) ، (صحيح سـنن الترمذي ) ( ٢٩٢٥/٣) .

(( كل ابن آدم خطاء وخير الخطـائين التوابون ))[٣٠].

واته : هەموو نـەوەی ئـادەم هەڵـەی زۆر دەکەن وە خێرترینیان ئەو کەسانەی کە هەڵەیان زۆرەو پەشـیمان دەبنـەوە و تەوبە دەکەن .

بەڵام دڵ خۆشـبوون بەهەڵخلیسـکانی زانایەك یان هەڵەیەکی بـۆ ئـەوەی بـڵاوی بکاتەوە لەنیوان خەڵکیدا تا پارچەپارچە ببن ، بەهیچ شێوەیەك ئەو ڕێگایە ڕێگای پێشـینی نیـیە . هــەروەها باسـکردنی کاربەدەسـتە موسـوڵمانەکان هەرچـەندە کــەم تەرخــەم بــن ، پێویســتە دادپــەروەربین لەگــەڵ زانایــان و کاربەدەســتە موســوڵمانەکاندا . ئایــا بۆخۆت پێـت خۆشـە خـەڵکی هەڵـەکانت باس بکەن ؟ بێگومان پێت خۆش نییە . کەواتە لەگەڵ خەڵکیشـدا بـاش بـە پێـت خـۆش نـەبێت باسـکردنی ناتــەواویان . چارەسەر ئەوەیە پەیوەندی پێوەبکەیت،

وتوێـژی لەگــەڵ ئـەنجام بـدەیت تـا بەچاکی لەیەکتری تێدەگـەن . زۆر مـرۆڤ هەیـە بـەهێمنی وتوێـژی لەگـەڵ کـراوە پەشـیمان بۆتــەوە و دانـی بەهەڵەکـەیدا نــاوە ، زۆریــش هــەبووە دوای وتوێــژ دەرکـەوتووە کـە بۆچـوونەکەی ڕاسـتەو حـەقی پێکـاوە ، ئەگـەر چـی خـەڵکیش بۆچوونەکەیان بەهەڵە زانیوە ، پێویستە موســوڵمان تەواوکــەری کــاری بــرای موســوڵمانی خــۆی بێــت ، هــەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(( المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً ))[٣١].

لە فەموودەیەکی تردا فەرموویەتی:

(( من أحب أن يزحــزح عــن النــار ويدخل الجنة فالتأته منيته وهو يؤمن بــالله واليوم الآخر وليأت الى الناس مايحــب ان يؤتى اليه ))[٣٢].

واتـە : هەرکەسـێك پـێی خۆشـە لـە دۆزەخ دوور بخرێتــــەوە و بخرێتــــە بەهەشتەوە بابەردەوام بێت لەسەر باوەڕ بـەخوا و ڕۆژی دوای وە باچـاکە بکـات لەگـەڵ خـەڵکیدا هـەروەکو چـۆن پـێی خۆشـە خـەڵکی چاکە بکـەن لەگەڵیـدا ، ئەوەمانای داد پەروەری و ڕاستییە .

## چواردەیەم : تقييد العاطفة والحماس بما يقتضيه الشرع الحنيف والعقل السليم

پابەندکردنی دڵسۆزیەکان بەو شێوەی کــە یاســای پــەروەردگار و ژیرێتــی پێویســتی دەکـات . پێویســتە لەســەر

(٣٠) أخرجه : الترمذي (٢٤٩٩) ، وابن ماجة (٤٢٥١) .

(٣١) أخرجه : البخاري (٦٠٢٦) ، ومسلم (٢٥٨٥) .

(٣٢) أخرجه : مسلم (١٨٤٤) .

بانگەوازکارانی حەق دڵسۆزىیان پاڵیان پێوە نەنێت دوریان بخاتەوە لە ژیرێتی و پابەند نەبوون بەیاسای پەروەردگارەوە. لەبەر ئەوەی دڵسۆزی ئەگەر پابەند نەکرێت بەشەرعەوە ، دڵسۆزیەکە دەبێتە گەردەلول ، زیانی زیاتر دەبێت لە سوودی بۆیە پێویستە زۆر دووربینی بکەین لەکاتی ئەنجامدانی هەر کارێکی شەرعیدا ، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت بێدەنگ بین لە ئاستی پوچەڵی ، یان پشتگیری پوچەڵەکان بکەین . ئامۆژگاری برا گەنجەکانمان دەکەین دووربینی بکەن و بەوپەڕی ژیرێتییەوە بانگەواز بکەن ، هەڵسووکەوتیان هەمووی پابەند بکەن بەشەرعەوە ، سەیربکەن دانایی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن بووە لە بانگەوازیدا بۆ خوا . لەگۆڕانی خراپەکارییەکاندا چۆن ئەنجامیداوە . تا بەجوانی شوێنی بکەوین و بیکەین بە پێشەوای خۆمان . خێرترین پێشەواش بۆ ئێمەی موسوڵمان رسول الله یە (ﷺ) .

برا موسوڵمانەکانم ئەگەر بمانەوێت ئومەتی ئیسلامی ووریا بکەینەوە لەوبێ ئاگاییەی کەتێیدا ئەژین ، پێویستە هەنگاونانمان لەسەر بنچینەیەکی داڕێژراو و نەگۆڕبێت ، لەبەر ئەوەی دەمانەوێت فەرمان ڕەوایی تەنها بۆ پەوەردگارمان بێت و دەمانەوێت دینی خوا جێگیربێت لەسەر زەوی پەروەردگار بەسەر بەندەکانی پەروەردگاردا ، ئەمەش مەبەستێکی زۆر گەورەیە ، بەڵام تەنها بەخواستی دەرونی نایەتە ئەنجام ، بۆیە پێویستە دڵسۆزیمان پابەند بکەین بە یاسای پەروەردگارەوە لەگەڵ ئەو پەڕی ژیرێتی لە ئەنجامدانیدا .

### پانزەیەم: الاتصال بولاة الامور

### ئاشنایی کردن لەگەڵ کاربەدەستاندا

کارێکی گونجاوە ئاشنابوونمان لەگەڵ کاربەدەستاندا و نزیکێتی لێیانەوە نەك بیرکردنەوە بە شێوەیەك ئەوان لە دۆڵێك و ئێمەش لە دۆڵێکی تر . لەبەر ئەوەی دوری ئەگەر هەبوو چارەسەر کردن ئاسان نابێت و بەباشی لەیەکتری تێ ناگەین، خۆمان پێناسەی خۆمان بکەین، نەك کاربەدەستان لە زوبانی ناحەزانمانەوە بمان ناسن ، شتێکی ئاشکراشە ناحەز هیچ کاتێك قسەیەك ناکات کەلەبەرژەوەندی خێرخوازان بێت.

نزیکی لە فەرمان ڕەواکان ئەگەر بۆ بانگەوازکردنیان بێت بۆ شوێن کەوتنی ئیسلام و ئامۆژگاری حەقیان بکرێت بۆ بەجێ هێنانی چاکەکان و قەدەغە کردنی خراپەکان ، ئەم جۆرە نزیك بونەوەیە کردەوەیەکی چاکە و هەرکەس بتوانێت

ئەنجامی بدات پاداشتێکی چاکی هەیە لای خوای گەورە . بەڵام ئەگەر بۆ ئەوە نزیك بێتەوە لێیان هانیان بدات بۆ بەجێ هێنانی کاری خراپە و خراپەیان بۆ برازێنێتەوە و بێ دەنگ بێت لەسەر کارە خراپەکانیان و ئامۆژگاری خێریان نەکات ئەوەندەی لە توانایدایە ، بێ گومان ئەو نزیکی‌یە کارێکی خراپە و سزای سەختی بۆ هەیە لای خوای گەورە .

— عن كعب بن عجرة ﷺ قال لي رسول الله (ﷺ) : (( أعيذك بالله ياكعب بن عجرة : من أُمراء يكونون من بعدي ، فمن غَشي أبوابهم ، فصَّدقهم في كذبهم ، وأعانهم على ظلمهم ، فليس منِّي ، ولست منه ، ولايرد عليَّ الحوض ، ومن غَشي أبوابهم أو لم يغش ، فلم يصدقهم في كذبهم و لم يعنهم على ظلمهم ، فهو منِّي وأنا منه وسيرد عليَّ الحوض، ........))[٣٣] .

واتە : خوای گەورە پەنات بدات ئەی کەعبی کوڕی عُجرة ، کردەوەی فەرمان ڕەوایانێ لە دوای من پەیدادەبن ، خوڕەوشتیان درۆ و ستەم کردنە ، هەر کەسێك نزیك بێتەوەلێیان درۆکانیان بەڕاست بخاتەوە ویارمەتی‌یان بدات لەسەر ستەم کردنیان (واتە : فەتوایان بۆ بدات لەسەر شەرعی‌یەتی کارە ناشەرعیەکانیان و پاساویان بۆ بهێنێتەوە و ناحەقیان بە حەق نیشان بدات لە پێناوی دەست کەوتنی چەند پلە و دینارێك ) ئەو کەسە لەمن نی‌یەو دوورە لەمنەوە و شوێن کەوتەی من نی‌یە ، وەمنیش لەو کەسە بەریم، نزیکیش نابێتەوە لە من لەسەر حەوزی (کوثر) . هەر کەسێکیش نزیك بێتەوە لێیان ، یان نزیك نەبێتەوە لێیان ، درۆکانیان بەڕاست نەزانێت ، وە یارمەتی‌یان نەدات لەسەر ستەم کردنیان، ئەوە لەمنەو منیش پەیوەندیم لەگەڵیدا ماوە ( بەمەرجێك بەکردەوەیەکی خراپی تر پەیوەندی‌یەکە نەبڕێت ) لەسەر حەوزی (کوثر)یش یەك دەگرینەوە .

— لەسەر چاوەی بیروباوەڕی سەلەفی صاڵحە گوێڕایەڵی کردنی فەرمان ڕەوای موسوڵمانەکان بەمەرجێك فەرمانیان بە تاوان نەبێت— هەر کاتێك فەرمانیان بە تاوان بوو گوێڕایەڵی کردنیان دروست نی‌یە ، بەبەڵگەی فەرموودەی صحیحی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی :

(( السمع والطاعة على المرء المسلم ، فيما أحب وكره ، ما لم يؤمر بمعصية ، فإذا أُمر بمعصية فلاسمع ولا طاعة ))[٣٤]. بەگوێ نەکردنی فەرمان ڕەواکان لە کاتێکدا کە

(٣٣) أخرجه : الترمذي (٦١٤) وهو حديث صحيح ، و(التعليق الرغيب) (٣/١٥-١٥٠) .

(٣٤) أخرجه : البخاري (٧١٤٤) .

فـەرمان دەكـەن بـە خراپـەكاری بـۆ كەسانێكە توانایـان هـەبێت ، لەهـەمووی گـرنگتر ئەوەیـە بـە شـێوەیەكی نهێنـی ئامۆژگاری فەرمان ڕەواكان بكەیت كاتێك كە پێچەوانەی شـەرعیان كـرد ، دروسـت نییە لەناو كۆڕو كۆمەڵی خەڵكدا باسـیان بكەیت یـان لەسـەر دوانگـەی مزگـەوت ، لەبەر ئەوەی ئاشوب زیاد دەكات .

شـێخ عبـدالعزیز بـن بـاز (ڕەحمـەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت : يقول رسـول الله (ﷺ): (( مَـن أراد أن يَنصـح لـذي سُلطان في أمر ، فلا يبده علانية ، ولكـن ليَأخذ بيده ، فيخلو به ، فإن قبل منه فذاك، وإلاّ كان قد أدى الذي عليه ))[٣٥] .

واتە : هەر كەسێك بیەوێت ئامۆژگاری خاوەن دەسەڵاتێك بكـات بـا بـە ئاشـكرا لـەناو خەڵكیـدا نـەبێت ، بـەڵكو دەسـتی بگرێت و بەنهێنی ئامۆژگارییەكەی بكات، ئەگەر فەرمان ڕەواكە ئامۆژگارییەكـەی وەرگـرت باشـە ، ئەگـەر ئامۆژگـاری یەكەشی وەرنـەگرت تـۆ پێویسـتی سـەر شانی خۆتت جێبەجێ كردووە .

لەبەرنامـەی (سـەلەف) نییـە نـاو زڕاندن و باس كردنـی ناتـەواوی فـەرمان ڕەواكان لەسـەر دوانگـە (منبر) ، لەبـەر ئـەوەی سـەر دەكێشـێت بـۆ ئـاژاوەو گوێڕایـەڵی نـەكردن لـە چاكەكانیشـدا ، بەڵام بەرنامەی پیادەكراو لای (سـەلەف) بریتییەلە : ئامۆژگاری فـەرمان ڕەواكـان بە شێوەیەكی شەرعی و بەنەرم و نیانی، نامە نوسین بۆیان یان پەیوەنـدی بكـەی بـەو زانایانـەوە كـە نـزیكن لـە فـەرمان ڕەواكـان تـا ڕێنمونیـان بكـەن بـۆ خێـرو چـاكە ، ئینكـاری كردنـی كـارە نەویستراوەكان باس بكرێت بەبێ ئەوەی باسی بكەرەكەی بكرێت فـەرمان ڕەوابـن یـان نـا ، ئینكـاری زینـا ، عـارەق خواردنەوە ، ڕیبا ، بكرێت بەبێئـەوەی باسی ئەو كەسانە بكرێت كە ئەم كارە نا شەرعییانە ئەنجام دەدەن[٣٦] .

**ئایا بانگەوازێك لەسەر ئەم بنچینانە بنیات نەنرێت سەركەوتوو دەبێت ؟**

هەر بانگەوازێك لەسەر ئەم بنچینانە نەڕوات و ڕاوەستاو نابێت لەسەر ڕێگـەی ئاشكرا و ڕوونی نێراوانی پەروەردگار بـە دڵنیاییەوە توشی نوشستی و پوكانـەوە دەبێت ، ماندوبونێكی بێ سود دەبێـت ، چـاكترین بەڵگـەش بـۆ ئـەم وەڵامـە بانگـەوازی هـەموو كۆمەڵـەكانی هاوچـەرخی ئەمڕۆیـە كـە هـەر كۆمـەڵێك نەخشـەی ڕێگەیـەكی بـۆ خـۆی كێشـاوە جیـاوازە لـە ڕێگـەی گروپەكـەی تـر

(٣٥) انظر : (السنة) لابن أبي عاصم رحمه الله (١١٣١) .

(٣٦) انظر : معاملة الحكـام في ضـوء الكتـاب والسـنة (ص/١١١) .

هەمووشیان ڕێگەکەیان جیاوازە لەگەڵ ڕێگەی ئاشکرای نێراوانی پەروەردگاردا ، ئەم گروپانە ئەمڕۆ کەمێکیان نەبێت بواری پاك کردنەوەی بیرو باوەڕیان پشت گوێ خستووە و بانگەوازیان بۆ چاك کردنی هەندێك کاری لاوەکی و کەم سوودە . کۆمەڵێك بانگەواز بۆ ئەوە دەکات چاکێتی بکرێت لە یاساو ڕامیاری و داخوازی جێبەجێ کردنی سنورەکانی پەروەردگار دەکەن هەروەها چەسپاندنی شەریعەت لەحوکم کردندا لە نێوان خەڵکیدا بە داد پەروەری ئەمەش داوا کارییەکی گرنگە بەڵام لەم داوا کارییە گرنگتر هەیە چۆن داوای جێبەجێ کردنی یاسای پەروەردگار دەکەن بەسەر دز و داوێن پیسدا پێش ئەوەی داوای جێبەجێ کردنی یاسای پەروەردگار بکەن بەسەر هاوبەش پەیداکەرەکاندا ، چۆن داوای چەسپاندنی شەریعەت دەکەن لە نێوان خاوەن کێشەکاندا لە کێشەی مەڕ و بزندا پێش ئەوەی داوای چەسپاندنی یاسای پەروەردگار بکەن بەسەر بت پەرست و گۆڕپەرستەکاندا هەروەها سزادانی لادەران لە ناو و صیفەتەکانی پەروەردگاردا ، ماناکەی دەگۆڕن بەهەوەسی خۆیان و مامۆستاکانیان .

ئایا ئەمانە تاوانیان ترسناکترە یان ئەوانەی کە دزی دەکەن یان داوێن پیسی دەکەن یان ئارەق دەخۆنەوە ؟! .

دزی و داوێن پیسی و ئارەق خواردنەوە خراپەکاری کردنە دەربارەی مافی مرۆڤەکان ، بەڵام هاوبەش پەیداکردن و گۆڕینی مانای ئایەتی ناو و صیفەتەکانی پەروەردگار خراپکردنە دەربارەی مافی خوا ، گومانی تێدانییە مافی پەروەردگار لە پێش مافی مرۆڤەکانەوەیە لای خاوەن باوەڕەڕاستەقینەکان .

زانای بەناوبانگ بەحەق (ابن تيمية) ڕەحمەتی خوای لەسەر فەرموویەتی:

(( فهذه الذنوب مع صحَّة التوحيد ، خير من فساد التوحيد مع عدم هذه الذنوب ))[٣٧] . بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە فەرموودەی پەروەردگارە:

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ﴾[٣٨]

بوونی ئەم گوناهانە (دزی ، ئارەق خواردنەوە ، داوێن پیسی) لەهەر کەسێکدا هەبێت لەگەڵ ئەوەشدا بیرو باوەڕی ڕاستی هەبێت خێرترێکە لە کەسێك کە بیر و باوەڕی خراپ بێت و لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گوناهانەی نەبێت .

(٣٧) انظر : (الاستقامة) لابن التيمية (٤٦٦/١) .

(٣٨) (سورة النساء:٤٨-١١٦) .

گروپێكی تر بەناوی بانگەواز كردن بۆ پەروەردگار، بەڵام ڕێگەی ئەمانیش پێچەوانەی ڕێگەی ئاشكرای نێراوانی خوایە ، هیچ بایەخێك نادات بە پاك كردنەوەی بیرو باوەڕ ، تەنها بایەخ بە بەشێكی خواپەرستی دەدەن وەكو یادی خوا كردن (ذكر)، بەڵام بە شێوەیەك ئەنجامی دەدەن پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) . هەروەها دەچنە دەرەوەی شار بۆ ماوەیەكی دیاری كراو بە هەوەسی خۆیان بە ناوی ڕێنموی خەڵكەوە بۆ دینی پەروەردگار هەوڵی سەرەكیان كۆكردنەوەی خەڵكیە بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە بیرو باوەڕیان هەرچییەك بێت ئەمانە هەر هەمووی بریتییە لەكۆمەڵە ڕێگەیەكی داهێنراو، لەوكاتەی دور كەوتونەتەوە لە ڕێگەی ئاشكراو ڕوونی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر)، ئەم ڕێگە داهێنراوانەیان زیاد كرد لە دینی ئیسلامدا ، ئەم جۆرە بانگەوازە وەكو ئەوە وایە چارەسەری لاشەیەك بكرێت بەبێ سەر. لەبەر ئەوەی بیرو باوەڕ لە ئیسلامدا وەكو سەر وایە لە لاشەدا ، خوازراو لەو كۆمەڵانە ئەوەیە بۆچون و تێگەیشتنیان ڕاست بكەنەوە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا تا بە چاكی لە ڕێگەی ڕاستی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر) تێ بگەن كە چۆن بانگەوازیان كردووە . پەروەردگارمان ئاگاداری كردوین كە فەرمان ڕەوایی كردن و توانایی كە تەوەرەی سەرەكی بانگەوازی كەمێك لەم گروپانەیە نایەتە جێ تەنها بەڕاست كردنەوەی بیرو باوەڕ نەبێت ، بەوەی پەرستنیان بەتەنها و بە حەق بۆ (الله) بێت هیچ دروست كراوێكی پەروەردگار نەكەن بە هاوبەشی خوای گەورە لە پەرستندا، بەڵگەشمان بۆ ئەم حەقیقەتە :

پەروەردگار فەرموویەتی: [ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ](٣٩) .

مانای ئایەتەكە :

خوای گەورە بەڵێنی داوە بەكەسانێ لەئێوە كە بڕوایان هێناوە وكاری شیاو وچاكیان كردووە ، كە بیان كاتە جێ نشینی خەڵكی لەسەر ڕووی زەویدا هەروەكو ئەو كەسانەی پێشوو كە كردیە جێنشینی خەڵكی تر ، وەدین و ئاینێ كە بۆی پەسەند كردوون ڕیشەدار بۆیان ڕادەگرێ و مەترسیان بۆ دەكاتە ئارامی و هێمنی، بە جۆرێ كە تەنیا من

(٣٩) (سورة النور:٥٥) .

بپەرستن و هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشم ، وەهەر كەسێ دوای ئەم بەخشینە بێ باوەڕ بێ لەدین دەرچووە .

ئەوان دەیانەوێت وڵاتێكی ئیسلامی سەربەخۆ دروست بكەن پێش ئەوەی سەر زەوی پاك بكەرێتەوە لە بیرو باوەڕی پوچەڵ كە هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ بیرو باوەڕی بت پەرستەكانی پێش ئیسلام .

بە دڵنیاییەوە دەڵێم :-فەرمان ڕەوایی شەریعەتی ئیسلام و چەسپاندنی سنووری پەروەردگارو دروست كردنی وڵاتێكی ئیسلامی سەربەخۆو نەهێشتنی هەموو قەدەغەكراوەكان و بەجێهێنانی هەموو (واجبەكان) پێویستییەكان ، ئەمانە هەر هەمووی لەمافەكانی بەتەنها خوا پەرستییە و تەواو كەری خواپەرستییە، جاچۆن بایەخ بە تەواو كەرەكان بدرێت و بنچینەی سەرەكی پشت گوێ بخرێت .

نەزانین وبێ ئاگایی ئەو گروپانە لەڕێگەی ئاشكرای پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر) لە بانگەوازدا وای لێكردوون ئەو هەموو جیاوازییە ببێت لەناو بانگەوازیاندا . جا كەسێكیش نەزان بێت بەكەڵكی ئەوە نایەت بانگەواز بكات ، لەبەر ئەوەی مەرجی سەرەكی بۆ بانگەوازكردن زانیارییە . بوونی جیاوازییەكی زۆریش لە بانگەوازیاندا بەڵگەیەكی ڕاست و ئاشكرایە كە بانگەوازیان پێچەوانەی بانگەوازی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەو بانگەوازانەش بەو هەموو جیاوازییەوە ترسناكی زۆری هەیە دەربارەی خودی ئیسلامەكە ، لەبەر ئەوەی دەبێتە كۆسپێك لە ڕێگەی ئەو كەسانەدا كە دەیانەوێت ڕووەو ئیسلام هەنگاو بنێن بۆیە پێویستە بەڕوون و ئاشكرا بڵێین ئەو هەموو جیاوازییە ئیسلام نییە و پێغەمبەریش (ﷺ) پێی ڕازی نابێت . پەروەردگار فەرموویەتی:

[ إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ][40] .

مانای ئایەتەكە : - بەڕاستی ئەوانەی كە ئایینەكەی خۆیان بەش بەش كردووە بوون بە چەند دەستە و تاقمێك وەهەر دەستەو تاقمێك شوێنی پێشەوایەكی خۆی كەوت و دەستی گرت بەبەش وپارچەیەك لە ئاینەكەی خۆی ، تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دوور و بەریت لەوان وهیچ پەیوەندیت پێیانەوە نییە..

ئیسلام بانگەوازی بۆ كۆبوونەوەیە لەسەر حەق هەروەكو پەروەردگار فەرموویەتی [أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ][41] .

---

(٤٠) (سورة الانعام:١٥٩) .

مانــای ئایەتەكــە : ئەودینــە بەڕاســتی بــەجێ بێــنن و جیــاوازی تێدانەكــەن . وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:
[ وَاعْتَصِـمُوا بِحَبْـلِ اللَّـهِ جَمِيعـاً وَلاَ تَفَرَّقُـوا ][42] .
مانــای ئایەتەكــە :- وەهــەموو دەســت بگرن بەدینی خواوە و لێك جیامەبنەوە .

وباالله التوفيق

بڕوانە:

١. مقدمة (منهج الانبياء في الدعوة الى الله فيــه الحكمــة والعقــل ) / تــاليف : فضــيلة الدكتور / ربيع بن هادي المدخلي وفقه الله .

٢. الصحوة الاسلامية ضوابط و توجيهات / تاليف : فضـيلة الشـيخ محمـد بـن صـالح العثيمين رحمه الله .

٣. معاملــة الحكــام في ضــوء الكتــاب والسنة / تــاليف : الـدكتور عبـد السـلام بـن برجس العبد الكريم -وفقه الله -.



(٤١) (سورة الشورى:١٣) .

(٤٢) (سورة آل عمران:١٠٣) .

# نیشانەکانی مونافیق

## (علامات المنافق)

مامۆستا محمد ملا فایق شهرزوری

بەشی دووەم

## نیشانەی یەکەم

### درۆ کردن

درۆ کردن بریتییە لە جیاوازی ناخ لەگەڵ رووکەش دا وە جیاوازی گوفتار لەگەڵ کرداردا ، (منافق) دووڕوو درۆ کارە لەم بوارانەدا :

**أ**. درۆ دەکەن لەگەڵ بڕواداراندا : دوڕوو لای بڕواداران خۆی وادەردەخات بە گفتار و کردار کە ئەویش بڕوادارە بەخواو ڕۆژی کۆتایی ، خوای گەورەش ئەوان بە درۆ دەخاتەوە و دەفەرموێت:

[ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ ][1] .

ئیمامی طەبەری دەفەرموێت :

{ زانایانی تەفسیر و لێکدانەوەی قورئان کۆن لەسەر ئەوەی ، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە سەبارەت بە هەندێ لە دووڕووەکان دابەزیوە ، وەئەو نیشانەو تایبەتمەندیە تایبەتە بەوانەوە ، وەخوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە (منافق) دووڕوو ئەم بانگەشەیەی لە پێش چاوی بڕواداراندا دەردەخات }[2]، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

[ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ ][3] .

**ب**. درۆدەکەن لەگەڵ کاربەدەستە بڕوادارە داد پەروەرەکاندا : دووڕوو لەپێش چاوی کاربەدەستی بڕواداردا مل کەچی و گوێ ڕایەڵی خۆی نیشان دەدات ، وەمل کەچ نەکردنی خۆی لای برا دووڕووەکانی خۆی دەردەخات ، خوای گەورە دەفەرموێت:

[ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِنْدِكَ بَيَّتَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ ] (سورة النساء:٨١).

سەبارەت بە لێکدانەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئیمامی طەبەری دەفەرموێت:

---

(١) (سورة البقرة:٨)

(٢) انظر : (جامع البيان) (١/١١٦) ، (١/١٢٩) .

(٣) (سورة البقرة:١٤) .

{خـواى گـەورە بـە پێغەمبەرەكـەى دەفـەرموێت : ئـەى محمـد (ﷺ) گـوێ مەدەو ڕوو وەرچەرخێنە لەو دووڕووانەى كە دێن و پێت دەڵێن : گوێ ڕايـەڵتين و فـەرمانت بەجىَيــە ، وكاتێــك لێــت جيادەبنـەوە سـەر پێچـى فەرمانەكـەت دەكـەن و دەى گـۆڕن و ئەوكارانـەى كەلێت قەدەغەكردوون ئـەنجامى دەدەن ، لێيان گەڕێ لە خۆيان و ئەو گومڕايـەى كەلەسـەرين ، پشـت بـە خـواى خـۆت ببەسـتە و خـواى گـەورە تۆڵـەيان لێ دەكاتـەوە }[٤] . ئـەم گوێڕايـەڵى كردنـە هـەر چـەندە تايبـەت و سـەبارەت بـە پێغەمبـەر (ﷺ) دابـەزيوە بـەڵام هـەموو كاربەدەسـتێكى بـڕوادارى دادپـەروەر دەگرێتـەوە ، وەك زانايـان دەفـەرموون **(العبرة بعموم اللفظ لابخصوص السبب)** واتـە : گـەر باسـەكە بـە ووشـەى گشـتى باس كرابوو ئەوە گشتى دەگەيەنێت گەر لەبەر هۆيەكى تايبـەتيش دابـەزى بێـت ، وەلەلايـەكى تـرەوە گوێڕايـەڵى كردنـى كاربەدەستێكى بڕوادار گوێڕايەڵى كردنـە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەك لەفەرموودەيەكى صەحيحدا هـاتووە (( ... ومن يُطِع الأمير فقد أطاعني ، ومن عصـى الأمـير فقـد عصـاني))[٥]-وقـد ورد بلفـظ آخـر (٧١٣٧): (( ..... من اطاع أميري فقـد أطاعني ومن عصى أميري فقد عصاني )).

واتــە : هــەر كەســێك گوێڕايــەڵى (ئـەمير)ەكـەى بكـات ئـەوە بەڕاسـتى گوێڕايەڵى منى كردووە ، وەهەر كەسێك سەرپێچـى بكـات ئـەوە بەڕاسـتى سەرپێچـى منـى كـردووە ، ديـارە ئـەو ئەميرەش دەبێت لە بڕواداران بێت ، وەك خواى گەورە دەفەرموێت :

[ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ ][٦] .

**ج**. درۆ دەكـەن لـە سـوێندەكانياندا : دووڕووو زۆر سـوێند خـۆرە و لـە هـەموو شتێكدا درۆ دەكات ، وە سوێندەكانيشى لەسەر درۆيە و خۆشى باش دەزانێت كـە درۆيە ، وەك خواى گەورە دەفەرموێت:

[ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ][٧] .

ئيبن و كـەثير سـەبارەت بـەم ئايەتـە دەفـەرموێت :{ خـواى گـەورە لـەم ئايەتەدا مەبەستى لە دووڕووەكانە ، كـە سـوێند لەسـەر درۆ دەخـۆن و خۆشـيان دەزانن كە درۆ دەكەن لە سـوێنەكانياندا ، بۆيـە خـواى گـەورە شـايەتىداوە كـە ئەوان درۆ دەكـەن لـە هـەموو شـايەتى و سوێندەكانياندا }[٨].

(٤) انظر : (جامع البيان) (١٧٨/٤)

(٥) اخرجه : البخاري (٢٩٥٧) ، .

(٦) (سورة النساء:٥٩) .

(٧) (سورة المجادلة:١٤) .

(٨) انظر : (تفسير القران العظيم) (١٣٠/٦) .

**ﻫ**. درۆ دەکەن لە گفت و بەڵێنەکانیاندا: بێگومان درۆکردن لە بەڵێندا و جێبەجێ نەکردنی نیشانەیەکی سەرەکی دووڕووەکانە ئەم باسەش بەوردی لەسەری دەڕۆین لەباس کردنی {نیشانەکانی دووڕووکان لە سونەتدا} بەڵام ئەوەی لێرەدا جێی مەبەستە ئایەتە پیرۆزەکەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت:

[ وَمِنْهُم مَّنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِن فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ * فَلَمَّا آتَاهُم مِّن فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ * فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ][9].

ئیبن و کەثیر سەبارەت بەمانای ئەم ئایەتە دەفەرموێت {هەندێك لە دووڕووەکان گفت و بەڵێنیان داوە بە خوای گەورە ، ئەگەر دەوڵەمەندیان بکات ، دەبن بە پیاو چاك و چاکە دەکەن ، بەڵام ئەوان نەبەڵێنی خۆیان جێبەجێ کرد ، وە ڕاستیشیان نەکرد لەبەڵێنەکەیاندا ..... خوای گەورەش دووڕووی خستە دڵیانەوە لەسەر ئەم کارەیان}[10] ، بۆیە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) دەفەرموێت: (( ثلاثٌ إذا كُنَّ في العبدِ فلا تتحرّج أن تَشهد عليه أنَّه منافق : إذا حدّثَ كذبَ ، وإذا وَعَدَ أخلَفَ ، وإذا أؤتُمِنَ خان ......))[11] ، واتە : سێ شت لە هەر کەسێکدا کۆ بوبوەوە ، سڵ نەکەیتەوە لەوەی کە شایەتی لەسەر بدەیت کە دووڕووە : گەر قسەی کرد درۆ بکات ، وگەر بەڵێنی دا نەهێنێتە دی ، وگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ناپاکی تیا بکات . وەهەروەها ئەبوو ئومامە (رضي الله عنه) دەفەرموێت { المنافق إذا حدّثَ كذبَ ، وإذا وَعَدَ أخلَفَ ، وإذا أؤتُمِنَ خان .... فمن كُنَّ فيه ، ففيه النفاق كله ، ومن كان فيه بَعضُهُنَّ ففيه بَعضُ النفاقِ }[12] ، واتە : دووڕوو کە قسەبکات درۆ دەکات وگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر ، و گەر سپاردەیەکیان پێ سپارد سپێردرا ناپاکی تیادەکات ..... هەر کەسێك ئەمانەی تیابێت هەموو دووڕووی تێدایە ، وە ئەگەر هەندێکی تێدابێت ئەوا هەندێ لە دووڕوویی تێدایە .

**ﻫ**. درۆ دەکەن لەگەڵ هەمووانـدا : دووڕوو تەنها درۆ لەگەڵ موسڵمانانـدا ناکات بەڵکو درۆ لەگەڵ جولەکەو گاور و بت پەرست و هەموو کەسانی تردا دەکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

(٩) (سورة التوبة:٧٥-٧٧)

(١٠) انظر : (تفسير القران العظيم) (١٣٤/٣) .

(١١)الفريابي برقم (١٥) وقال محققه : اسناده صالح .

(١٢) اخرجه : الفريابي في (صفة النفاق) برقم (١٨) وقال محققه : اسناده صحيح .

[ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ](١٣)

خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەپیرۆزەی سەبارەت بـە عەبـدولای کـوڕی ئوبـەی و دووڕووەکـانی تـر دابەزانـد، کاتێـك کـە پـەیمانیان دا بە جولەکەکانی بەنو نەضیر کـە پشـتگیریان بکـەن و لـە ڕیزیانـدا بجەنگێن دژبـە موسـوڵمانەکان وەئەگـەر دەرکران ئـەوانیش لەگەڵیانـدا دەربچـن ، بەڵام ئەوەبوو درۆیـان لەگـەڵ ئەوانیشـدا کردو نەجەنگان و دەر نەچـوون و خـوای گـەورەش ئـەم درۆ ونهێنیـەیانی ئاشـکرا کرد لەم سورەتە پیرۆزەدا(١٤) ، کەوا بوو سەرتاسەری

نیشانەکانی (منافق) سەرچـاوەی لـە درۆوە هەڵگرتووە :

١–حەسـەنی بەصـری دەفـەرموێت : (الكذب جماع النفاق)(١٥)

واتە : درۆ کردن کۆ کەرەوەی هەموو دووڕوویە .

٢– عامر ئەل شیعەبی دەفەرموێت: (من كذبَ فهو منـافق)(١٦) واتـە: هـەر کەسێك درۆ بکات ئەوە دووڕووە .

٣–قـەتادە دەفـەرموێت : (إيّـاكم والكـذبْ فإنّـه بـابُ النفـاق)(١٧) واتـە : دوورکەونەوە لەدرۆ کـردن چـونکە ئـەوە دەرگاو سەرچاوەی هەموو دووڕوویەکە

٤–ئـیبن و قـەیم دەفـەرموێت : (الكـذبُ مفتاح النفاق)(١٨) واتە : درۆ کردن کلیلی دووڕوویە .

## نیشانەی دووەم

### فێڵ کردن لە بڕواداران

دووڕوو سەرجەم کارەکانی فێڵ کردنە، چونکە بەرجەستەکردنی دوو کەسـایەتی جیاوازە لەیەك مرۆڤدا و لـە یـەك کاتـدا ، دووڕووە بـە خـەیاڵی خـاوی خـۆی دەتوانێت فێڵ لە گەڵ خـوای گەورەشـدا بکات ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ ](١٩) .

قورتوبی دەفەرموێت{واتە بەگومان و خەیاڵی خـاوی خۆیـان فێڵیـان لـە خـوای گەورە کردووە ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان فێڵیـان لـە خۆیـان کـردووە ، ئەمـەش بەڵگەیـە کـە دووڕووەکـان خوایـان نـە ناسیوە ، گەر بیان ناسیایە دەیان زانی

(١٣) (سورة الحشر:١١) .
(١٤) (سيرة ابن هشام) (٦٨٩) .
(١٥)ابن ابي الدنيا (٥١٤)، احمد (٢٧٨) بسند رجاله ثقات.
(١٦) اخرجه : الفريابي في (صفة النفاق) (٢٠) وقال محققه : اسناده صحيح.
(١٧)عبد بن حميد وابن جرير–كما في (فتح القدير)(١/٥٩).
(١٨) انظر : (مختصر حادي الارواح) (ص/٥٩) .
(١٩) (سورة النساء:١٤٢) .

کە خوای گەورە فێڵی لێ ناکرێت }[٢٠]

شەوکانی دەفەرموێت { مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە : دووڕووەکان بە گومانی خۆیان فێڵیان لە خوای گەورە کردوە بەوەی ئیسلامەتی خۆیان ئاشکرا کردووە وبێ باوەڕی‌یەکەیان شاردۆتەوە، بەڵام خوای گەورە فێڵی لێ کردوون بەوەی کە بنەماکانی ئیسلامی بە سەردا چەسپاندوون بێ ئەوەی هیچ پەیوەندیەکیان بە ئیسلامەوە هەبێت}[٢١] ، هاوەڵی بەڕێز ئەبوو ئومامە (رضي الله عنه) دەفەرموێت {مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە لەسەر پردی (الصراط) دا ڕووناکی دەدرێت بە بڕواداران و نادرێت بە بێ باوەڕان و دووڕووەکان ، ئەوان دەیانەوێت کەڵك لە ڕووناکی بڕوادارەکان وەربگرن بەڵام بێ سوود دەبێت ، وبڕواداران پێیان دەڵێن : بگەڕێنەوە دواوە و ڕووناکی بۆ خۆتان پەیدا بکەن ، کاتێك دەگەڕێنەوە دەبینن کە شورایەك لە نێوانیاندا هەیە و ئەمەش فێڵە کە خوای گەورە لە دووڕووەکانی کردووە}[٢٢] ،وە سەبارەت بە فێڵ کردنیان لە گەڵ بڕوادارانـدا خوای گەورەدەفەرموێت:

[ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ] [٢٣] .

إمامی طەبەری دەفەرموێت: فێڵ کردنی دووڕووەکان لەگەڵ بڕوا داراندا ئەوەیە ، دووڕووو بەزمانی ئیسلام بەڕاست دەزانێ ، و لە دڵیدا گومانی لێیەتی و بەدرۆی دەزانێ بۆ ئەوەی خۆی دوور بخاتەوە لە سزا و کوشتن }[٢٤] .

# نیشانەی سێیەم

## خراپە بەرپا کردن لە زەویدا بەناوی چاك سازی کردن

خراپە بەرپا دەکەن لەهەر جێگەیەکدا بن ، وەئەگەر داوای دەست هەڵگرتنیان لێ بکرێت لەم کارە چەپەڵەیان ئەوان لە وەڵامدا دەڵێن : ئێمە چاك سازی و چاکە کردن بەرپا دەکەین ، بەڵام لە ڕاستیدا هەمووکارەکانیان تێکدەری و خراپە بەرپاکردنە ، سەبارەت بەوان خوای گەورە دەفەرموێت:

[ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ * أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لَّا يَشْعُرُونَ ] [٢٥]

سەبارەت بە لێکدانەوەی مانای خراپە بەرپاکردن لەم ئایەتە پیرۆزەدا تەفسیر ناسان دەفەرموون :

(٢٠) انظر : (جامع لأحكام القران) (١٩٥/١) .

(٢١) انظر : (فتح القدير) (٥٧٠/١) .

(٢٢) (الحاكم) (٤٠٠/٢) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

(سورة البقرة:٩)

(٢٤) (جامع البيان) (١١٨/١) (فتح القدير) (٥٥/١)

(٢٥) (سورة البقرة:١١-١٢)

١–ئيمـامی قورتـوبی دەفـەرموێت:
{واتە : پێیان وترا خراپە بەرپا مەکەن کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بێ باوەڕی، و دوورخستنەوەی خەڵکی لە باوەڕ هێنان بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوان دەس لە کاری خراپەی خۆیان هەڵناگرن }[٢٦] .

٢–ئیمامی طەبەری گێڕاویەتەوە لە ئیبن و مەسعودەوە کە فەرموویەتی:
{ئەم ئایەتە مەبەستی لەدووڕووەکانە ، و خراپە بەرپا کردنیش بریتییە لە بێ باوەڕی و ئەنجام دانی تاوان }[٢٧] .

٣–ئیمامی شەوکانی دەفەرموێت:
{مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کەدەفەرموێت : خراپەکاری ئەنجام مەدەن لە زەویدا بە بڵاوکردنەوەی دووڕووی و لایەن گری کردنی بێ بڕوایان و دوور خستنەوەی خەڵکی لە باوەڕهێنان بە پێغەمبەر (ﷺ) }[٢٨] .

٤–ئیمامی ڕازی سەبارەت بە لێکدانەوەی [هُمُ المُفسِدُونَ] دەفەرموێت:
{ دووڕووەکان خراپەکاران ، چونکە بێ بڕوای خراپەو تێکدانە لە زەویدا و پێ نەزانینە بۆ نیعمەتەکانی خوای گەورە ، و پەلکێشکردنی خەڵکیە بۆ هەموو کارێك کە خۆیان پێیان خۆش بێت ..... ئالەمەوە دەردەکەوێت کە دووڕووی خراپەکارییە }[٢٩] .

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە دووڕووەکان خراپەکاریەکانیان تەنها بڕواداران ناگرێتەوە بەڵکو ئاژەڵ و دانەوێڵەکانیش دەگرێتەوە کەوابوو دووڕوو زیانی بۆ هەموو شتێك هەیە ، خوای گەورە دەفەرموێت:
[ وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ ][٣٠] .

ئیمامی سەدی دەفەرموێت { ئەم ئایەتە سەبارەت بە ئەخنەسی کوڕی شورەیف دابەزی کە خۆی گەیاندە مەدینە و ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند ، ئنجا لە گەڕانەوەیدا تێپەڕی بەلای هەندێك ئاژەڵ و کشتوکاڵی موسوڵماناندا ، ئاژەڵەکانی کوشت و کشت وکاڵەکەی سوتاند }[٣١] .

ئیمامی طەبەری دەفەرموێت { ماناکەی ئەوەیە: ئەی محمد (ﷺ) کاتێك ئەو دووڕووە لای تۆ دەردەچێت بەتوڕەییەوە خراپە بەرپا دەکات لەزەویدا و ئەوەی خوا قەدەغەی کردووە ئەنجامی دەدات وتاوانی ڕێگریو ڕێگە تێکدان لە خەڵکی ئەنجام دەدات }[٣٢] .

(٢٦) انظر : (تفسير القرطبي) (١/٢٠٢) .
(٢٧) انظر : (جامع البيان) (١/١٢٥) .
(٢٨) انظر : (فتح القدير) (١/٥٩) .
(٢٩) (تفسير الكبير) (٢/٧٤) . (٢٩) (سوة البقرة:٢٠٥) .
(٣١) انظر : (جامع البيان) (٢/٤٢٥) برقم (٣١٤٠) .
(٣٢) انظر : (جامع البيان) (٢/٤٣١) .

وەهەروەها خـوای گـەورە سـەبارەت بـە خراپکاری دووڕووەکان دەفەرموێت:
[ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا ][٣٣] .

ائیمامی شەوکانی دەفەرموێت{ واتە: ئەوان درێغی ناکەن لە ئەنجام دانـی هـەر کارێك کە زەرەر مەندبێت بۆ ئێوە }[٣٤]

٢-قورطـوبیش دەفـەرموێت { واتـە : درێغـی ناکـەن لـە خراپـە بـەرپاکردن و دووڕووی و بڵاو کردنەوەی پڕوپاگەندەی خراپ ونێوان تێکدانتان }[٣٥] .

٣-ئیبن و کەثیر دەفەرموێت { واتە : هــەوڵ دەدەن بــە هــەمووجۆرێك کـە دژایـەتیتان بکـەن بـەوەی لـە توانایانـدا هەیە لە فرتو فێڵ و تەڵەکەبازی }[٣٦] .

کەوابوو بەڕاستی دەتـوانین بڵـێین کـە دووڕووی یەکسانە بە بەرپاکردنی خراپـە بۆیە ئیمامی زەجاج دەفەرموێت { النفاق یــؤدي الی تفریـــق الکلمـــة ووقـــوع القتال}[٣٧]. واتە : دووڕووی دەبێتە هۆی بــــەرپاکردنی دووبەرەکایـــــەتی و هەڵگیرساندنی شەڕ ، وەئیمامی طەبەری دەفەرموێت { نیشانەی کەسـانی دووڕوو ئەوەیە کەخراپە بەرپا دەکەن لە زەویداو سەرپێچی خوای گەورە دەکەن و تاوان و کاری نابەجێ ئەنجام دەدەن و فەرزەکان وون دەکەن و گومانی خراپ بەرپادەکەن لە ئاینی خوادا و پشـتگیری کەسـانی بـە درۆخەرەوەی خوای گەورە و کتێبەکانی و نێرراوەکـانی دەکـەن نـین و دژایـەتی پیاوچاکانی خوای گەورە دەکەن }[٣٨] .

## چوارەم نیشانە

### گاڵتە جاڕی کردن بە بڕواداران

یەکێکی تر لە نیشـانەکانی دووڕوو گاڵتـە جاڕیکردنـە بـە بـڕواداران ، گاڵتـە جـاڕی کردنی دووڕووەکانیش بەم جۆرەیە :

**أ**. گاڵتە جـاڕی کـردن بـە بـڕواداران و بەنـــــەفام و گێــــل زانینیـــــان : دووڕوو ئاین و باوەڕ بەشـتێکی نەفامانـە دەزانێت ، خوای گەورە دەفەرموێت:
[ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ ][٣٩] .

واتە : دووڕوو ئەگەر داوای بڕواهێنانی لێ کرا لە وەڵامدا دەڵێت ئایا بڕوایەکمان هەبێت کە وەك بڕوای گێـل و نەفامـەکان بێـت ، لـە ڕاسـتیدا ئـەوان بـێ هۆشـن و نـەزانن ، بـێ گومـان دووڕووەکـان ئـەم وتـــەیان لـــە پـــێش چـــاوی بـــڕواداران دەرناخەن و دەی شارنەوە.

(٣٣) (سورة آل عمران:١١٨) .
(٣٤) انظر : (فتح القدير) (٥٥٩/٨) .
(٣٥) انظر : (تفسير القرطبي) (١٥٦/٨) .
(٣٦) انظر : (تفسير القران العظيم) (٥٦٤/١) .
(٣٧) انظر: (فتح القدير) (٥٩/١) .
(٣٨) انظر : (جامع البيان) (١٢٦/١) .
(٣٩) (سورة البقرة:١٣) .

ئيمـامى ڕازى هۆكـارى ئـەم بۆچـوونە پووچەى دووڕووەكان بەرامبەر بڕواداران دەردەخات و دەفەرموێت:{ دووڕووەكان موسوڵمانانيان بە گێل ناو دەبەن چونكە دووڕووەكان كەسانێكى دەوڵەمەند بوون و خۆيان بەسەركردە دەزانى لە كاتێكدا بـــڕواداران هـــەموو هـــەژار بـــوون، دووڕووەكـان دەيـان وت كـە دينەكـەى محمد(ﷺ) پووچ و نەزانينـە و ئەوەيشـى شوێنى دەكەوێت گێل و نەزانە }[40] .

**ب**. گاڵتــە جــاڕى كــردن بــەبڕواداران لەســەر بــێ ئاگاىيــان لــەبێ بــاوەڕى دووڕووەكان

خواى گەورە دەفەرموێت:

[ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ ][41] .

ئيبن و كـەثـير دەفـەرموێت { واتـە : كاتێـك ئـەو دووڕووانــە بــە بــڕواداران دەگەيشتن دەيان وت : ئێمەش بڕوادارين وەك ئێـوە و لـە ئێـوەين و لايـەن گـرى ئێـوەين ، بـەڵام ئـەم وتانـەيان هـەموو لـەترس و دووڕووى خۆيانـەوە بـووە ، وەكاتێكيش دەگەيشتنەوە بە هاوڕێيانى بێ بڕوا و دووڕووى خۆيان پێيان دەوتـن : ئێمە لەسەر بير و باوەڕى ئێوەين بەڵام ئێمە گاڵتە جاڕيان پێ دەكـەين و ياريـان لەگەڵ دەكەين }[42] . بەڵام ئـەم گێـل و نەفامانە نەيان دەزانى كە خـواى گـەورە نهێنيان ئاشكرا دەكات، وبڕوادارانيـان لێ ئاگـادار دەكاتــەوە ، وەك خــواى گــەورە دەفەرموێت:

[ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ ] { التوبة:٦٤ }

**ج**. گاڵتە جاڕى كردن بـە چاكەكردنى بڕواداران :سەبارەت بە ڕوون كردنـەوەى ئەم باسە ، خواى گەورە دەفەرموێت:

[ الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ][43] .

هۆى دابەزينى ئەم ئايەتە پيرۆزە وەك ئـيبن و مەسـعود دەفــەرموێت { كاتێـك ئايەتى خێركردن دابـەزى ئێمـە بـە كۆڵ شــتمان دەكــرد بــە خێــر و چــاكە ، موسوڵمانێك هات شـتێكى زۆرى كـرد بـە خێر ، دووڕووەكان وتيان : ئەمە ڕيابازە ، ئنجا پياوێكى موسوڵمانى هەژار هـات و بەئەدازەى (صاع) مەنێكى كرد بـەخێر ، ئــــەوجا دووڕووەكـــان وتيـــان : خــــوا پێويستى بەم مەنەى ئەم پيـاوە نىيـە ، ئنجا ئەم ئايەتە دابەزى:[ الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ

(٤٠) انظر : (تفسير الكبير) (٢/٧٥)

(٤١) (سورة البقرة:١٤) .

(٤٢) انظر : (تفسير القران العظيم) (١/٧٦) .

(٤٣) (سورة التوبة:٧٩) .

مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ](٤٤) }(٤٥) .

ئیبن و کەثیر دەفەرموێت { ئەمە یەکێکی ترە لە نیشانەکانی دووڕووەکان ، وهیچ کەسێك سەلامەت نابێت لە ڕەخنە و توانج و گاڵتە جاڕی کردنیان لە هەموو بارودۆخێك دا ، هەتا خێرو مەندەکانیش ڕزگاریان نابێت لێیان ، ئەگەر یەکێك پارەیەکی زۆر بکات بەخێرو چاکە ئەوان دەڵێن: ئەوە ڕیابازە و بۆ خوای ناکات ، وەئەگەر یەکێك شتێکی کەم بکات بە خێر بە گوێرەی توانای خۆی ئەوان دەڵێن : خوا پێویستی بە خێرەکەی ئەم نییە }(٤٦) .دووڕووەکان بەگاڵتە جاڕیکردن بە بڕوادارەکانەوە ناوەستن بەڵکو دەگەنە ئاستی ئەوەی گاڵتە جاڕیش بکەن بە ئایەتەکانی خوای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بەڕێزی.خوای گەورە دەفەرموێت:

[ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ * لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ](٤٧) .

ئیبن و عومەر (رضي الله عنه) سەبارەت بە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێت {پیاوێك لە دووڕووەکان لە دانیشتنێکدا لە غەزای تەبوك وتی : لە ژیانمدا نەم بینیوە بە وێنەی ئەم قورئان خوێنانە چڵێس تر و درۆزن تر و ترسنۆك تر لە ڕووبەڕووبونەوەدا ، یەکێك لە دانیشتوەکان کە (عەوف کوڕی مالیك)بوو (رضي الله عنه) وتی : درۆت کرد هەی دووڕوو دەبێت ئەم قسانەت بگەیەنمە پێغەمبەر (ﷺ) ،ئەوەبوو گەیاندیە پێغەمبەر (ﷺ)و ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی:

[وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ * لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ](٤٨) }(٤٩) .

وەسەبارەت بە گاڵتە جاڕی کردنی دووڕووەکان بە ئایەتەکانی خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و خوای گەورە دەفەرموێت:

[وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ](٥٠) .

ئیمامی طەبەری دەفەرموێت { واتە : کاتێك خوای گەورە سورەتێك

---

(٤٤) (سورة التوبة:٧٩) .

(٤٥) اخرجه : البخاري (١٤١٥) ، ومسلم (١١٠١٨) .

(٤٦) انظر : (تفسير القران العظيم) (٣/١٣٦) .

(٤٧) (سورة التوبة:٦٥-٦٦) .

(٤٨) (سورة التوبة:٦٥-٦٦) .

(٤٩) اخرجه : الطبري في (التفسير) (٦/١٧٢)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند من أسباب النزول) (ص/١٢٢) لـه شاهد بسند حسن عند ابن ابي حاتم (٤/٦٤) من حديث كعب بن مالك .

(٥٠) (سورة التوبة:١٢٤) .

دابیەزێنێت لەو دووڕووانە هەیە کەدەڵێت: کێ لە ئێوە بە دابەزینی ئەم سورەتە بڕوای زیاتر بووەبەخواو ئایەتەکانی }[٥١] ، دووڕووەکان ئەم قسەیان بۆیە دەگوت بۆ ئەوەی خەڵکان لە ئیسلام دووربخەنەوە ، ئیمامی شەوکانی دەفەرموێت:

{ سەبارەت بە [أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَانًا] ئەوە بوو دووڕووەکان گاڵتە جاڕیان دەکرد بە بڕواداران و دەیان وت : کێ لەئێوە بڕوای زیاتر بووە بەهۆی دابەزینی ئەو ئایەتەوە ، وەپێ دەچێت ئەمەیان و تبێت بە کۆمەڵێك لە موسوڵمانان و مەبەستیان ئەوە بووبێت کە ئیسلامیان لابێ نرخ بکەن و لە ئیسلام دووریان بخەنەوە }[٥٢] .

وە ئیمامی ئالوسی دەفەرموێت:

{ دووڕووەکان ئەوەیان دەوت لە رووی گاڵتە جاڕی کردن و بێ بڕوایەوە بۆ برایانی دووڕووی خۆیان بۆ ئەوەی لە بڕوا هێنانیان دووریان بخەنەوە }[٥٣] .

ئیمامی طەبەری لەسەر ئەم باسە دەڕوات و دەفەرموێت { خوای گەورە فەرموویەتی [وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ][٥٤] واتە : دووڕووەکان بە برایانی دووڕووی خۆیانیان دەوت : ئێمە لەسەر بیر و بڕوای ئێوەین ، بەڵام ئێمە گاڵتەجاڕی دەکەین بە خواو کتێبەکەی ، وە بە پێغەمبەرەکەی و هاوڕێ یانی }[٥٥] .

## پێنجەم نیشانە

### دەمارگیری و پێناخۆش بوونی ئامۆژگاری و شانازی کردن بە تاوانەوە

خوای گەورە دەفەرموێت:

[وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ][٥٦] .

وەرنەگرتنی ئامۆژگاری و نەگەڕانەوە بۆ لای ڕاستی بە یەکێك لە نیشانەکانی دووڕو دادەنرێت : ئیبن و کەثیر دەفەرموێت:{ واتە : کاتێك ئەو تاوانبارە سەبارەت بە گوفتار و کرداری پێی دەوترێت : لە خوا بترسە و واز بهێنە لەو گوفتار و کردارانەت و بگەڕێرەوە بۆ لای ڕێگەی ڕاست : ئەو سەرپێچی دەکات و دەمارگیری و تورەبوون وای لێ دەکات کە دەست بەرداری ئەو تاوانانەی نەبێت ئەمەش هاوشێوەی ئایەتەکەی ترە:

(٥١) انظر : (جامع البيان) (٧٢/٧) .
(٥٢) انظر : (فتح القدير) (٥٨٥/٢) .
(٥٣) انظر : (روح المعاني) (٤٥/١١) .
(٥٤) (سورة البقرة:١٤) .
(٥٥) انظر : (جامع البيان) (١٢٩/١)
(٥٦) (سورة البقرة:٢٠٦) .

[ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ] (٥٧)

ئیمامی شەوکانی هۆی وەرنەگرتنی دووڕوو بۆ ئامۆژگاری و شانازی کردنی بە تاوانەوە دەردەخات و دەفەرموێت:

{ واتە : کاتێ ئەوەی پێی وترا ئەو شانازی و دەمار گیریەکەی وای لێ دەکات ئامۆژگاری وەرنەگرێت ئەویش لەبەر ئەو تاوانانەی کە لە دڵیدا هەیە ئەویش کە بریتیە لە دووڕوویی }(٥٨) ، لەبەر ئەمەیە کە دەبینیت دووڕوو ئامۆژگاری وەرناگرێت وەتوڕە دەبێت کە فەرمانێکی بە چاکە پێ بکرێت یاخود ڕێگریەکی لە خراپە پێ بکرێت ، شێخ ئەبوبەکری ئەلجەزائیری دەفەرموێت :

{ خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت کە دووڕوو کاتێك فەرمانی بە چاکە پێ بکرێت یاخود ڕێگریەکی لە خراپەیەك لێ بکرێت و پێی بوترێت : لە خوا بترسە ئەو کارە مەکەو دەست هەڵگرە لە فلان کار ئەو دەمارگیری دەیگرێت بە هۆی تاوانەکانیانەوە }(٥٩) ، بەڵام جێی داخە کەئەم نیشانەی دووڕوویە لە هەڵسوکەوتی هەندێك موسوڵمانانداندا بەدی دەکرێت بەهۆی تازە پەیدابووەکان و بەش بەش بوونی موسوڵمانان و زاڵ بوونی نەزانین بەسەریاندا ، وەکو هاوەڵی بەڕێز ئیبن و عەباس (رضي الله عنه) کە شارەزای مانای قورئانە ئەمەی لێك داوەتەوە و دەفەرموێت { من دانیشتبووم لای عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) کاتێك نووسراوێکی بۆهات : کە دانیشتوانی کووفە ئەوەندە وئەوەندەیان قورئانیان خوێندەوە ، ئیمامی عومەریش (رضي الله عنه) لەبەر ئەم مژدە خۆشە دەستی کرد بە (الله أكبر) کردن ، منیش وتم : جیاوازی و دووبەرەکایەتیان تێ کەوت [ سوێند بەخوا من پێم خۆش نیە ئاوها پەلە بکەن لەم بوارەدا ] ، ئەویش وتی پێم : ئۆف تۆ چۆن دەزانیت ؟ ئیبن و عەباس دەفەرموێت (رضي الله عنه) : عومەر (رضي الله عنه) توڕەبوو ، منیش گەڕامەوە بۆ ماڵ ، دوای کەمێك خۆم دواخست و ئەو ناردیەوە بۆلام وتبووی : دەبێت هەر بە زووی بگاتە لای من ، ئیبن و عەباس (رضي الله عنه) دەفەموێت : منیش چووم بۆلای و فەرمووی : تۆ شتێکت وت ؟ منیش وتم : داوای لێبوردن لە خوا دەکەم و ئەو قسەیە دووبارە ناکەمەوە ، ئەویش وتی : سوێندت لێ دەخۆم دەبێت ئەوەی کەوتت بۆمی دووبارە بکەیتەوە، منیش وتم : تۆ وتت نوسراوێکم پێ گەیشتووە کە ئەوەندە و ئەوەندە قورئانیان

(٥٧) (سورة الحج:٧٢) .

(٥٨) انظر : ( فتح القدير) (٣٠٩/١) .

(٥٩) انظر : (ايسر التفاسير) (١٨٥/١)

خوێنـــدەوە منـــیش وتم : جیـــاوازی و دووبەرەکایـەتیان تـێ کـەوت ، ئیمـامی عومـــەریش (﵁) فـــەرمووی : تــــۆ لەچییەوە ئەمانەت زانیوە ؟ منـیش وتم خوای گەورە دەفەرموێت:

[ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ * وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ ] [٦٠]

کاتێك ئەوان وایان کرد قورئان زانەکان خۆیان پێ ناگیرێ و ئایەتەکەی تـرم بـۆ خوێندەوە:

[ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ][٦١]

وە لـــە ڕیوایەتەکـــەی (عبـــدالرزاق)دا ئیبن و عەباس دەفـەرموێت : وتم : ئـەی سەرکردەی بڕواداران ، هەر کاتێك ئەوان ئاوهـا پەلـە بکـەن بـۆ زانینـی قورئـان خۆیـــان بـــە ڕەواو حـــەق دەزانــــن ، وەهـەرکات واشـیان لێ هـات موجادەلـەو دەمەقاڵە لە گەڵ یەکتر دەکەن ، وەهـەر کـات دەمەقاڵـە و موجادەلـەیان لەگـەڵ یەك کرد جیاوازی و دووبەرەکایەتیان تێ دەکـــەوێت ، وەهـــەرکات جیـــاوازی و دووبەرەکایەتیان تێ کەوت لە گەڵ یەکتر بەشەڕدێن ، ئیمامی عومەریش فەرمووی: ڕاست دەکەیت سوێند بەوەی کە گیـانی منـی بەدەسـتە مـن ئەمـەم لـە خـەڵکی دەشاردەوەو باسـم نـەدەکرد تائـەوەبوو تۆ درکاندت }[٦٢] ، کەوابوو وەرنەگرتنی ئامۆژگاری لە کەسانی شارەزاو دڵسـۆز و بڕوادار وەپێ ناخۆش بوون و دەمارگیری و توڕەبـــوون بـــەو ئامۆژگارییـــە ، نیشانەیەکی دووڕوویە با موسوڵمان زۆر باش لێی بە ئاگابێت وخۆی لێ بپارێزێت، بەتایبەت ئەوانەی کە ئامۆژگاری دەکرێن لەوەڵامدا دەڵێن : بـڕۆ بـەڕێی خۆتـەوە تۆ ئامۆژگاری ئێمـە دەکـەیت ، ئائەمانـە باباش بزانن کە ئەم وتەیەیان خراپترین و بوغزاو ترین وتەیە لە لای خوای گەورە ، وەك پێغەمبـــــەری خـــــوا (ﷺ) دەفـەرموێت:(( إنَّ أبغضَّ الكلام الى الله أنَ يَقولَ الرجُل للرّجل : إتـقِ الله ،فيقـولَ : عليك بنفسك))[٦٣] .

واتـە : خـراپترین و بـوغراترین ووشـە لای خـوای گـەورە ئەوەیـە کـە پیـاو بـە پیاوێك دەڵێت : لە خوا بترسە ، ئـەویش

(٦٠) (سورة البقرة:٢٠٤-٢٠٥).

(٦١) (سورة لبقرة:٢٠٦)

(٦٢)احمد في (المسند) (١٦٩/٤) ، والحاكم في (المستدرك) (٥٤٠/٣) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي ، الحاكم ايضا من طريق اخر (٥٤١/٣) برقم (٦٣٥٦) وقال محققه : سنده حسن .

(٦٣)ابن منده في (التوحيد) (١٢٣/٢) ، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٥٩٨) اسناده صحيح .

دەڵێت : تۆ ئاگاداری خۆت بە ، وەئەم كارەش بەڕاستی لە تاوانە گەورەكانە ، وەكو إبن مسعود(ﷺ) دەفەرموێت:

{إنَّ من أكبر الذنوب أن يقول الرجـــل لأخيه : إتق أللّه ، فيقول : عليك بنفسك، أنت تأمُرني }(٦٤).

واتە : یەكێك لەهەرە تاوانەگەورەكان ئەوەیە كە پیاو بە براكەی بڵێت لە خوا بترسە ، ئەویش لەوەڵامدا بڵێت :

ئاگاداری خۆت بە تۆ ئامۆژگاری مـن دەكەی ، كەوابوو پـێ ناخۆش بـوونی ئامۆژگاری و بەكارهێنانی تووڕەبوون و دەمارگیری و نەرم بوونی شارەزایی تەواو لە سونەت و باوەڕدا و شوێن كەوتنی ڕێچكەی جۆراوجۆری لادەر لە ڕێگەی ڕاست لە گەورەترین هۆكارەكانی دروست بوونی جیاوازی و ووبەرەكایەتیـیە لەنێوان موسوڵماناندا ، ئیبراهیمی تەمیمی دەفەرموێت :

عومەری كوڕی خەتاب (ﷺ) ڕۆژێك هەر خۆی بوو كەوتبوە دالغە ناردی بەدوای ئیبن و عەباسدا (ﷺ) و هات و پـێی وت

( كيف تختلف هذه الامة وكتابُها واحدٌ، ونبيُّها واحدٌ ، وقبلتُها واحدة ؟ )

واتە : چۆن دووبەرەكایەتی دەكەوێتە ناوئەم ئومەتەوە لەكاتێكدا یەك كتێبیان هەیە و یەك پێغەمبەریان (ﷺ) هەیە ، ویەك قیبلە و ڕووگەیان هەیە ؟ ئیبن و عەباسیش فەرمووی:

{ ياأمير المؤمنين إنا أُنزِلَ علينا القرآن ، فقرأناهُ و علمنا فيم نزل ، وإنَّهُ يكون بعدنا أقوامٌ يقرؤن القرآن لايعرفون فيم نَـــزَلَ ، فيكون كل يوم فيه رأي ، فإذا كان لقـــوم فيه رأي إختلفوا ، فإذا إختلفوا اقتتلوا}(٦٥).

واتە : ئەی سەركردەی بڕواداران قورئان دابەزێنرا بۆمان ، خوێندمانەوە و زانیمان بۆ چ هۆكارێك دابەزیوە ، بەڵام كەسانێك لە دوامان دێن قورئان دەخوێنن و نازانن بۆ چ هۆیەك دابەزیوە، وەهەر ڕۆژە بۆ چوونێكیان لەبارەوە دەبێت ، وەهەر كاتێك هەر تاقمە بۆ چونێكیان لەبارەوە ببێت ئەوا جیاوازی و دووبەرەكایەتیان تێ دەكەوێت وەهەر كاتێك دووبەرەكایەتیان تێ كەوت شەڕ بەرپا دەبێت لە نێوانیاندا .

---

(٦٤)الطبراني في (الكبير) (٨٥٨٧) ، وقال الهيثمي ورجالــه رجال الصحيح ، والبيهقي في (شعب الايمان) (٨٢٤٦).

(٦٥) اخرجه : البيهقي في (شعب الايمان) برقم (٢٢٨٣) .




**پێشەکی:**

پێشــەوا (ابــن القــیم) دەفــەرموێت: ((هەر داواكاریەك لـە خـواوە هاتبێـت بـۆ مـرۆڤ شـەیتانی نـەفرین لێ کـراو بـە دوو ئاراستەدا دەیبات:

١- بـــەرەو کەمتەرخـــەمیو دوور خستنەوەی موسڵمانان لە کارکردن پیێ.

٢- بەرەو زێدەڕەوییو توندوو تیـژی لەو فەرمانەدا.

وە دینـی خـوا لـە نێوان ئـەم دوو حاڵەتەدایـە" نـە زێـدەڕەوی ونـەکورت ڕەوی ، وە دینی خـوا میـان ڕەوی و داد پەروەرییە ئەم دینە وەك و شیوێك وایـە لە نێوان دو چیادا یا ڕووناكیەكە لە نێوان دوو تـاریکیدا یـان نێوانێکـە (وسـط) لـە نێوان دوو لای خراپەدا.

دووری لـە دینـی خـواوەو کـارپێ نەکردنی بە فیرۆ دانێتی.

هـەروەها زێـدەڕەوی لـەدینی خـواداو توون و تیژی تیایدا دیسان بەفیرۆدانێتی بەڵام بەشـێوەیەکی ، ئـەمیان بـە کـورت ڕەوی تیایداو ئەویان بە زیادەڕەوی))[1]

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە دەڵێین :

زۆربەی کۆمەڵگاکان سێ تاقم خەڵکی تیادایە :

١-خەڵکانێك لەسەر ڕێگای ڕاستن :

ئەوانە ئوممەتی مام ناوەندن(وسط).

کۆمـەڵی ڕزگـاربوو وسـەرکەوتوو(الطائفـة الناجیـة المنصـورة) ئەوانـەن دەسـتیان گرتووە بە بنەماو بنچینەی ئاینەوە :

((یەکتاپەرسـتی خـوا لـە پەرسـتنداو گوێڕایـەڵی و شـوێن کـەوتنی قورئـان و سوننەت لـە سـەر ڕێبـازی پیـاو چاکانی پێشـینین ئەوانـەی کـە خـوای گـەورە پاراسـتوویانێتی لـە زێـدەڕەوی و تونـدو تیژی لە ئایندا جگە لـە شـوێن کـەوتوانی ئـەوان کەوتوونەتـە نـاو زێدەڕەوییـەوە بەهەر جۆرێك بێت)).

(١) مدراج السالكین (٢/٥١٧).

٢-خــەڵكانێك كــورت ڕەوی و كــەم تەرخەمن مافی خوايان بەجێ نەهێناوە.

٣-خەڵكانێك زێدەڕەوو توندو تيـژن سـنوری خوايـان بەزانـدوە و داهێنـراوو زێدەڕەوی دەكەن لە ئاينداِ...

وە ئێستا دێينە سەر باسی:

١. پێناسەی زێدەڕەوی.
٢. هۆكارو نيشانەكانی.
٣. دياردەكانی.
٤. چارەسەری:

## پێناسەی زێدەڕەوی (الغلو):

**زێدەڕەوی لەزمانەوانيدا ( الغلو لغة):**

زيـاترو بـەرزترو سـنوربەزاندن لـەو پێيەی كە بۆ هەموو شتێك دانراوە ، واتا زێدەڕەوی تيايدا

**زێدەڕەوی لەشەرعدا**
**( الغلو اصطلاحاً )**

ئەو جۆرە دينداريیەيە كـە بەهۆيـەوە لــە ديــن دەردەچــيت[٢] وە (قورئــان و ســوننەت) و زمــانی عــەرەبی بەڵگــەن لەسەر ئەوەی كە زێدەڕەوی و بەزانـدنی سنوری دياريكراوە[٥].

**بەڵگەی قورئان لە ئاگاداركردنەوەی خەڵكی لە زێدە ڕەوی :**

١-خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلا تَقُولُوا عَلَى اللهِ إِلا الْحَقَّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ فَآمِنُوا بِاللهِ وَرُسُلِهِ وَلا تَقُولُوا ثَلاثَةٌ انْتَهُوا خَيْراً لَكُمْ إِنَّمَا اللهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَكَفَى بِاللهِ وَكِيلاً ﴾[٣].

واتە: ئەی گاورو جولەكە زيـادەڕەوی مەكـەن لـە دينەكەتانـدا وە هـيچ شـتێك مەڵێن دەربارەی خوای گـەورە جگـە لـە حەق (كە جولەكە دەڵێن عوزەير كوڕی خوايە و گاورەكان دەڵـێن عيسـی كـوڕی خوايە )عيسای كـوڕی مەريـەم نێردراوی خواو (وشەی خوا بـووە كـە ناردوويـەتی بۆ مەريەم لـە ڕێگـەی جبريلـەوە پاشـان پێی فەرمووە ببە و ئەويش بەبێ بـاوك دروسـت بـووە ئێـوەش بـاوەڕ بـە خـواو پێغەمبەرانی بهێنن (كە خوای گەورە تاك و تەنيايە لە كـەس نـەبووەو كـەس ی لێ نابێت پێغەمبەرانيش ڕاسـتگۆ بـوون) وە مەڵێن سێ خـوا هەيـە (كـە گـاور ەكـان باوەڕيـان وايـە ) واز لــەم بـيرو بـاوەڕو قسانە بهێـنن باشـترە بۆتـان چـونكە الله تەنها پـەرستراوی حەقە و تاكەو هاوبەش ی نييــە ، پــاك و بێگــەردی بــۆ خــوای گەورە لەوەی كە كوڕی هـەبێت ، خـوای گــەورە پێويســتی بــە كــوڕ نــی ی يــە

(٢) (لسان العرب ): ١٥/١٣١، ١٣٢ .

(٣) (سورة النساء: ١٧١).

هەرچی لە ئاسمان و زەوی دایە هەمووی موڵکی خوایە (ئەوەی ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا موڵکی خوایە کەوابو چۆن موڵك دەکرێت بە هاوبەش بۆ خاوەنەکەی).

٢-خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيرًا وَضَلُّوا عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ ﴾[٤].

واتە: ئەی محمد(بە گاورو جولەکە بڵێ زیادڕەوی مەکەن لە دینەکەتانداو جگە لە حەق هیچی تر مەڵێن وشوێن هەواو ئارەزووی کەسانی پێش خۆتان مەکەون کە پێشتر ئەوانیش گومڕا بوونە زۆر خەڵکیشیان گومڕا کردوە گومڕا بوونەو دەرچونە لەڕێگای ڕاست.

٣-خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾[٥]

واتە: ئەی محمد ( ڕاست بە بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوویت وە ئەوانەیشی وا تۆبەیان کردووەو ، لەگەڵ تۆدان، با ئەوانش ڕاست بن وە زیادە ڕەوی مەکەن بە کردنی تاوان و سەرپێچی چونکە خوای گەورە کردەوەکانی ئێوە دەبینێت.

(٤) (سورة المائدة:٧٧).

(٥) (سورة هود:١١٢).

**وتەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی زێدەڕەوی**

١- (ابن عباس) ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت:پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إياكم والغلو في الدين، فإنما أهلك من كان قبلكم بالغلوا في الدين ))[٦] .

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ( ئاماژە بەوە دەکات ودەفەرمێت: (ئاگادارتان دەکەمەوە لە زیادەڕەوی کردن لە دینـدا زیادەڕەوی مەکەن چونکە ئەوەی کە ئوممەتانی پێش ئێوەی لەناو برد زیادەڕەوی بوو).

٢- عبدالله خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت پێغەمبەر دەفەرموێت: ((هلك المتنطعون قالها ثلاثاً))[٧].

پێشەوا نەوەوی دەفەرموێت: (هلك المتنطعون) واتە ئەوانەی کە ڕۆچوون و زێدەڕەون و سنوریان بەزاندوە لە گفتارو کرداردا....تیاچوون[٨]

٣- **أبو هريره** رضى الله عنه **قال** :قال **رسول الله** ﷺ :(ان هذا الدين يسر ولن يشاد الدين أحد إلا غلبة ، فسددوا وقاربوا وابشروا واستعينوا بالغدوة والروحة وشئ في الدلجة ) وفي لفظ ( والقصد القصد تبلغوا)[٩].

(٦)أحمد في المسند(١/٢١٥،٣٤٧)، قال أحمد شاكر في تحقيق المسند (١٨٥١) اسناده صحيح.

(٧) مسلم (٢٦٧٠).

(٨) شرح صحيح مسلم للامام النووي(١٦/٤٦١).رقم (٢٦٧٠).

(٩) البخاري (٣٩).

ابـن حەجـەر دەڵـێ : مانـای ئـەم فەرموودەیە ئەوەیە کـەس ڕۆنەچێ لـە کرداری ئـاینیدا و وازبهێنـێ لـە نـەرم و نیانی گەر وابێ ئەوە لە توانا دەکەوێ و دادەبڕێ لە کردەوەدا دەڕوخـێ ، ئـەمجا دەڵێ : بینیمان و خەڵکی بینی لـە پـێش ئێمە هەر کەسێ زێدەڕەو بوبێ ئـەوە لـە دین دابڕاوە)[١٠] .

٤- أنس بن مالك رضي الله عنه قـال: ((جاء ثلاث رهط الى بيوت ازواج النبي ﷺ يسألون عن عبادة النبي ( فلما اخبروا كأنهم تقالوها ، فقالوا :اين نحن من النبي ﷺ ؟ قد غفر الله ما تقدم من ذنبه وما تأخر))

قال أحدهم : أما أنا فأصلي الليل ابدا .

وقال آخر : وأنا أصوم الدهر ولا أفطر.

وقال آخر : وأنا اعتزل النساء فلا أتزوج أبدا.

فجاء رسول الله ﷺ فقال:((أنتم الذين قلتم كذا وكذا ؟ اما والله اني لأخشاكم لله واتقاكم له لكن اصوم وأفطـر ، وأصـلي وأرقد ، وأتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني))[١١].

واتـە: سـێ کـەس هاتنـە مـاڵی خێزانـەکانی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ پرسـیارکردنی پەرسـتی پێغەمبـەر ﷺ کاتێك کە پەرستنی پێغەمبەریان ﷺ پێ ڕاگەیاندن ، ئەوانیش لایان کەم بوو بۆیە وتیان ، ئێمە لە کوێو پێغەمبـەر ﷺ لـە کوێ خـوای گـەورە لـە تـاوانی پـێش و پاشی خۆش بووە.

یـەکێکیان وتـی : بـەڵام مـن شـەو ناخەوم و شەو نوێژ دەکەم بەبەردەوامی.

ئـەوی تریـان وتـی: منـیش بـەردەوام بەڕۆژوو دەبم و ڕۆژو ناشکێنم .

ئـەوی تریـان ووتـی: منـیش خـۆم لـە ئافرەت دوور دەخەمەوەو هەتاهەتایە ژن ناهێنم .

پاشـان پێغەمبـەر ﷺ هـات و ووتـی: (ئێوە بوون واتان ووتوەو واتان ووتـوە؟ بـەڵام مـن سـوێند بـە خـوای گـەورە لـە هەمووتان زیاتر لە خـوا دەترسـم و خـۆم دەپـارێزم ، بـەڵام بـەڕۆژویش دەبم و بـە ڕۆژویـش نـابم، شـەونوێژیش دەکـەم و دەیشـخەوم، وە ژنـیش دێـنم، وە هەرکەسـێك لـە سـونەتی مـن لادات و دەرچێت ئەوە لە من نییە).

٥-قال ﷺ : ((إن هذا الـدين مـتين ، فأوغلوا فيه برفق))[١٢]

واتـە:ئـەم دینـە بـەهێزو ڕەقـە ئێـوە بەنـەرموو نیـانی وەریبگـرن و بچـنە ناویەوە ، هەڵسوکەوتی تیادا بکەن .

(١٠) فتح الباري (١/١١٧).

(١١) البخاري برقم(٥٠٣٦)، ومسلم برقم(١٤٠١).

(١٢) الاحاديث الصحيحة(١٢٨٣).

ئاینی ئیسلام بنیات کراوە لەسەر ئاسانی و بەرفراوانی ، بەپێی توانای مرۆڤ. خوای گەورە دەفەرموێ :

[ يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر ] [١٣]

واتە: خوای گەورە ئاسانی بۆ ئێو دەوێت و گرانی و قورسی ناوێت بۆتان .

[ مايريد الله يجعل لكم من حرج ] [١٤]

واتە : خوای گەورە نایوێت ناخۆشی و قورسی لەسەرتان دابنێت.

[ فاتقوا الله ما استطعتم ] التغابن :١٦

واتە: چەندێك لە تواناتاندا هەیە لە خوا بترسن.

[ لا يكلف الله نفساً الا وسعها ] [١٥]

واتە: خوای گەورە داوا لە هیچ کەس ناکات تەنیا بە گوێرەی توانای خۆی نەبێت.

وەدینی خوا ئاسان و میان ڕەوە خوای گەورە ئەفەرموێ:

[ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً ] [١٦]

واتە: بەم شێوازە ئێومان کردووە بە ئوممەتێکی ناوەندو دادپەروەر تا شایەتی بدەن لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ پێغەمبەران کە پەیامی خوایان گەیاندووە بە نەتەوەکانیان وە پێغەمبەریش دەبێت بەشایەد بەسەر ئێوەوە.

وە پێغەمبەر ﷺ شایەتی نادا تەنیا بۆ کەسێك نەبێت کە لەسەر سوننەت و ڕێگەو ڕێبازەکەی ئەو نەبێ ، بەلاّم خاوەن داهێنراوەکان و زێدەڕەوان لە دینی خوادا ئەوانەی کە دوورن لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژ ی دوایدا لە قیامەتدا پێیان دەڵێ:(( بعداً بعداً، وسحقاً سحقاً، لمن بدل بعدي ))[١٣]

واتە :دوور بن دوور بن ، دوورخرێنەوە لە من ئەوانەی پاش من دینیان گۆڕیوەو شتی تازەو داهێنراویان خستووەتە ناو دین.

## جۆرەکانی زێدەڕەوی :

**١- لە بیرو باوەڕدا(العقائد).**

**٢-زێدەڕەوی لە خەڵکیدا (الأشخاص)**

**٣-زێدەڕەوی لە کرداردا(العمل).**

### ا-زێدەڕەوی لە بیرو باوەڕدا(العقائد):

(ابن تیمیە)[١٧] ڕەحمەتیخوای لێ بێت دەڵێ: زێدەڕەوی لە بیرو با وڕدا وای کردووە کە ئە تاقمە زێدەڕەوانە جودا بوونەتەوە لە ئەهلی سوننە وەك –

(١٣) (سورة البقرة:١٨٥).
(١٤) (سورة المائدة:٦).
(١٥) (سورة البقرة :٢٨٦).
(١٦) (سورة البقرة:١٤٣).

(١٧) (٢٨٩/١)فەتاوا.

رافضة-خوارج-جهمية-معتزلة-.... كە هەموویان کەسانی غەیری خۆیان کافر دەکەن.

زێدەڕەوی لە بیروباوەڕدا زیانی زیاترو ترسناك ترە لە جۆرە زێدەڕەوی ەکانی تر لە ناو موسڵمانانادا بۆیە هەموو ئەو تاقمە گومڕایانە کە باسمان کرد لە زێدەڕەویە بیروباوەڕەوە هەڵ قوولاون ، کە ئیستا بە پۆشاکێکی ترەوە لە ناو تاقمە هاوچەرخەکاندا دەردەکەون لە کافرکدنی خەڵکدا، وە دواجار بەرەو توندو تیژی و کوشتن و تەقینەوەو ....

**٢-زێدەڕەوی لە خەڵکیدا** (الأشخاص):

ئەم جۆرە زێدەڕەویە لە خەڵکیدا بریتی‌یە لە پێدانی پلەیەك بە خەڵکی ، پلەیەك کە لە پلەی خۆیان زیاتر بێت وەك ئەوەی کەسانێك دەڵێن (امامی علی) خوایە یاخود پێغەمبەرە، یا ئەو کەسانەی کە دەڵێن عیسی علیە سلام کوڕی خوایە یاخود ئەو کەسانەی زێدەڕەوی لە پێغەمبەران و پیاوچاکاندا دەکەن و هەندێ لە سیفاتی پەروەردگارێتی یا پەرستراوێتیان پێ دەبەخشن و ئیعتیقادیان وایە کە ئەوان بە مردوویس یا لە دورەوەش ئاگادارن بەسەر حاڵی خەڵکیداو توانای تەسەڕوف کردنیان هەیە لە بونەوەردا . وە داوایان لێ دەکەن بەغەوسیان دادەنێن. یاخود کەسانێك قسەی کەسێك پێش فەرموودەی خواو پێغەمبەری خوا ( دەخەن و کرداری پێدەکەن، ئەمەش جۆرێکە لە زێدەڕەوی کە خاوەنەکەی بەرەو گومڕایی دەبات...

**٣-زێدەڕەوی لە کرداردا**(العمل):

ئەم جۆرە زێدەڕەوی‌یە زیانی کەمترە لە جۆرەکانی تر بەلام لەگەڵ ئەویشدا پێغەمبەر (لەو بارەیەوە دەفەرمێ :(من رغب عن سنتي فليس مني)

کەئەم فەرمودەیە دەربارەی کەسانێك کە ویستیان چەند کارێك ئەنجام بدەن کە زیاتر لەوەی کە خوای گەورە داوای کردووە لە موسڵمانان لەبەرئەوەی زێدەڕەوی لە ئاینی خوادا قەدەغەیە دەبێت موسڵمان بەپێی ئەو ئەندازەیە کارو گفتار(خواپەرستی بکات ) کە بۆی دانراوە کە ئەویش لە تواناو تاقەتی خۆیدایە .

وە ئەوەی کە باسمان کرد ئەوە دەردەخات ئەبێ موسڵمان پابەندی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت لە نوێژوو ڕۆژوو... دوور کەوتنەوە لەوەی کە قەدەغەکراوە بەبێ زێدەڕەوی و کورت ڕەوی واتە بەو ئەندازەیەی کە پەروردگار دایناوە (الاعتدال) میان ڕەوی.جا بۆیە موسڵمان پێویستە میانڕەو بێ و دوور بێ

لە زێدەڕەوی بەهەموو جۆرەکانییەوە تا سەلامەت بێ لە دین و دنیاو نەخزێ کە چۆن کەسانێك خزاونەتە ناو جۆرەکانی زێدەڕەوییەوە لە دووایشدا وازهێنانیان لە کردەوەی چاك و دوور کەوتنەوە لە ئاینی خوا یا دەکەونە ناو کارێکەوە کە خوای گەورە توڕە دەدەکات.

## نیشانەو هۆکاری زێدەڕەوی وزێدەڕەوان:

قال رسول الله ﷺ: ((سيخرج قومٌ في آخر الزمان أحداث الأسنان، سفهاء الأحلام، يقولون من خير قول البرية، لا يجاوز إيمانهم حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية، فأينما لقيتموهم فاقتلوهم، فأن في قتلهم أجراً لمن قتلهم يوم القيامة)) (١٤)

قال رسول الله ﷺ: ((يخرج في هذه الأمة)) و لم يقل :منها ((قوم تحقرون صلاتكم عند صلاتهم، يقرؤون القرءان لا يجاوز حلوقهم -أو حناجرهم -يمرقون من الدين مروق السهم من الرمية، فينظر الرامي الى سهمه الى نصله الى رصافه فيتمارى في الفوقة، هل علق بها من الدم شئ ))(١٥)

قال النبي ﷺ : ((يمرقون من الإسلام مروق السهم من الرمية))(١٦)

واتە:لەکۆتایی زەماندا کەسانێك پەیدا دەبن کە تەمەنیان تازەیە و بیروبۆ چون و کردەوەیان نەفامانەیە، لە قسەی باشترین دروست کراو پێغەمبەر ﷺ دەڵێن باوەڕیان لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات ، لە دین دەردەچن هەروەك چۆن تیر لە نێچیرەکەیەوە دەردەچێت کەدەیپێکێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لەم ئومەتە کەسانێك دەردەچن ، نەیفەرمو لە ئومەتەکەدا کەسانێ هەیە(کەسانێك کە ئێوە نوێژی خۆتان پێ کەمە لە چاو نوێژی ئەواندا ، قورئان دەخوێنن و لە گەردنیان تێپەڕ ناکات، وە لێیان وەرناگیرێت ، لە دین دەردەچن هەروەك و چۆن تیر نێچیرەکەیەوە دەردەچێت ، تیر وەشێنەکە تەماشای تیرەکەی دەکات تەماشای سەرە ڕمەکەی دەکات تەماشای شوێنەکە دەکات گومانی هەیە ئایا هیچ خوێنێ بووە بەتیرەکەیەوە پێغەمبەر ( دەفەرمێت (دەردەچن لە دین هەروەك و چۆن تیر لە نیشانەکە دەردەچێت).

**(کەواتە نیشانەکانی بریتین لە)**

١-حدثاء الإنسان (هەرزەکارن):

ئەو زانست و ئەزموونەی کە لای بەساڵاچوودا هەیە لای هەرزەکارو تەمەن منداڵ نییە لە بەر ئەوە بۆچوون و بینینیان دەگۆڕێت و جێگیر نییە لەبەر کەمی زانست و هەڵەشەیی و (حەماسەتی) بەتاڵ، کەوا دەکات بەرەو

هەڵەو کاری خراپ ببیان بات لە گەڵ ئەوەیشدا ئەمانە گوێ ناگرن لە زاناکان و خاوەن ئەزموونەکان و شارەزا لە قورئان و سوننەت .چونکە سەرانیان دیواریان دروست کردووە لە نێوانیاندا و چاویان بەستراوە بۆیە هەردەم لە هەڵەدان.

٢-**سفهاء الأحلام** (نەزانن) لە قورئان و سونەت تێ ناگەن -کاتێك سەیری تاقمە توندرەوەکان بکەیت دەبینی لە لایەن زانستی شەرعییەوە نەزانن ئەو گوفتارو کردارانە کە دەیڵێن، دەیکەن دوورە لە (قورئان و سوننەت) وە هیچ گرنگیەك نادەن بە زانستی شەرعی بۆیە لە گێژاوی گومڕاییدا دەتلێنەوە .

**٣-تێنەگەیشتنیان لە قورئان:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت: ((ان من ضئضيء هذا قوماً يقرؤون القرآن لا يجاوز حناجرهم))[١٧]

واتە: لە نەوەو وەچەی ئەم ذوالخویصرة کەسانێك پەیدا دەبن کە قورئان دەخوێننەوەو بەڵام ناگاتە گەردنیان (لێی تێناگەن)وە کوشتاری موسڵمانان دەکەن و واز لە بت پەرستان دەهێنن.

ئەم زێدەڕەوەوانە ((يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم ))

واتە قورئان دەخوێنن بەڵام لێی تێناگەن وە لە مەبەستی ناگەن، چونکە مەبەست لە قورئان خوێندن تێگەیشتنە لێی و چۆنییەتی کارپێکردنی .

(ابن حجر) دەڵێ: ((لە تێنەگەیشتنیان بۆ قورئان ئەو ئایەتانەی بۆ کافر دابەزیوە ئەیخەنە سەر موسڵمانان))[١٨]

یەکەم وشە کە زێدرەوان پێی دەرچون ئەوەبوو دەیان ووت (لا حكم الا لله) حوکم تەنها بۆ خوایە، لە قورئان وەرگیراوە بەلأم بەلایەکی تردا بردبوویان نەك کارپێ‌کردنی لە شوێنی خۆیدا[١٩] ، بۆیە لەکاتی خۆیدا دەستیان کردە خوێن رشتنی موسڵمانان و نانەوەی فیتنەو ئاشوب...

تێنەگەیشتنیان لە قورئان وادەکات لە سوننەت دەرچن بۆیە ئەمان یەکەم کەسانێك بوون چەندەها فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ رەتکردووەتەوە بە بیانوی بەتاڵ. وەلەمانەوە تاقمە گومڕاکان وەك(قدریه ، معتزله ، جهمی ە .... ) ئەم بۆچوونەیان وەرگرت لە رەتکردنەوەی چەندەها فەرمودەی پێغەمبەر ( وەلەم سەردەمەدا خەڵکانێك هەمان بۆچونیان هەیە لە رەتکردنەوەی قسەی پێغەمبەر ( تا قسەی مامۆستاکەی هەبێت یان عەقڵ و ئارەزووە نەخۆشەکەی وەستابێت گوێ

بە فەرمودەی پێغەمبەر نادات وە بە خۆشی دەڵێت موسڵمان و حوکمی خوا دەهێننە کایەوە ...

وە ئەو ئایەتانەی کە روونن لە ئەحکام دا لاری دەکەنەوە بە جۆرێك گونجاو بێت لەگەڵ بیرو باوەڕیاندا .

٤- نیشانەیەکی تر **ڕیزنەگرتن لە زانایان** و پیاو چاکان و تۆمەتبارکردنیان و توانج گرتن لێیان. کە ئەوان (زانایان) چرای رووناك کردنەوەی ڕێگای راستن ، ئەبو حاتەمی رازی دەڵێت: (علامة أهل البدع الوقيعة في اهل الأثر)[٢٠]

واتە: یەکێك لە نیشانەکانی ئەهلی بیدەع بریتییە لە غەیبەت کردن و قسەکردن بە زانایانی حەدیس و شوێن کەوتەکانی سەلەف.

موسڵمان دەبێت هەڵنەخەڵەتێت بەو لایەنەی ئەوان کە دەبینێ خواپەرستی زۆر دەکەن لە نوێژو رۆژوو .... چونکە پێغەمبەر ﷺ ئاگادارمانی کردووەتەوە کە وەصفیان دەکات و دەڵێ ((تحقرون صلاتكم مع صلاتهم)).

واتە:نوێژی خۆتان پێ کەمە لەبەرامبەر نوێژی ئەواندا ئەوەندە ئەوان بە جوانی نوێژ دەکەن .

لادانی ئەمان لە ئایندا لە لایەنی بیروباوەڕەوە، بۆچونی ئەوان لە زێدەڕەوی و توونددو تیژی کە وای کردووە لە میانڕەویتی‌و دادپەروەری دین دەربچن .

**٥-کافرکردن و خوێن حەڵاڵ کردنی موسڵمانان :**

پێغەمبەر ﷺ وەسفیانی کردووە و دەڵێ ((يقتلون أهل الإسلام ويدعون أهل الأوثان))

واتە : موسڵمانان دەکوژن و واز لە بت پەرستان دەهێنن.

ئەم کارەیان بنیات کراوە لە سەر کافرکردنی موسڵمانان.وە ئەم سیفەتە ڕەوشتێکی هاوبەشە لە نێوان هەموو تاقمە داهێنەروو زێدەڕەوەکاندا.

ئەم زێدەڕەواندا تاوانباری موسڵمانان کافر دەکەن و خوێن وماڵیان حەڵاڵ دەکەن ، وولاتی ئیسلام بە ولاتی کوفر دەژمێرن بۆیە هانی خەڵکی دەدەن بۆ کۆچ کردن بۆ ئەشکەوت و چیاکان.یا بۆ وولاتە لە بنەڕەت کافرەکانی وەك أوروپاو ....!!.

ئەو بیانوانەی خاوەن زێدەڕەوکان دەیهێننەوە بۆ دژایەتی کردنی کاربەدەستان و حاکمەکان کە کافر دەکرێن و دەرچوون و دژایەتی کردنییان بە وشەو چەك حەڵاڵ دەکەن، دوورە لە بنەما شەرعیەکان کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دایناوە، چونکە بانگەواز کردن بۆلای خوا دورە لە لابردنی مونکەرێك بە

مونکەرێکی تر یا تاوانێك بە تاوانێکی تـر و دوورە لــەوە کــە خــەڵکی بــە زەبــری تووندو تیژی بانگ بکرێت بـۆ موسـوڵمان بون و گوێ ڕایەڵی خوای گەورە.

بانگەواز کردن بۆلای خوا بنیات نراوە لەسەر زانست و چاکەو ڕۆشنایی نـەرم و نیـانی و نەهێشـتنی خراپـە. وە ئــەوە ناگەیـەنێ کـە زۆر لـە خـەڵکی بکـەیت و تووندوتیـژ بیـت لــە گەڵیانــدا ، خــوای گەورە ئەفەرموێ

﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ ﴾[18]

واتـە: تـەنها ڕاگەیانـدن و بـە ئاشـکرا ووتنـی دیـن لەسـەرتانە حسـابیان لـەلای ئێمەیە ئەگەر وەلآم نەدەنەوە.

بۆیە دەبێت ئیسلام لای خەڵکی وەکو خـۆی جـوان بکرێـت و گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبەری خوا ﷺ بەنەرمی بکرێت و لـە ناشیرین کردنی ئیسلام و پەیامەکەی

پێشـەنگ بـۆ هـەموو بانگـەواز کـەران ئەم ئایەتەیە :کە دەفەرموێت:

﴿ ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾[19]

واتە :بانگەواز بکە بۆ لای ڕێگای دینی پـەروەردگار بـە سـوننەت و ئامۆژگـاری چـاك وە دەمــەقاڵیان لەگەڵــدا بکــە بــە جوانترین شێوە ، پـەروەردگارت زانـاترە بەو کەسەی کە گومڕا بووە لـە ڕێگاکـەی و هەر خۆی زاناترە بە هیدایەت داران.

**٦–داهێنراوی دەکەن لە پەرستندا:**

وەك ئەوانــەی لــە مزگــەوتی کوفــەدا زکرێکی داهێنراویان دامەزراندبوو عبدالله کوڕی مەسعود نەهی لێیان کرد...

دوا جـار لـەو داهێنـراوەوە گەیشـتنە کافرکردنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و شەڕ کردن لەگەڵیاندا لە نەهرەوان ...

ئەم تاقمە گومڕایە نیشانەیەکی تریان زیادکرد ئەویش داهێنراوی جۆری زیکر لەگەڵ گۆڕینی شێوازی بانگەوازکردن بۆلای خوا.

**٧–پارەو دەسەڵاتیان دەوێ:**

پێغەمبەر ( ئەفەرموێ (لكل أمة فتنـــة وفتنة أمتي المال)[20].

واتە: هەموو نەتەوەیەك فیتنەیەکیان هەیە ، فیتنەی ئومەتی من پارەو سامانە کە بە هۆیەوە واز لە دین دەهێنن.

کاتێك کـە (ذوالخويصرة) هاتـە لای پێغەمبــەرﷺ ( کــە زەکــاتی (بحــرین)ی دابــەش دەکــرد بــە پێغەمبــەری ووت ((اعدل)) دادپەروەربـە [21]. ئـەم کـارە خراپەی خویصرە دەرچـوونێك بـوو بـەو وشەیەدژ بە پێغەمبـەر ﷺ . پێغەمبـەری

---

(١٨) (سورة الرعد:٤٠).

(١٩) (سورة النحل:١٢٥).

(٢٠) الترمذي (٢٤٣٩/٦).

(٢١) ئەم فەرموودەیە بەناوبانگە لە (صحيحين)دا.

نـازداری ﷺ تۆمـەتبارکرد کـە چـاکترین دروستکراوە لە دادپەروەری و ئەمینداری دا ، بۆیە پێغەمبەر ( روون کردنەوەیەکی دەربـــارەی رەوشـــتی تـــاقمی (ذی الخویصرە) روون کردەوە کە فەرمووی: ((إنه يخرج من ضئضئي هذا)) واتـە: لـە نەوەو وەچەی ئەمە کەسانێك پەیدا دەبن کە.....

(ذو الخويصـــــرة)ی ســـەر گـــەورەی زێـدەڕەوان کـە تانـەو تەشـەری دا لـە دادپــەروەری پێغەمبــەر ( ئایــا شــوێن کــەوتوانی ئــەم گومڕایــە چـۆن مامەڵـە دەکەن لەگەڵ موسڵمانان بە تایبەت زاناو پێشـەوایانی شـوێن کـەوتوانی پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵانی؟!

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

**بەشی دووەمی بەدوادا دێت**

**إن شاء الله**

## سەرچاوەکان


١- الإرهاب .زيد المدخلي.

٢- الحكم بغير ما أنزل الله: للشيخ خالد العنبري.

٣- كيف نعالج واقعنا الأليم.کۆکردنەوەو ئامادەکردنی(ابو انس و علي بن حسين ابـو لوز)

٤- مظاهر في التكفير والتفسيق اسباب ذلك وعلاجه. د.صالح بن غانم السدلان

٥- المجلة السلفية.عدد(١، ٢)

# خۆشەویستی خوا
# محبة الله تعالى

ئامادەکردنی : مامۆستا کامەران

## بەشی یەکەم
## پێشەکییەکی زۆر گرنگ

خۆشەویستی خوای گەورە لە شکۆدارترین پێویستییەکانی ئیمانەو، لە گەورەترین بنەماکانێتی وە بەرێزترین بناغەیە لەبناغەکانی ، بەڵکو بنەمای هەموو کارێکە لە کارەکانی ئیمان و دین، هەروەکو راست گێڕی خوای گەورە (التصديق به) بنەمای هەموو وتەیەکە لە وتەکانی ئیمان و دین [1].بۆ زیاتر روون کردنەوە پێویستە زۆر بە وردی سەرنجێك لە پێناسەی ئیمان بدەین و بزانین خۆشەویستی خوای گەورە چ پلەو پایەیەکی گەورەی هەیە لە ئیماندا .

ئیمان لەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتییە لە: (قول وعمل ، قول القلب وعمله ، وقول اللسان ، وعمل الجوارع يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية)[2].

واتە: باوەڕ بریتییە لە وتەو کار . وتەو کاری دڵان، وەوتەی زمان، وە کاری ئەندامەکانی لاشە ، بە مل کەچی زیاد دەبێت و بەسەر پیچی و یاخی بون کەم دەبێت، پلەو پایەی ئەم کارو وتانە لەلای خوای گەورە زۆر بەرزە، بەلاّم وتەو کاری دڵان لە هەموان بەهاتروەو بنچینەی هەموو وتەو کارەکانە ، وتەی دڵیش بریتییە لە (الإقرار والمعرفة والتصديق)، واتە: دان پیانان و ناسین و بەراست دانانی خوای گەورە. وەکاری دڵیش بریتی لە (الإنقياد والمحبة والخوف والرجاء ...الخ) واتە:مل کەچی و خۆشویستن و دڵ ترسان و هیوا پێ بوونی خوای پەروەردگار......هتد. وە

---

(١) ((مجموعة الفتاوى لابن تيمية)) (١٩٨ /١).

(٢) ((عقيدة السلف واصحاب الحديث ص٦٧ / العقيدة الواسطية ص٤٨)).

وتەی زمانیش بریتی‌یە لە (الشهادتان و قراءة القران والأدعية والأذكار.....الخ).

واتە : شایەتمان و خوێندنەوەی قورئان و هەموو نزاو پاڕانەوەیەك...هتد.

وە كاری ئەندامەكانیش بریتی‌یە لە (الصلاة والزكاة والصيام والحج....الخ).

واتە نوێژو زەكات و ڕۆژو وحەج و...هتد[٣].

مامۆستای پایەبەرز(ابن تیمیە) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە كتێبی (الإیمان)دا زۆر بەوردی باسی ئیمانمان بۆ دەكات كە بنچینەكانی بریتین لە وتەو كاری دڵان .

وە بنەمای هەموو وتەیەك لە (تصدیق)ە واتە: ڕاست گێڕی پەروەردگارە بۆ فەرمودەو فەرمانەكانی. وە بناغەی هەموو كارێكیش (محبة)ە، واتە: خۆشەویستی خوای گەورەیە.

وەدڵ ودەرون وەك پاشایەك وایە بە سەر ئەندامەكانەوە. وە پێویستە ئەوەی كە لەدڵدایە ڕەنگ بداتەوە لەسەر ئەندامەكانی لاشە وئەو وتەو كارانەی كە لە دڵدایە وتەو كاری ئەندامەكانی ببزوێنن

كەواتە پاڵنەری سەرەكی بریتی‌یە لە دڵ و دەرون . وە زۆر گرنگە كە بزانین ئەو كارانەی كە دڵ و دەرونیش دەبزوێنن سێ كاری گەورەن:

یەكەم: (خۆش ویستنی خوای گەورەیە واتە—المحبة—).

دووەم: (لێ ترسانە واتە—الخوف—)

سێیەم: (هیوا پێ بوونە واتە—الرجاء).

بەڵام لە هەموویان كاریگەر تر بریتی‌یە لە خۆش ویستنی خوای گەورە (محبة الله تعالى)[٤].

بەم شێوەیە پلەو پایەی خۆشەویستی خوامان بۆ دەركەوت كە چەند عیبادەتێكی گەورەیە ، جا بۆیە زۆر پێویستە لەسەر موسوڵمانان كە گرنگیو بایەخی تەواو بەم خۆشەویستی‌یە بدەن و دڵ و دەرونیانی پێ ڕازاوەو ئاوەدان بكەنەوەو، بزانن نیشانەكانی خۆشەویستی خوای گەورە بۆ بەندەكانی" وە نیشانەی خۆشەویستی بەندەكانی بۆ خوای گەورە كامانەن و، چ هۆكارێك دەبێتە هۆی زیاد كردن و گەشە پێدانیان و خۆشەویستی لە پێناوی خوادا چەند عیبادەتێكی گەورەیە.

(٣) ((فتح الباري)) (٧٣-١/٧٤).

(٤) ((مجموعة الفتاوى لابن تيمية)). (١/٧٣).

جابــە پشــتیوانیخــوایگــەورەئــەم باسانە لە داهـاتووی ئـەم بابەتـەدا ڕوون دەکەینەوە بەو هیوایـەی کـە هـەموومان سـود بـەخش بـبین و لەگـەڵ کـاروانی خۆشەویســــتانی پــــــەروەردگاردا هەنگاوەکانمان بەرەو پێش تر بەرین .

## نیشانەکانی خۆشویستنی خوای گەورە بۆ بەندەکانی

**١- خوای پـەروەردگار ئەو کەسە لە خـــۆ خـــەریک کـــردن بـــەدنیاوە دەپارێزێت.**

عن قتـاده بـن النعمـان أن رسـول الله ﷺ قال: ((إذا أحب الله عبدا حماه الدنيا ، كما يظل أحدكم يحمي سقيمه الماء..))(٥).

واتە: ئەگەر خوای گـەورە بەندەیـەك لـە بەنـدەکانی خـۆی خـۆش ویسـت لـە دونیـــای بـــڕاوەو پلـــەو پایـــەکانی دەیپارێزێـــت و لێی دوور دەخاتـــەوە و لەسەری گران دەکات کە چنگی بکەوێت، هـــەروەك چـــۆن یـــەکێك لـــە ئێـــوە نەخۆشـــەکەی دەپارێزێـــت لـــە ئـــاو خواردنەوە ، کاتێك کە ئاوەکە زیانی پێ بگەیێنێت (٦).

ئەم فەرمووده پیرۆزە سـەرنجدانێکی زۆر وردی پێویسـتە تـا بەهەڵـە لێی تـێ نەگەین"چونکە خەڵکی لـە ژیـانی دنیـادا سێ کۆمەڵن:

**کۆمەڵی یەکـەم:** ئەوانـەن کـە زۆر خۆیان بەو ژیانەوە ماندوو دەکەن و ئـەو ئەرکە پیرۆزەیان لە یاد چووە کە خـوای گەورە ئەوانی بۆ دروست کردووە ئەویش کـە پەرسـتنی خوایـە. خـوای گـەورە دەفەرموێت:

﴿ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴾(٧) .

واتە: شانازی و پێ خۆش بونتـان بـە فرەیی ماڵ و منـداڵ ئێـوەی خافڵانـد لـە ئەرکی پیرۆزی پەرستن تا بوونە میـوانی گۆڕەستان.

**کۆمەڵی دووەم:** ئەوانەن کـە ژیـانی دنیایان پشـت گـوێ خسـتووە و بەهەڵـە لەو ئایەت و فەرموودانە تێ گەیشتون کە لە نرخی ژیانی دنیا کەم دەکەنەوە.

**کۆمـەڵی سـێهەم:** ئەوانــەن ،کــە ڕێگـای ڕاسـتیان گرتۆتـە بـەرو خـوای گــەورە ڕینومــایی کــردوون و خۆشــی دەوێن. ئەوانەن کە :

* دەزانن ژیانی دنیا بڕاوەیە.
* ژیانی دنیا هەڵیان ناخەڵەتێنێ .
* ژیــانی دنیــا دەکەنــە توێشــو بــۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا .

(٥) ((صحيح .الترمذي ٢٠٣٧)) صحيح الجامع ٢٨٢.

(٦) ((تحفة الأحوذي))(٦:١٨٠).

(٧) (التكاثر:١ -٢)

* خۆشەویستنی خوایان لەناو دڵ و دەرونیان داناوە و ماڵی دونیاشیان بە دەستەوە گرتووە .

* زێدە ڕەوی ناکەن لەبەکارهێنانی ماڵی دنیا.

* ئەگەر لەماڵی دنیایان هەبوو بەخشندەن وئەگەر دەست کورتیش بوون ئەوا بە ئارامن.

* لە ماڵی دنیادا سەیری خوار خۆیان دەکەن، بەڵام لە عیبادەت و خواناسیدا سەیری بەرەوژورتر لە خۆیان دەکەن .

* ماڵی دنیا لە تاوان و هۆکارەکانی تاواندا خەرج ناکەن .

* خۆیان ماندوو ناکەن بە ماڵی دنیاوە ، بەڵکو ئەوندە بەدەست دەهێنن کە تەنها ژیانی پێ ببەنەسەر .

* لەبەر ماڵی دنیا هیچ کات ئامادەنین نوێژەکانیان بەجەماعەت لە دەست بدەن .

* دەزانن کەژیانی دنیا وەك سێبەری درەختێك وایە لە ڕۆژێکی گەرمدا و، ئەمانیش ڕێبوارێکن کەمێك لەبەریدا دەحەوێنەوە و پاشان بە جێی دەهێڵن.

**٢- هەروەها لەو نیشانانە . ئەوەیە کە خوای گەورە بەباشی بەڕیوەی دەبات.**

جا هەر لەمنداڵیەوە بەباشترین شێوە پەروەردەی دەکات و ئیمان و باوەڕ لە دڵیدا جێگیر دەکات و لەناو بەندەکانی خۆیدا هەڵی دەبژێرێت بۆ عیبادەتی خۆی [٨].

**٣- خوای گەورە نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی پێ دەبەخشێت .**

عن جابر بن عبدالله ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : (إن الله إذا أحب أهل بيت أدخل عليهم الرفق)[٩]. واتە: ئەگەر خوای گەورە هەر خێزانێکی خۆش ویست ئەوا نەرم ونیانی دەخاتە ناو ڕەوشت و ئاکاریانەوە.

**٤- خوای گەورە لەسەر زەویدا خۆشەویستی و لێڕازی بونی خەڵکی بۆ دادەنێت و مەیلی دڵانی بۆ ڕادەکێشێت .**

عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : (إن الله تبارك وتعالى إذا أحب عبداً نادى جبريل، إن الله قد أحب فلاناً فأحبه، فيحبه جبريل ، ثم ينادي جبريلُ في السماء إن الله قد أحب فلاناً فأحبوه ، فيحبه أهل السماء ويوضع له القبول في الأرض)[١٠].

واتە: ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆش ویست بانگی جبریل دەکات کە خوای گەورە فلان کەسی خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێت . جا جبریلیسش

(٨) ((مختصر منهاج القاصدين)). (٤٤١).
(٩) ((صحيح . صحيح الجامع / ١٧٠٤)).
(١٠) ((البخاري / ٧٤٨٥)).

خۆشـی دەوێـت . پاشـان جبریـل بـانگی ئەهلی ئاسمان دەكات كە خـوای گـەورە فـلاَن كەسـی خـۆش دەوێـت ئێـوەش خۆشتان بوێـت . جـا ئـەهلی ئاسمـانیش خۆشیان دەوێت .

پاشان خۆشەویستی و لێ ڕازی بـونی لەسەر زەوی بۆ دادەنرێت .

لـەم فەرموودەیـەدا خـوای گـەورە خۆشەویسـتی خـۆی و جبریـل و ئـەهلی ئاسمـان و زەوی بـە بەنـدەكانی خـۆی ڕادەگـەیێنێت و دڵیـان خـۆش دەكـات" چـونكە ئەگـەر بەنـدە زانـی كـە خـوای گەورە خۆشی دەوێت ئەو پەڕی شادمان وكامەران دەبێت و زیاتر هەوڵ دەدات كە خۆشەویسـتی خـوای گـەورە بـە دەسـت بهێنێت . وە ئەم خۆش حاڵی و پێزانینـە بۆ كەسانێكە كە ڕێگای ڕاستیان گربێتـە بـەرو هـەردەم لەگەڕانـەوە دابـن بـۆ لای خوای پەروەردگاریان [١١].

**٥- خـوای گـەورە تـاقی دەكاتـەوە بەچـەندەها نەخۆشـی و ناخۆشـی و لێ قەومانەوە ، هەتا وا لەو بەندەیە دەكات هـیچ تـاوانی پـێوە نامێڵێـت و پـاكی دەكاتەوە و لێی خۆش دەبێت ، ئەوەش بەمەرجێك ئەو بەندەیە خۆگرو ڕازی بێت** بەو بەشەو خۆی تورە نـەكات لـە كـاری پەروەردگاری .

عن أنس بن مالك ، عن رسول الله ﷺ – أنه قال: (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء ،وإن الله إذا أحب قوماً ابـتلاهم ، فمـن رضي فله الرضـا ومـن سـخط فلـه السخط)[١٢].

واتە: پاداشتی گـەورە وگـران لەگـەڵ بـەلاَو ناخۆشـی گەورەدایـە . و ئەگـەر خوای گـەورە كەسـانێكی خـۆش ویسـت ئەوا توشی بـەلاَو نارەحـەتیان دەكـات ، جا هەركەسێك ڕازی بێت و ئارام گرو خۆ ڕاگر بێت ئەوا خواش لێی ڕازی دەبیچت . وە هەركەسێكیش تورەو بێ ئارام بێت ئەوا خواش لێی تورشەدەبێت .

**٦- لەكاتی نزیكـی پـێش مردنیـدا خوای گەورە بە عیبادەتێكـەوە خـەریكی دەكات**

عن عمرو بن الحمق الخزاعي ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : (إذا أحب الله عبـداً عسّله ، فقيل : وما عسله ؟ قال : يوفق له عملاً صالحاً بين يدي أجله)[١٣] .

واتە: ئەگەر خوای گەورە بەندەیەكی خۆش ویست ئەوا هەنگویناوی دەكات .

---

(١١) ((فتح الباري))(١٣: ٥٦٤)

(١٢) ((صحيح سنن ابن ماجه))(٣٢٥٦).

(١٣) ((الحاكم [١: ٣٤٠] وصححه ووافقـه الـذهبي. سلسلة الأحاديث الصحيحه [١١١٤])).

بــه پێغەمبــەریان ﷺ وت : واتــای چیـیه ؟

فــەرمووی: خــوای گــەورە لــەکاتی مردنیدا بە کارێکی باش و عیبادەتێکەوە خەریکی دەکات .

ئەم فەرموودە پیرۆزە هانمـان دەدات بـۆ ئــەوەی هــەردەم لــە ئــەنجام دانــی عیبـادەت و کـاری باشـدا بـین ، چـونکە مــرۆڤ نازانێــت لــەچ کاتێکــدا و لــەچ شـوێنێکدا گیـانی لەدەسـت دەدات، وە هــەروەها هانمـان دەدات کــە هــەردەم هۆشیارو بەئاگابین کاتی خۆمان لـەتاوان و سەرپێچــی و یــاخی بونــدا بەســەر نەبەین، لەیادی مردن خۆمـان بـێ ئاگاو فــەرامۆش نەکــەین ، بــەڵکو هــەردەم مردنمـان لـەیاد بێـت و بـزانین کـە وەك رێبوارێــك وابــین بــەرەو مەبەســتێك کەوتوینەتـە رێ کـە رەزامەنـدی خـوای گەورەیە.

ئەمانە هەندێك بوون لەونیشانانەی کە نیشـانەن لەسـەر خۆشەویسـتی خـوای گەورە بۆ بەندەکانی .

جـا بەپشـتیوانی خـوای گـەورە لـە بەشـی دووەمـدا باسـی ئـەو نیشـانانە دەکەین کە بەڵگەن لەسەر خۆشەویستی بەندەکانی بۆ خوای پەروەردگاریان .

و الحمدلله رب العالمين



پاك كردنەوەی دەرون

# حاڵی دڵەکان وجۆرەکانی

نوسینی : دایکی ڕوەیدا «زریان ئەمین»..

گومانی تێدا نی یە کە ئادەمیزاد بۆ خوا پەرستن و عیبادەت خوڵقێنراوە ، هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئەم بونەوەرو زەوی و ئاسمانەی بۆ فەراهەم کراوەو ڕازاوەتەوە تا بتوانێت ڕۆڵی خۆی تێدا ببینێت و ئاوەدانی بکاتەوە ، ئەم دیدو تێڕوانینەش پوختەی دینی ئیسلامەو ڕاستی یەکی چەسپاوە و هەرکەسێك لەم ڕوانگەوە بڕوانێتە گرۆی ئادەمیزاد و ژیانی دونیاو ئەم دەوروبەرە ئەوا خۆی دۆزیوەتەوە و مانای هەموو شتێك وەك خۆی تێدەگات و هەنگاوەکانی بەرەو ڕاستەڕێ یەو خۆیشی ڕوو لە بەختەوەریە، ئەم عیبادەت و خواپەرستی یەش کورت هەڵنایەت لەسەر نوێژ و ڕۆژوو بەتەنها (کە ئەمە بۆچونی زۆرێك لەخەڵکی یە) بەڵکو ماناکەی زۆر لەمە فراوانترە و زانایانی ئیسلام بەم شێوەیە پێناسەی دەکەن: ( العبادة اسم جامع لكل ما يحبه الله ويرضاه من الأقوال والأعمال الظاهرة والباطنة ).

واتە: پەرستن ناوێکی کۆیە بۆ هەموو کردارێك و گوفتارێك کە خوا پی ی خۆشەو پی ی ڕازی یە جا ئەم کردارو گوفتارانە دەرەکی بن یاخود ناوەکی .

ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت درێژەی پێ بدەین و ڕوونی بکەینەوە ئەم دابەش بوونەی عیبادەتەکانە بۆ دوو بەش دەرەکی و ناوەکی کە بەشی دووەمیان دەوری سەرەکی و گرنگ دەبینێت لە دروست بوونی پەیوەندیەکی پتەوو نەپچڕاوی بەندەکان بە پەروەردگاریانەوە، هەر لە بڕواهێنان و یەکتاپەرستن و بێ گومانی (الیقین) و پشت بەستن بە خواو گەڕانەوە بۆ لای ئەو لە کاتی پێویستی داو، تەوبەکردن و، ترسان و تکاو... هتد دەگرێتەوە.

کە ئەمانەش هەموویان پەیوەستن بەدڵەوە و زۆربەشیان تایبەت مەندن پی ی واتە تەنها بە عیبادەتی دڵ دەژمێردرێن ، خۆ ئەو پەرستنانەش بە ئەندامەکانی تر ئەنجام دەدرێن مەرجی وەرگرتنیان لای خواو، پوختی و ناپوختیان لە دڵەوەیە . ئایا تا چ ڕادەیەك لە نییەت و نیهادێکی پاکەوە

سەرچاوە دەگرن ؟ یان تا چ رادەیەك دڵ ئامادەیە لە گەڵیاندا .

بەم جۆرە دڵی مرۆڤ مەڵبەندی بڕیارەو جێگەی کۆبونەوەی بیروباوەڕی خاوەنەکەیەتی ، دەوری ئەم دڵە بەسەر لاشەو ئەندامەکانی تردا دەوری پادشاو گەورەییەك دەبینێت بەسەر سەربازەکانیدا ، پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە دەفەرموێت (... ألا وإن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله و إذا فسدت فسد الجسدُ كلـه ألا وهـي القلب)[1].

ابن رجب ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەشەرحی ئەم حدیثەدا دەفەرموێت (تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە باشی هەڵسوکەوتی مرۆڤ بە ئەندامەکان و دوورکەوتنەوەی لە حەرام و خۆپارستنی لەو شتانەی کە گومانی تێدایە بەپێی باشی دڵەکەیەتی ، ئەگەر ئەو کەسە خاوەنی دڵێکی ساغ بێت و جگە لە خۆشەویستی خواو ترسان لە تورەبونی ئەو هیچی تری نەگرتبێتە خۆ ئەوا ئەوکاتە هەڵسوکەوت و کردەوەی ئەندامەکانیش هەموویان باش دەبن ، لە ئەنجامدا ئەوکەسەش پارێزراو دەبێت لەحەرام)..

وە ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو واتە دڵێکی خراپی هەبوو دیلی حەزو ئارەزوەکانی دەبێت با ئەو حەزو ئارەزوانەش مایەی تورە بوونی خودابن ، ئەوکاتەش هەڵسوکەوتی ئەندامەکانیش هەمووی خراپدەبێت و خاوەنی ئەم جۆرە دڵەش روو لە هەموو تاوانو گوناهێك دەبێت بەپێی چەندێتی ویستی دڵەکەی بۆ ئەم گوناهە[2]

ئەم فەرموودەیەش هەموو ئەکەسانە بەدرۆ دەخاتەوە کە ئەنجامدەری چەندین تاوانن وەك ((چاو نەگرتنیان لەحەرام و گوێ گرتنیان لەحەرام و نەپاراستنی زمانیان لە غەیبەت کردن و تێکەڵ بوونی پیاو لەگەڵ ئافرەتان .....هتد)). هەموو ئەم خراپەکاریانە بەبیانوی دڵ پاکیەوە دەکرێت .

دوا بەدوای روون بوونەوەی ئەم راستیانە دەردەکەوێت کە گرنگی دان بە پەروەردەکردنی دڵ و دەرون هەنگاوی یەکەمە بۆ ئەو کەسانەی هۆگری حەق و راستین و دەیانەوێت بەرەو رازی بوونی پەروەردگاریان بڕۆن.

ئەمەش کارێکی ئاسان نیە ، چونکە لەو رۆژەوە شەیطانی نەفرەت لێکراو دوژمنایەتی خۆی راگەیاندلەگەڵ

(١) (جزء من حديث رواه البخاري)(١/١٢٦) ومسلم (٢٨/٢٧).

(٢) (جامع العلوم والحاكم)(١/٢٨٤-٢٨٥).

بەندەكانی خودا ،بە دوای دەرفەت دا دەگەڕێ و هەمیشە لە سەنگەردایە بۆ چاندنی تۆوی نەخۆشی لە دڵەكاندا و لاڕێ بوونی خاوەنەكانیان .

ئێمەش لەبەر گرنگی و پێویستی ئەم باسە هەوڵ دەدەین لە ڕێگەی ئەم گۆڤارەوە بۆ چاو ڕۆشن كردنەوەی موسوڵمانان و شارەزا بوونی زیاتر هەرجارەی بە بابەتێك پێشكەش بكەین بەڵكو بەیارمەتی خوای بالاَ دەست و پاشان گرتنە بەری ئەو هۆیانەی كە دەبنە هۆی ساغ بوونەوەی دڵەكانمان بكەوینە بەر ئەو مزگێنییە خواییەی كە پەیمانی داوە بە بەندە دڵسۆزەكانی و دەفەرموێت:

[إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ ][3] .

واتە/ ئەو بەندانەی كەمن ڕێنمایم كردوون و بەپاكی من دەپەرستن ئەوە (شەیطانی) تۆ زاڵ نابی بەسەریاندا.

## جۆرەكانی دڵ

### جۆری یەكەم: دڵی ساغ و زیندو و (القلب السليم).

ئەم جۆرە دڵەیە كە خوای گەورە لە بارەیەوە دەفەرموێت :

[يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ . إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ][4]

واتە/ لە ڕۆژی دوایی هیچ شتێك بەندەكانی لە سزای خوایی ناپارێزێت نەماڵ و سامان و وەنە منداڵ و كەس و كار نەهیچ شتێكی تر، كە ئەمانە مایەی دڵخۆشیو پشت ئەستوری خەڵكین لە ژیانی دوونیادا ، تەنها ئەو كەسانە نەبێت بەدڵێكی ساغ و سەلیمەوە دەگەڕێنەوە لای پەروەردگارە كەواتە با بزانین دڵی ساغ كامەیەو چۆنە:

ابن سيرين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت (دڵی ساغ ئەو دڵەیە كە بزانێت بەتەنها (خودا) شایانی پەرستنەو خودایەكی حەقەو، وە ڕۆژی دوایش بەبێ گومانی دێت، و وە بڕوای وابێت و بێ گومان بێت كە خوای بالاَ دەست ئەوەی لەناو گۆڕەكاندایە زیندوویان دەكاتەوە)[5].

ئەم بیرو باوەڕانەش سە(سەرچاوەی) هەموو خێرێكن تا وا دەكەن لەو دڵە كە سەلامەت بێت لە هەموو حەزو ئارەزویەك كە پێچەوانەبێت لەگەڵ شەرعی خوادا ، وە لەهەموو گومانێك (شبهة) كە دژ بێت لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی كە لە دین دا هەواڵیان پێ دراوە ، ئەو كاتەش هەموو مەبەستێكی ئەو دلانە بۆ لای خوا دەبێت

(٣) (سورة الحجر:٤٢).

(٤) (سورة الشعراء:٨٩).

(٥) (تفسير ابن كثير )(٣/٣٥٢ ).

و كردەوەكانيشى تەنها بۆ ڕەزامەندى ئەو دەبن ، هەر كەسێك خۆشى بوێت لە بەر خوايە وەڕقى لە هەركەسێك بێت لە پێناوى ئەودايە، لە هەموو كردارو گوفتارێكدا پێغەمبەر ﷺ بە پێشەواى خۆى دەزانێت و شوێن پێى ئەو هەڵدەگرێت .

**جۆرى دووەم : دڵى مردوو :**

**( القلب الميت )**

ئەو دڵەيە كە لە ژێربارى قورسى تاوان و خەتادا وشك هەڵهاتوەو هيچ ژيانێكى تێدا نىيە.نە پەروەردگارى دەناسێت ، وەنە دەيپەرستێت ، نازانێت كامەيە حەڵاڵ و كامەيە حەرام ، نوقمى ئەم خۆشىو لەزەتە كاتىيانەى دونيا بووەو وا نازانێت لە دواى ئەمەوە شتێكى تر هەبێت لە ئەنجامى دوور كەوتنەوەى لە بەندايەتى كردن و يادى خوا ،بوەتە بەندەى هەواو ئارەزوەكانى هەروەك خواى گەورە لە قورئان دا دەفەرموێت:

[ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ. أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً ][6]

واتە ئەوكەسەى كە هەواو ئارەزوى نەفسى خۆى كردووە بە پەرستراو (إلە)ى خۆى وە لە داخوازى ئارەزوەكانى دەرناچێت و سەرپێچى لەفەرمانەكانى ناكات.

تاواى لێ دێت پەردەى تاوان و گوناح داى دەپۆشێت و بە هيچ شێوەيەك هەقى پێ ناگات و نايبيستێت بەمەش ناوەستێ لەئاكامدا ئەم دلانە هەڵ دەگەڕێنەوەو هەق بە ناحەق و ناهەق بەهەق دەبينن ، باشى بە خراپ و خراپيش بە باشە دەزانن ، ئەم جۆرەشيان بەوە دەناسرێتەوە كە لەكاتى ئەنجامدانى تاوان و حەرام دا ناچڵەكێت و هەست بە ئازار ناكات هەروەك وتراوە ( ما لجرح بميت إيلام).

واتە: مردوو هەست بە ئازارى برين ناكات.

بە پێچەوانەى دڵى زيندوو كە هەستيارەو بە سەرپێچىو تاوان توشى ئازارو نارەحەتى دەبێت ، ئەمەش پاڵنەرى دەبێت بۆ تەوبەكردن و گەڕانەوە وەك خواى گەورە دەفەرموێت:

[ إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ ][7] .

واتە: بەڕاستى ئەو كەسانەى كە لەخوا دەترسن و كار بەفەرمانەكانى دەكەن.ئەگەر تووشى وەسوەسەى شەيتان هاتن كە فەرمانيان پێ بدات بە

(٦) (سورة الفرقان:٤٣).

(٧) (سورة ألأعراف:٢٠١).

كـاری خـراپ ئـەوان كاتێـك كـە بـیر لـە گەورەیی خوا دەكەنەوە دەزانن كە ئـەم فەرمانـە فـەرمانی شـەیتانەو سەرپێچـی دەكەن و بە ئاگادێنەوە[٨].

وە لەبارەی ئـەم دڵـە مردوانـە خـوای گەورە دەفەرموێت :

[ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ ][٩] .

بەدەلیلی ئەم ئایەتە پیرۆزە خـاوەنی ئەم دلانـە لـە ڕۆژی دا پـەردە پۆشـن لـە پەروەردگاریان هـەروەك چۆن لـە دونیـا پەردە پۆشن لە یادی ئەو.

### جۆری سێهەم : دڵی نەخۆش

#### (القلب المريض)

ئەم جۆرە دڵە دەژی بەلاَم بەناسـاغی و ناتەواوی ...دوو مـاەی تێدایـە ،جـارێ بەولا دەیباو جارێ بەملا ، ژیانی ئەو دڵە ئەوەیە خوای گـەورەی خـۆش دەوێـت و بـاوەڕی پـێیـەتی ،وە هـەوڵ دەدات بـۆ ڕازی كردنــــی هــــەروەها نەخۆشـــیو ناسـاغییەكەی لەوەدایـە دونیـای خـۆش دەوێـت و هـەوڵ دەدات بۆسـەر خسـتنی ئارەزوەكانی ، لە نێوان دوو بانگەوازدایە ، بـانگی ئیمـان و بـانگی كـوفر ئـەویان بـانگی دەكـات بـۆ لای خـواو پێغەمبـەرو ژیـانی دوا ڕۆژ ، ئـەوی تریشـیان بـانگی دەكات بۆ سەرپێچـی و خۆشـی دوونیـاو بێ ئاگابوون ، وە كام لەم دوو بانگەوازە زاڵ بـوو بەسـەریدا دەبێتـە ئـەهلی ئـەو لایەنە .

ئەو نەخۆشانەشی توشی دڵ دێن دوو شێوەن :

١- نەخۆشـییەكانی شەك و گومـان و دوودڵی (أمراض الشبهات) .

بەڵگـــەشمان بـــۆ ئـــەم جـــۆرە نەخۆشییانە) ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

[ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ][١٠] .

واتـە: دوو ڕووان دڵیـان نەخۆشـە بـە نەخۆشــــی شــــەك و گومــــان و ڕەت كردنـەوەی هـەق لـە بەرامبـەر ئەمەشـدا خـوای گـەورە بـاری دەردیـان گـرانتر دەكـات بەچەسـپاندن و سەرســەختی دینەكەی .

٢- بەشـی دووەمیـان هـەموو ئـەو نەخۆشییانە دەگرێتەوە كە دەكەونە ژێر سێبەری حەزو ئارەزوەكانـەوە (أمـراض الشـهوات) ئـەم جۆرەشـیان بـەم ئایەتـە پیرۆزە تەفسیر كراوە: [ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ][١١]

---

(٨) (زبدة التفسير).

(٩) (سورة المطففين:١٤).

(١٠) (سورة البقرة:١٠).

(١١) (سورة الأحزاب :٣٢).

واته : ئەی ئافرەتانی بڕوادار لە کاتی گفتوگـــۆدا دەنگتـــان نـــەرم و ناســـك مەکەنەوە چونکە ئـەو کەسـەی کـە دڵـی نەخۆشە تەماع تێکردنتان دەبێت و دڵـی پێتانـــەوە پەیوەســـت دەبـــی! (طمـــاع) دەبێت .

جـــــۆری یەکـــــەمیان (أمـــــراض الشـبهات)دەبێتـە هـۆی گەنـدەڵ بـوونی عەقیـــــدەو بیروبــــاوەڕ وە جـــــۆری دووەمیان(أمراض الشهوات) دەبێتـە هـۆی شێوانی ویست و ئیرادەی مرۆڤ .

چارەسـەریش بـۆ هـەردوو جۆرەکـە تەنها قورئان و بەرنامەی خوایە،

کە ئەوەندە بەڵگەو ڕێ ڕوونی تێدایە مرۆڤ بتوانێت هەق لە ناهەق جیابکاتـەوە و هـەموو شـتێك لەسـەر شـێوەی خـۆی ببینێـت، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ڕاسـت بوونەوەی هەسـت و بـۆ چـون و زانسـتی مرۆڤ، وە ئەوەندەش پەندوو **ئامۆژگاریو کار لە جێی خوای گەورەی تێدایـە** .بـە ترساندن و هاندان و دونیا بەکەم گرتن و شیرین کردنی ئەو پاداشتەی کە لای خوا هەیە وا دەکات لە بەنـدەکانی پارسـەنگ وەربگـــرن و زێـــدەڕەوی نەکـــەن لـــە جێبەجێ کردنی حەزەکانیاندا.

خوێنـــەرانی بـــەڕێز موســـوڵمانانی خۆشەویست ئیستا کـاتی ئـەوە هـاتووە کـە هەریـەکێك لـە ئێمـە بڕوانێتـە دڵـی خـۆیو لێی ورد ببێتـەوە بـۆ ئـەوەی بزانێـت دڵەکـەی لـە کـام جـۆرەو بـەکام دەردەوە دەناڵێنێـت ، ئەگـەر دڵێکـی نەخۆشە هەوڵ بدات بـۆ چارەسـەرکردنی پێش ئەوەی بگاتە خزمەت پەروەردگاری بـەدڵێکی نەخۆشـەوە وە ئەگـەر دڵێکـی سـاغە بـا ئـەم سـاغ و سـەلامەتیيە بپارێزێت هەتا مردن .

وەئەگەر دڵێکی مردووە ئەوا با بزانێت کـە خـوای گـەورە مردووەکـان زینـدوو دەکاتەوە وەك دەفەرموێت

[ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ][١٢] .

والحمد لله رب العالمين

**سەرچاوەکان :**

١- البحـر الرائـق مـن الزهـد والرقائق.
٢- تفسير ابن كثير .
٣- الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي ابن قيم الجوزية.

---

(١٢) (سورة الحديد:١٧).

# ئاگاداركردنەوەی ئافرەتان لە تاوان وسەرپێچی‌یەكان

ئامادەكردنی: دایكی ئالاء...

خـوای گـەورە دانـەری یاسـاكان و سنورەكانە كە بەختەوەری مرۆڤی تێدایە لـە دونیـا و قیامەتـدا ، وەلـە پەیوەسـت بـوون بەسـنوری خـوای گـەورە و نەبەزاندنی سەربەرزی و خاوێنی و پاكژی و نـەفس بـەرزی مرۆڤایـەتی تێدایـە ، هـەروەها بـەرزی وپاراسـتنە لەڕەوشـت نزمی و خراپی و ئاشوبی و تاوان ، خوای گەورە دەفەرمێت:

[ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ][1]

واتە : خوای‌گەورە بۆیە بەم شێوازە ئامۆژگاریتـان دەكـات تـاوەكو هـیچ تاوانتان لەسەر نـەهێڵێت ئـەی خێزانـانی پێغەمبەر (ﷺ) وەتا پاك تان بكاتەوە لە هەموو پیسی و تاوانێك.

لەبەر گەورەیی پلە وپایـەی ئـافرەت لە كۆمەڵگای موسـڵماناندا و پاراسـتنیان لـە سـەر پێچـی یـەكان ئاگاداریـان دەكەینـەوە لـە چـەند سەرپێچی‌یەك تـا خۆیانی لـێ بپـارێزن وە ئەگـەر كەوتونـە ناوی یەوە و توشی بوونە ، ئـەوا دەسـت بـەجێ وازی لـێ بهێـنن و تۆبەبكـەن و بگەڕێنەوە لای خوا چونكە خوای گـەورە لێخۆشـبووە، هـەروەها ئاگـاداری خوشكانی موسڵمانی بكات و بەرهەڵستی بكات لە كەسێك كە شتێك لەم سەرپێچی یانە جێبەجێ بكات . داواكارین لە خوای گەورە نیەت و وتە و كردەوەكانمان چاك بكات و تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەوبێت.

**سەرپێچی یەكان لە بیروباوەڕدا**:

١–چون بـۆ لای جادووگـەرو فاڵچـی و بـاوەڕكردن پێیـان ، بۆنەخۆشـی یـاخود چاووزارو یاخود كردنەوەی سیحر یاخود هەرشتێكی تر ،پێغەمبەر (ﷺ) ئاگـاداری كردوینەتەوە لەچونەلایان ودەفەرموێت:

( من أتى عرافاً فسأله عن شيء لم تُقبل له صلاة أربعين يوماً )[2]

---

(١) (الأحزاب: من الآية٣٣).

(٢) رواه مسلم: ٢٢٣٠.

واتــه:هەركەسـێك بچـێتە لای فاڵچـی وپرسیاری لێ بكات دەربارەی شتێك ئەوا چـــل ڕۆژ نوێـــژی لێ وەرناگیرێـــت، وەدەفەرموویێت :

(من أتى كاهناً فصدقه بما يقول فقــد كفر بما أنزل على محمد)[٣] .

واتــە : هــەر كەســێك بچـێتە لای فاڵچییەك و باوەڕی پـێ بكـات لـەوە ی كـە دەیڵـێن ئـەوا كـوفری كـردووە بـەو قورئانەی كە دابەزیوە بۆسەر محمد(ﷺ).

٢–خۆ پـەیوەسـت كـردن بـە ڕۆژێكـی دیـاری كـراوەوە بـۆ سـەردانی كردنـی گۆڕسـتان وەكـو ڕۆژانـی پێـنج شـەممە یـاخود ڕۆژانـی جـەژن ، هـەروەها خـۆ سـازدان و سـەفەر كـردن بـۆ سـەر گـۆڕ ئەگـەر گـۆڕ پێغەمبـەریش بێـت (ﷺ) چـونكە دەفـەرموێت: (لعـــن الله زوارات القبور)[٤]

واتە :خوای گەورە لەعنەتی كـردووە لەوئافرەتانـەی سـەردانی گۆڕسـتانانیان كردووە بەخونەریت بەڵام ئەگەر ئـافرەت بە شێوازێكی شەرعی بچێت بۆ سـەردانی گۆڕستانیان و بـۆ بیركردنـەوەی مـردن و قیامـەت ، بـەبێ تایبـەت كردنـی كـات و ڕۆژێـك ئـەوا دروسـتە چـونكە سـەرەتا پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی كرد موسـڵمانان سـەردانی گۆڕسـتان بكـەن ، بـەڵام لـە پاشاندا فەرموی سەردانی بكـەن چـونكە یادی قیامەتتان دەخاتەوە.

٣–هـاواركردن و لـەخۆدان و یەخـە دڕاندن لـە سـەر مـردوو. پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(ليس منا من لطم الخدود وشق الجيوب ودعا بدعوى الجاهلية )[٥].

واتە: لەئێمە نـی یـە كەسێك كـە لـە ڕوومەتی خۆی بدات و یەخەی دابـدڕێت، هاواری نەفامی بكات وەكو چۆن لە پێش ئیسلام دەكرا .وەدەفەرموێت :

( النائحة اذا لم تتب قبل موتها، تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب)[٦].

واتە : ئافرەتی هاواركەر ئەگەر پێش مردنی تۆبـە نـەكات ئـەوا ڕۆژی قیامـەت هەڵدەسـێت و پۆشـاكێكی لـە مســی تــواوەی ئــاگرینی لـــە بـــەردەكرێت وقەڵغانێك لە (جرب).

٤–زۆركردنی هەندێ لـە ئافرەتـان لـە مێردەكانیـان بـۆ هێنـانی خزمـەت كـار و پەروەردە كەری ناموسڵمان بەڵكو جاری وا هەیـە ئەمـە بەمـەرج دادەنـێن لـەكاتی مارەبڕینـدا ، و پاشـان پـەروەردەكردنی منداڵـەكانیان پیدەسـپێرن كـە ئەمـەش

(٣) الترمذي (١٣٥)، وصححه أحمد شاكر (١/٢٤٤).

(٤) رواه الترمذي:١٠٥٦ وابن ماجه ١٥٧٦ وغيرهما.

(٥) (متفق عليه ).البخاري:١٢٩٧، مسلم: ١٠٣

(٦) رواه مسلم : ٩٣٤.

چەندەها سەرەنجامی خراپی بەدواوەیە لەسەر بیرباوەڕ و ڕەوشتی منداڵەکان کە شاراوە نی یە لەلای خاوەن عەقڵ .

٥-ناڕەزایی و بێ ئارامی هەندێ لە ئافرەتان لەکاتی توش بوونیان بە کارەساتێك یان بەلآیەك و دوعا کردنیان لە خۆیان،پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

[لايتمنين أحدكم الموت لضر نزل به فان كان لابد متمنيا فليقل: اللهم أحييني ماكانت الحياة خيراً لي وتوفّني اذا كانت الوفاة خيراً لي ][7].

واتە : کەس لەئێوە ئاوات نەخوازێت بە مردن لەبەر زیان و ناخۆشی یەك کەرووی تێکردووە ، ئەگەر هەر دەبوایە ئاواتە خوازی مردن بێت ئەوا بابڵێت : خوایەئەگەر ژیان باشترە بۆم ئەوا بمژێنە وەئەگەر مردن باشترە بۆم ئەوا بمرێنە٠

## سەرپێچی یەکان لە پایەکانی ئیسلام

٦- دواخستنی نوێژەکان لە کاتەکانیاندا، بەتایبەتی لەکاتی دەرچون و شەونخونیو دواکەوتن لەنوستن کەدەبێتە هۆی دواخستنی نوێژی بەیانی بۆ پاش خۆرهەلآتن ،وەپێغەمبەر یش (ﷺ)دەفەرموێت:

( إنه أتاني الليلة آتيان ،و إنهما ابتعثاني ، وإنهما قالا لي:انطلق وإني انطلقت معهما، وإنا أتينا على رجل مضطجع ورجل قائم على رأسه بيده صخرة ، واذا هو يهوي بالصخرة لرأسه فيثلغ رأسه فيتدهده الحجر هاهنا فيتبع الحجر فيأخذه فلا يرجع اليه حتى يصبح رأسه كما كان ثم يعود عليه فيفعل به مثل ما فعل به المرة الأولى ،قال : قلت لها:سبحان الله ما هذان؟ قالا لي :إما إنا سنخبرك ،أما الرجل الأول الذي أتيت عليه يثلغ رأسه بالحجر فإنه الرجل ياخذ القرأن فيرفضه وينام عن الصلاة المكتوبة][8]

واتە : ئەم شەو دووکەس هاتن و لەخەو هەڵیانساندم ،پێیان ووتم :برۆ ،منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتم،تاچوینە سەر پیاوێگ راکشابوو ،وە پیاوێکش لەژوور سەری یەوە راوەستابووبەردی بەدەستەوەبوو، بەردەکەی تێ دەگرت و دەیدا بەسەریدا وسەری دەشکاندو پاشان هەتا بەردەکەی هەلدەگرتەوە تا دووبارە بیداتەوە بەسەریدا سەری وەکو خۆی لیدەهاتەوە و چاك دەبووە و بەردەوام بەم شێوەیە سزای دەدا

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت:پێیانم ووت : پاك وبێ گەردی بۆخوای گەورە ئەم دووانە کێ بوون؟پێیان وتم: لە پاشاندا پێت دەڵێین، پیاوی یەکەم کە سەری دەشکێنرا بەبەرد ئەوە پیاوێکە کە

(٧) (متفق عليه ).البخاري: ٦٣٥١ ومسلم ٢٦٨٠.

(٨) (البخاري).

قورئــانی وەرگرتــوە وپاشــان ڕەتــی دەکاتــەوە ، وە دەخــەوێت لــە نوێــژی فەرزداو نایکات .

٧-بایەخ نەدان بەدەرکردنی زەکاتی مــاڵو ئەوخشــڵ و زێــڕەی کــەئافرەت هەیەتی و ساڵێکی بەسەردا تێ دەپەڕێت و گەیشتۆتە ئـەو سنورەی کـەزەکاتی تیدایە ،خوای گەورە دەفەرموێت :

(والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم .يوم يحمى عليها في نار جهنم فتكوى بها جباههم وجنوبهم وظهورهم هذا ما كنزتم لأنفسكم فذوقوا ما كنتم تكنزون)(٩).

واتــە :ئــەو کەســانەی کــەزێرو زیــو کۆدەکەنــەوە و نایبەخشــن لــە ڕێگــای خــوادا (زەکــاتی لــێ دەرناکــەن ) ئــەوا موژدەیسزایەکی بە ئێش و ئازاریان پــێ بدە،ڕۆژی قیامـەت زێڕو زیوەکـەیان بـۆ داخ دەکرێـت لـەئاگری دۆزەخـدا ، نــاو چەوان و لایـەکانیان و پشـتیانی پـێ داخ دەکرێـت و پێیــان دەوترێت،ئەمــە ئــەو کەنزەیــە کــە بۆخۆتانتــان هــەڵگرتبوو ، دەی بچێژن سزای کۆکردنـەوە و زەکـات نەدان لێی.

٨-کەمتــەر خــەمیو بایــەخ نــەدانی هەنــدێ لـــە ئافرەتــــان بەهاوســــەر و منداڵـەکانیان و ئامۆژگـاری نـەکردنیان ، کاتێـك کـە کەمتەرخــەمی دەکــەن لــە جێبەجێ کردنیفەرزەکاندا وەئامۆژکاری نەکردنیان وبەرهەڵستی نەکردنیان، وەکو پێشت گوێ خستنی نوێژی جەماعەت لـە لایــەن هاوســەرەکەی و کوڕەکانییــەوە ،وەپشــت گوێخســتنی کچــەکانی کاتێـك کـــەپێ دەگـــەن لەجێبـــەجێ کردنـــی فـەرزەکان و ڕۆژوو. وە جگـە لەمـە، لـە پێویستییەکانی تر.

## سەرپێچییەکان لە پۆشاك و خۆداپۆشیندا:

٩-پـەیوەســت نــەبون بــە پۆشــاکی شەرعی داپۆشەری هەموو لەش، لـەکاتی دەرچون لەماڵدا هەروەها لـە بـەرکردنی جـل وبــەرگی تەسـك وتــەنك وکــورت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفـەرموێت (...ونســاء كاسيات عاريات ...لا يدخلن الجنة و لا يجدن ريحها ، وإن ريحها لتوجد من مسيرة كذا وكذا)(١٠)

واتــە :ئافرەتــانێکی پۆشــتەی ڕووت (جلـی لەبـەرە بـەڵام ڕووتـە چونکە یـان تەسـکە یـان تەنکـە یـان کورتـە) ئەمانـە ناچنە بەهەشتەوە، وەبۆنیشی ناکەن کە لەدوریچلساڵڕێبۆنیبەهەشتدێت.

١٠-شــوێن کــەوتنی مۆدێـل لــەجل و بــەرگ و قــژ بەردانــەوەو قــژ بــڕین و

(٩) (سورة التوبة:٣٤ ، ٣٥).

(١٠) رواه مسلم ٢١٢٨ .

ئامێرەکانی جوانکاری و گرنگی پێ دراوە ئافرەتی یەکان، کە ئەمەش ون کردنی ناسنامەی ئافرەتی موسڵمانی تیدایە وەلاوازی یە بۆ کەسایەتییەکەی.

## سەرپێچییەکان لەماڵ وخێزانداریتیدا

١١. ڕەخنەگرتن و بەرەنگای بوونی ئافرەت لەهێنانی زیاتر لە ژنێك لە لایەنی پیاوەکەیەوە و دژایەتی کردنی و ڕازی نەبوونی ، خوای گەورە دەفەرموێت :

[وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا](١١)

واتە : کاتێك کە خوای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ) بڕیار لە سەر شتێك دەدەن هیچ باوەڕدارێکی ژن یا خود پیاو بۆیان نییە لەم بڕیارە دەرچن وبڕیارێکی تر هەڵبژێرن. وە هەر کەسێکیش سەرپێچی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکات، ئەوا گومڕا بوونێکی ئاشکرا گومڕا بووە و لەرێگای ڕاست دەرچووە .

١٢-گوێرایەڵی نەکردنی مێرد و وەڵام دانەوەی بەتوندی وبەرزکردنەوەی دەنگ لە رویداو بەرهەڵستی کردن و دان نەنان بەچاکەو ئیشە جوانەکانیو گلەیی کردنی لێی بەبەردەوامی بەهۆ، یاخود بەبێ هۆ.

پورێکی حصینیکوڕیمحصن دەفەرموێت:

(أتيت رسول الله (ﷺ) في بعض الحاجة، فقال : أي هذه أذات بعل ؟ قلت: نعم ، قال كيف أنت له ؟ قالت ما آلوه ، إلا ما عجزت عنه،قال :أين أنت منه؟ فإنما هو جنتك ونارك)(١٢)

واتە : دەفەرموێت : هاتمە لای پێغەمبەریخوا (ﷺ) بۆ هەندێ پێویستی خۆم، ئەویش فەرموی:

ئەمە کێیە ، ئایا مێردت هەیە ؟

وتم :بەڵێ،

فەرموی: تۆ چۆنی بۆ مێردەکەت؟.

منیش وتم: کەمتەرخەمی ناکەم مەگەر لە توانامدا نەبێت .

فەرموی: تۆ لە چ ئاستێکی گوێرایەڵی ئەودایت ؟ ئەو بەهەشت ودۆزەخی تۆیە، واتە گوێرایەڵیت بۆ ئەو فەرمانانەی کەبێ شەرعی نین هۆی چونە بەهەشتتە،وە سەرپێچی وکەمتەرخەمیشت هۆی چونە دۆزەختە !. وە دەفەرموێت :

(لو كنت آمرُ أحداً أن يسجد لأحد لأمرت المرأة ان تسجد لزوجها)(١٣)

واتە: ئەگەر من فەرمانم بەکەسێك بکردایە کە کرنوش بۆ کەسێکی تر ببات ئەوا فەرمانم بەئافرەت دەکرد کە کرنوش بۆ مێردەکەی بەرێت .

(١١) (الأحزاب:٣٦)

(١٢) (رواه النسائي ).

(١٣) رواه الترمذي و غيره وصححه الألباني في الإرواء:١٩٩٨

١٣- دیـــاری کردنـــی وەچـــەو کەمکردنەوەی منالّ بوون بەبیّ هۆیەکی گـرنگ کەدەبێتـە هـۆی کەمبوونـەوەی ئومـــەتی ئیســـلام، پیغەمبـــەریش(ﷺ) دەفەرموێت:

(تزوجوا الودود الولود؛ فإني مكاثر بكم الأمم )[١٤]

واتـــە : ئافرەتێـــك بخـــوازن كـــە خۆشەویست و مندال بـوو بێـت ،چونكە من شانازی بە زۆریتانەوە دەكەم بەسـەر ئوممەتانی ترەوە لەڕۆژی قیامەت.

١٤-گرنگی نەدان بە پەروەردەكردنی منداڵ ، پـەروەر كردنێكـی موسـڵمانانەی پـاك لـە هـەموو خراپـیو ناشـیرینیەكی وەكو ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جـەژنی لـە دایك بوون، هـەروەها لەبـەر كردنـی ئـەو جل و بەرگانەی كە وێنەو خاچی پێوەیە، وە فێركردنــی منــداڵان بــۆ ئامێرەكــانی مۆسـیقا، وە لــە لایــەكی تــرەوە هــان نەدانیان بۆ نوێژەكان لـە مزگەوتـدا و بـۆ قورئان لەبەر كردن و پەیوەسـت كردنـی بیرو بۆچونیان بە ئیسلامەوە. پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها )[١٥] .

واتـــــە : ئـــــافرەت شـــــوان و سەرپەرشـتیارە لـە مـاڵی مێردەكەیـدا و لێپرسراوە لـە پـەروەردەكردنی منـداڵ و سەرپەرشتی كردنیان .

١٥- پشــت گــوێ خســتنی هەنــدێ ئافرەتـــان و گـــوێ نـــەدانیان بـــە بەڕێوەبردنی ئیش و كاری ناوماڵ لە پاك و خاوێنی و شوشتن و چێشت لێ نان ،

هـەروەها پشـت گـوێ خسـتنی خـۆ ڕازاندنەوە بۆ مێرد و جێ بەجێ نەكردنی مافەكانی .

١٦- داواكردنی تەڵاق لە مێـرد بـەبێ هـیچ هۆیـەكی شـەرعی، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت:

(أَيُّما امرأة سألت زوجها الطلاق مـــن غير ما بأس، فحرام عليها رائحة الجنة )[١٦]

واتە: هەر ئافرەتێك داوای تـەلاق لـە مێردەكـەی بكـات بـەبێ هـیچ هۆیـەكی شەرعی ئەوا بۆنی بەهەشـت حەرامـە لـە سەری .

١٧-زۆركردنی ئافرەت لە مێردەكـەی بـە كرینـی ئـەو شـتانەی كـە لـە توانایـدا نیـیـە بـــە تایبـــەتی ئـــەو شـــتانەی كە(كماليات )ن و زۆر گرنگ نین.

هـەروەها جـل وبـەرگ و دیاریـەك كـە پێویست نەبن .

---

(١٤) رواه ابن حبان وأحمد والطبراني في الأوسط وسعيد بن منصور والبيهقي وصححه الألباني في الإرواء: ١٧٨٤

(١٥) رواه البخاري: ٥٢٠٠

(١٦) رواه أبو داود والترمذي والدارمي وابن ماجه والحاكم والبيهقي وغيرهم وحسّنه الألباني في الإرواء: ٢٠٣٥

١٨– باس کردنی ژیانی خێزانێتی و پەیوەندی ژن و مێردایەتی خۆیان بۆ خەڵکی و بڵاوکردنەوەی کێشەو ناخۆشی و نهێنی نێوانیان .

١٩–گرتنی ڕۆژوی سوننەت بەبێ ڕێگەپیدانی مێردەکەی ،پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (لا يحل لامرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه)[١٧]

واتە : حەڵاڵ نیی یە بۆ ئافرەت ڕۆژوی سوننەت بگرێت و مێردەکەی لەماڵەوە بێت مەگەر خۆی ڕێگەی پێ بدات ، یا خود ڕێگە بدات بە هاتنە ژورەوەی خەڵکی ، تەنها بە ڕێگە پیدانی مێردەکەی نەبێت .

## سەرپێچی یەکان لە ناو ئاهەنگ و بۆنەکان ( المناسبات )

٢٠– دواخستنی شووکردن بەهۆی خوێندن و هۆی ترەوە ، تاخۆی لە هاو تەمەنانی خۆی بەجێ دەمێنیت و بە تەنها دەمێنێتەوە

کەسێك نابینێ بچێتە داخوازی لەبەر تەمەن گەورەیی .

٢١– گرنگی نەدان بە دین و ڕەوشت لەکاتی هەڵبـژاردنی هاوسەریدا و بایەخ نەدان پێیان ،پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: ( إذا أتاكم من ترضون خلقه ودينه فأنكحوه، إن لا تفعلوه تكن فتنة في الأرض و فساد كبير... )[١٨]

واتە : ئەگەر هەر کەسێك هات بۆ داخوازیتان لە دین و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا شوی پێ بکەن ئەگەر وانەکەن و شتی تر لێك بدەنەوە ئەوا خراپە و ئاشـوبێکی زۆر لەسـەر زەویـدا بلأودەبێتەوە .

٢٢–زیاد ڕەوی کردن لە دانانی مارەییدا .لە فەرموودەدا هاتوە (خير الصداق أيسره)[١٩] .

واتە: باشترین مارەیی ئەوەیە کە کەمترین و ئاسانتربێت

٢٣–کەوتنە ناو هەندێ داهێنراوی تازە لەم سەردەمەدا وەکو زۆرکردن لە مێردەکەی بۆ لەسەر کردنی شەبقە یاخود نوسینی ناوی مێردەکەی لەسەری ، هەروەها لاسایی کردنەوەی کافران لەلە بەرکردنی جلی سپی درێژ و دەست کێش و گۆرەوی سپی لەکاتی گواستنەوەدا

٢٤–چوونی ئافرەت بۆ ئارایشگا بۆ لابردنی موی لەشی هەتاوای لێ هاتوە کە شوێنی وای دەردەخات کە دروست

(١٧) البخاري ومسلم وغيرهما بألفاظ متعددة وصححه الألباني في الإرواء: ٢٠٠٤.

(١٨) رواه الترمذي وابن ماجه والحاكم والبيهقي وغيرهم وحسنه الألباني في الإرواء: ١٨٦٨.

(١٩) رواه الحاكم وصححه الألباني في الإرواء: ١٩٢٤.

نی یه بۆ کەس تەماشای بکات جگە لە مێردەکەی .

٢٨-سووربوون لەسەر گێڕانی ئاهەنگی گواستنەوە لە کۆشك و میوانخانەکان و ئامادەکردنی گۆرانی بێژانی ژن و پیاو ،دەنگ بەرزکردنەوە بەگۆرانی و مۆسیقا و هەل هەلە لیدان و سەرف کردنی پارەیەکی زۆر تا دەگاتە سنورێکی زیادەرەوی و ئیسراف.

٢٥-دانانی بوك و زاوا لە شوێنێکی بەرز لەپێش چاوی کەسانی نامەحرەم لەخزم و کەس وکاری بوك و زاوا و خەڵکی تر و پیرۆزبایی کردنیان لێ یان بە تەوقەکردن و سەماکردن بۆیان و گرتنی وێنەی فۆتۆگرافی یاخود بە کامێرای ڤیدیۆ .

## سەرپێچی یەکان لە دەرچون لەماڵ و سەفەر کردن و تێکەڵاو بوون

٢٦-بۆن لە خۆدان لە کاتی دەرچوونی لە ماڵ کە پیاوان بۆنی دەکەن ، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (أيما امرأة استعطرت ثم خرجت فمرت على قوم ليجدوا ريحها فهي زانية)[٢٠] .

واتە : هەر ئافرەتێك بۆن لە خۆی بدات و پاشان لەماڵ دەرچێت و پیاوانی بێگانە بۆنی بکەن ئەوا ئەوا ئافرەتە زیناکەرە .

٢٧-سەرکەوتنی ئافرەت لەگەڵ شۆفێری بێگانە ، بە تەنها و خۆ دانەپۆشین لێی ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :(لا يخلون أحدكم بامرأة إلا مع ذي محرم )[٢١]

واتە : باکەس لە ئیوە بە تەنها لە گەل ئافرەتیکدا نەنبێت مەگەر مەحرەمی خۆی لەگەڵدابێت .

٢٨- زۆر دەرچوون لەماڵ و چون بۆ بازار ، خوای گەورە دەفەرموویت :

(وقرن في بيوتكن ولاتبرجن تبرج الجاهلية الأولى)[٢٢] .

واتە: لەماڵەکانتان جێگیربن و وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەفامی لەشی خۆتان دەرمەخەن بۆ پیاوی بێگانە .

٢٩-تێکەڵاو بوونی بە پیاوانی بێگانە لە خزم و کەس وکاری ئافرەتەکە یاخود پیاوەکە یاخود جگە لەمان ،و گاڵتەکردن لەگەڵیاندا وتەوقەکردن لەگەڵیاندا و ئاشکراکردنی جوانی خۆی لەپێش چاویان و خۆدانەپۆشین لەلایان .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :(إياكم و الدخول على النساء ) فقال رجل من

---

(٢٠) رواه ابن خزيمة وصححه الألباني في صحيح ابن خزيمة :١٦٨١

(٢١)رواه البخاري (٣٠٠٦)ومسلم (١٣٤١) بألفاظ .

(٢٢) الاحزاب:٣٣

الأنصار: أفرأيت الحمو يا رسول الله ، قال: (الحمو الموت) (٢٣)

واتە: ئاگادارتان دەکەینەوە نەچنە ژورەوە بە تەنها بۆ لای ئافرەت . پیاوێك لە پیشتیوانان ،ووتی: ئەی ئەگەر خزم وکەس وکاری مێردە کەی بێت ؟ فەرموی ئەوا مردنی باشترە .

٣٠– بە ئاسان گرتنی هەندی لە ئافرەتان لە چون بۆ لای پزیشکی پیاو بۆ چارەسەر کردنی و دەرخستنی شوێنی وایان کە دروست نییە پیشان بدرێت بەبێ ئەوپەڕی ناچاری و گرنگی

٣١–سەفەرکردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم ئیتر بەفرۆکەبێت یان ئۆتۆمبێل بێت یاخود پاپۆر یاخود جگە لەمانە .پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر، تسافرُ مسيرة يوم، إلا مع ذي محرم)(٢٤).

واتە: نابێت ئافرەت سەفەر بکات بەبێ مەحرەم .

٣٢–دەرچوونی هەندێ لە ئافرەتان لە ماڵ بۆ ئیش کردن کە دەبێتە هۆی توش بوونی حەرام و پشت گوێ خستنی مێردو منداڵ ، یا خود وازهێنان لە هەندێ لە فەرزەکان و تێکەڵاو بوون

## چەند سەرپێچیەکی گشتی

٣٣– وازهێنان لە فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە و ئامۆژگاری کردن لە ناو ئافرەتاندا ،خوای گەورە دەفەرموێت :

(والمؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله أولئك سيرحمهم الله إن الله عزيز حكيم)(٢٥).

واتە: باوەڕدارانی پیاوو ژن هەندێکیان سەرپەرشتیارو یارمەتی دەری یەکترن ، فەرمان دەکەن بە چاکەو قەدەغەدەکەن لە خراپە و نوێژەکانیان دەکەن و زەکات دەدەن و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)دەکەن ئەوانە خوای گەورە ڕەحمیان پیدەکات ، بەڕاستی خوای گەورە بەدەسەڵات و کاربەجێیە .

٣٤– ئازاردانی دایك و باوك بەبەرزکردنەوەی دەنگ لەسەروی ئەوانەوە ،یاخود دڵ ئێشانیان و بێزارکردنیان و گوێڕایەڵی نەکردنیان خوای گەورە دەفەرموێت :

(وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا)(٢٦) .

---

(٢٣) (متفق عليه ).البخاري (٥٢٣٢) ومسلم (٢١٧٢).

(٢٤) متفق عليه وهذا لفظ مسلم: (١٣٣٩)

(٢٥) التوبة:٧١

(٢٦) (الاسراء:٢٣).

واته :ئەوەندە چاك بن لەگەڵ دایك و باوكتاندا تەنانەت لەڕوویاندا مەڵێن ئۆف وەقسەڕەق ودەنگ بەرز مەبن لە ئاستیاندا بەڵكو قسە نەرم ونیان و خۆش بن لەگەڵیاندا بەتایبەتی لەكاتی پیریاندا.

٣٥- بڵاو بوونەوەی بەڵاكانی زمان لەغەیبەت و دووزمانی و جگە لەمانە .

٣٦- گوێ نەدان بەنەپاراستنی چاو،وەكو بلێ ی تەنها خوای گەورە فەرمانی بەپیاوان كردووە نەك بەئافرەتان ،خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ )(٢٧)

واته: ئەیٔ محمد (ﷺ) بەئافرەتانی باوەڕدار بلێ باچاویان بگرن لە تەماشا كردنی پیاوی بێگانەو دامێنی خۆیان بپارێزن لە بەدڕەوشتی وە تەماشا كردنی پیاوان بەتایبەتی لە تەلەفیزێۆن ، جگە لەمە كەدەبێتە هۆی فیتنە و ئاشوب .

٣٧.تەماشاكردنی ئافرەت بۆ ئافرەتی تر و پاشان باسی بكات بۆ مەحرەمێكی خۆی بەبێ مەبەستی ژن هێنان.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(لا تباشر المرأةُ المرأةَ فتنعتها لزوجها كأنه ينظر إليها)(٢٨)

(٢٧) (النور: من الآية٣١).

(٢٨)رواه البخاري: ٥٢٤٠.

واتە : با ئافرەت تەماشای لەشی ئافرەت نەكات و پاشان وەسفی بكات بۆ مێردەكەی وەكو ئەوەی كە مێردەكەی خۆی تەماشای بكات .

٣٨- كردنی هەندێ ئیشی قەدەغە كراو كە دەبێتە هۆی نەفرەتی خوای گەورەلەسەری.پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت :

( لعن الله الواشمات والمستوشمات ، والنامصات و المتنمصات و المتفلجات للحسن، المغيرات خلق الله)(٢٩)

واتە: خوای گەورە نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەی كە خاڵ دەكوتن بۆ خەڵكی وە لەوانەیش كە خۆیان دەیكوتن هەروەها لەو ئافرەتانەنەی كە برۆ بۆ خەڵكی هەڵ دەگرن و ئەوانەیش كە خۆیان هەڵی دەگرن، هەروەها لەو ئافرەتانەی كە ددانیان شاش دەكەن بۆ جوانی كەدروست كراوی خوای گەورەی دەگۆڕن هەروەها دەفەرموێت:

(لعن الله الواصلة والمستوصلة)(٣٠).

واتە: خوای گەورە نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەی كە قژی جگە لەقژی خۆیان قژی دەست كردﷺ لە سەریان دەدەن و لە وانەیشە كە بۆنیان لیدەدەن . هەروەهادەفەرموێت :

(٢٩) (متفق عليه).البخاري: ٤٨٨٦ ومسلم: ٢١٢٥.

(٣٠) رواه مسلم: ٢١٢٢.

(لعن رسول الله ... المتشبهات من النساء بالرجال)[٣١]

واتە : پێغەمبەری خوا نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەچوێنن بە پیاو جا لە قسەکردندا بێت یاخود لە جل و بەرگیدا یاخود لە هەڵسوکەوت و هەموو شتێکی تردا.

٣٩-بەنەرمی قسەکردن و دەنگ ناسك کردن لەگەڵ پیاوی بێگانەدا ، بەتایبەتی لە تەلەفۆن دا کە دەبێتە هۆی سەرەنج ڕاکێشانی پیاو وەئافرەتانیش دەبنە نێچیرێکی ئاسان بۆ (ئەو گورگانەی کە لەپێستی مرۆڤدان).

٤٠-لە خۆبایی بوون و خۆ بەگەورە زانینی هەندێ لە ئافرەتان جا چ بەهۆی جوانییانەوە دەبێت یاخود بەهۆی لەبەر کردنی جل و بەرگی گران بەهاو زێڕی بەنرخ و دەوڵەمەندی و شتی ترەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كِبر )[٣٢]

واتە : هەر کەسێك مسقاڵە زەڕەیەك خۆبەگەورە زانین لەدڵیدابێت ئەوا ناچێتە بەهەشتەوە٠

٤١-بێ ئاگابونیان لە زۆر سوننەت و عیبادەت، هەندێ لە ئافرەتان خوا هیدایەتییان بدات نوێژی (الوتر والضحى) نازانن وپارێزگاری ناکەن لە سوننەتەکان، وە هەندێکیان نازانن قورئان بخوێننەوە یاخود خۆیان ابۆشن تەنها لە مانگی ڕەمەزاندا نەبێت .

٤٢-هەندێ لە ئافرەتان خوا هیدایەتیان بدات هەلدەستن بە بۆیاخ کردنی قژی سەریان بەڕەش لەجیاتی خەنە .پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمێ :

(يكون في آخر الزمان قوم يخضبون بالسواد كحواصل الحمام لا يريحون رائحة الجنة)[٣٣] واتە: لە کۆتایی زەماندا کەسانێك پەیدا دەبن قژەکانیان ڕەش دەکەن وەکو سیقەتۆرەی کۆتر، ئەمانە بۆنی بەهەشت ناکەن .

٤٣-سەرپێچیکردنی سوننەتێك لە سوننەتەکانی فیترەت کە بریتی یە لەنینۆك کردن. ئافرەتی وا هەیە نینۆکی درێژ دەکات و پاشان بۆیاخی دەکات کەئەم بۆیاخە نایەڵێت ئاو بگات بەنینۆکی لەکاتیدەست نوێژگرتن دا و دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی دەست نوێژو پاشانیش نویژەکەی .

٤٤- هاوڕێ یەتی کردنی ئافرەتی خراپ کەهانی دەدەن بۆ کەم تەرخەمی کردن لەپەرستن و جێ بەجێ کردنی

(٣١) رواه البخاري: ٥٨٨٥.

(٣٢) رواه مسلم : ٩١.

(٣٣) (رواه ابو داود والنسائي ) صحيح انظر تمام المنة

مەفەكانی خوای گەورە لەسەریو گرنگی نـەدان و بەكـەم گرتنـی پاراسـتنی ڕێـزو ئـابڕووی و تـوش كردنـی بەئیشـی وا كـە سەرەنجامەكەی سوپاس كراو نابێت .

٤٥- ماتـەمی گێرانـی ئافرەتـان زیـاتر لـە سـێ ڕۆژ ئەگـەر مردووەكـە مێـردی نەبوو ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(لاَ يَحلُ لامرأة تؤمن بـالله واليـوم الأخر أن تحّد على ميت فوق ثلاث الا على زوج أربعة أشهر وعشراَ)[٣٤]

واتە: حـەلاڵ نىيـە بـۆ ئافرەتێـك كـە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبی زیـاتر لەسێ شەو پرسە بگرێتەوە بۆ مردوەكـەی مەگەر مردوەكـە مێـردی بـێ ئـەوا چـوار مانگ و دە ڕۆژ پرسەی بۆ دەگرێتەوە.

٤٦-خـۆ پەیوەسـت نـەكردن بـە ئادابـەكانی پرسـە گرتنـەوە. وە دوور كەوتنەوە لە لەبەركردنی پۆشاكی جوان و خشلّ و چاو ڕشـتن و بـۆن لـەخۆدان و هاو شێوەی ئەمانە ، وەنابێت لەماڵەكەی بچێتە دەرەوە تـەنها لـە بـەر ئیشـێكی گـرنگ و پێویسـت نـەبێت ، وە نابێـت پۆشـاكی ڕەش بكـات چـونكە حەرامـەو هـیچ بنچـینەیەكی نـی یـە لـە شـەرع داو ئیشێكی بەتاڵ و زەمكراوە .

وأخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين
وصلى الله على نبينا محمد
وعلى أله وصحبه أجمعين.

(٣٤) متفق عليه : البخاري: ٥٣٣٤ ومسلم: ١٤٨٦.

# له حوكمەكانی زەكات

## زەكاتی ماڵ و سامان

ماموٚستا عثمان علي

**یەکەم: مانای زەکات** [1] :

* لە ڕوی زمانەوانیدا: بریتییە لەزیاد بوون و گەشە کردن ، هەرشتێك ژمارەو شێوەی زیادو گەورە بێت پێی دەوترێت (زکا) بۆ نمونە: دەوترێ (زکا الزرعُ) کە زرعاتەکە گەشەی کردو گەورە بوو .

* لە ڕووی زاراوەی شەرعدا : بریتییە لە دەرکردنی ئەو بەشە ماڵەی کە شەرع فەرزی کردوە لە ماڵێکی دیاری کراو بۆ کۆمەڵێکی دیاری کراو.

وە پەیوەنـدی نێـوان هـەردوو پێناسەکە دیارو ئاشکرایە ، ئەگەر چی لەڕوی دەرەوە زەکات دەکردن کەم بوونی ماڵە ، بەڵام شوێنەوارو کاریگەریەکەی دەبێتە هۆی زیاد بونی ماڵ و جێگیر بونی" چونکە خوای گەرە دەرگای وای لێ دەکاتەوە بە هۆی زەکات دەرکردنەوە بۆ پەیدا کردنی ڕزق کە بەخەیاڵیشیدا نەدەهات . خوای گەورە دەفەرموێ :

(وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِبًا لِيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلا يَرْبُو عِنْدَ اللَّهِ . وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ) [2] .

واتە: ئەو زەکاتەی کە دەری دەکەن لە ماڵەکەتان وەمەبەستان خوایە " ئەوا چەند جارە خوای گەورە ئەو ماڵە زیاد دەکات وە دەفەرموێت :

(وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ) [3] .

واتە: ئەوەی دەیبەخشن لەڕێی خوا ئەوا پەروەردگار بۆتان لەجێ دادەنێتەوە" چونکە باشترین رزق دەرە.

وەهەروەها زەکات دەبێتە هۆی زیاد بونی ئیمانی خاوەنەکەی" چونکە زەکات دەرکردن یەکێکە لەکردەوە باشەکان کە باوەڕ زیاد دەکەن " وەهەروەها دەبێتە هۆی زیاد بونی ڕەوشتی جوان وفراوانی دڵ ودەرون وڕوناکی وئارام گرتن ودووربون لە دڵەڕاوکێ

(1) (فقه العبادات-١٨٥).ابن عثيمين.

(2) (سورة الروم:٣٩).

(3) (سورة سبأ:٣٩).

**دووەم:شوێن و جێگەی لە ئیسلامدا**

(زەكات پایەیەكە لە پایەكانی ئیسلام وە پێویستییەكە لە پێویستیەكانی).

یەكێكە لە پێنج پایەكانی ئیسلام ، وە بەراورد كراوە لەگەڵ نوێژدا . لە قورئانی پیرۆزدا لە هەشتاو دوو ئایەتدا ، وە خوای گەورە فەرزی كردووە لە قورئاندا وە لە فەرمودەكانی پێغەمبەردا ﷺ وەكۆی زانایانیشی لەسەرە:

قال تعالى: (وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ)[٤] .

واتە: نوێژ بكەن و زەكات بدەن و لەگەڵ كڕنوش بەران كڕنوش بەرن .

وعن أبن عمر رضي الله عنه قال:رسول الله ﷺ : (بني الإسلام على خمس ، شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله ، وأقام الصلاة، وإيتاء الزكاة ، وحج البيت ، وصيام رمضان)[٥].

واتە: ئیسلامەتی لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتی دان بەوەی كە هیچ پەرستراوێكی حەق نییە جگە لە الله ، وە محمد نێرراوی ئەوە وە نوێژ كردن ، زەكات دان و ، حەج كردن و ، ڕۆژو گرتنی مانگی ڕەمەزان .

**سێیەم :هاندان بۆ زەكات دان :**

١/قال تعالى: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا)[٦] .

واتە : وەرگرتنی ئەی محمد ﷺ لە ماڵی موسوڵمانان خێری دیاری كراو كە زەكاتی فەرزە وە جگە لە دیاری كراویش – كە خێری سوننەتە – بۆ ئەوەی پێی پاك ببنەوە لە چڵكی بە خیلیو چاو چنۆكی وە دڵ ڕەقی لەسەر هەژاران و پەك كەوتووان ، وە هەروەها پێی پاك ببێتەوە نەفسیان ، بۆ ئەوەی ببنە خاوەنی خۆش بەختی لە دنیاو دوارۆژدا.

٢- (إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ. آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ. كَانُوا قَلِيلاً مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ. وَبِالأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ. وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ)[٧] .

واتە: ئەوانەی لەخوا ترسان لە دونیادا ئەمرۆ لە بەهەشتانێك و سەرچاوەكاندان، وەریان گرتوە ئەوەی پەروەردگاریان پێ یانی داوە ئەویش بە هۆی ئەوەی لە دونیادا چاكە كاربوون ، وە دەردەكەوێت چاكە كانیان لەشەو نوێژدا وەلەپارشێودا داوای لێ خۆش بوونیان دەكرد وە هەروەها دەیان بەخشی لەماڵیان حەقی داواكارو ئەوانەی بێ بەش بوون .

---

(٤) (سورة البقرة:٤٣) .

(٥)البخاري (١/٤٩/٨) ،مسلم (١٦ –٢٠-٤٥/١).

(٦) (سورة التوبة:١٠).

(٧) (سورة الذريات:١٥ –١٩).

٣/ قال تعالى :(وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)[٨]

واتە: ئەو کۆمەڵەی کە خوای گەورە جێگیریان دەکات و دیان خاتە ژێر بەزەیی و مهرەبانی خۆی ئەوانەن کە بروایان بە خوای خۆیان هەیە و وەیارمەتی یەکتر دەدەن بەسەر کەوتن و خۆشەویستی وە ئەمر بە چاکە دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن ، وە پەیوەندی خۆیان و خوایان پتەو دەکەن بە نوێژکردن و پەیوەندی نێوان خۆشیان پتەو دەکەن بەدانی زەکات .

٤/ قال تعالى : (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ) [٩].

واتە : ئەوانەی جێگیرمان کردوون لەسەر زەوی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن و تەنها بۆ خوایە کۆتایی هەموو ئیشێك ، جا خوای گەورە گێراویەتی دانی زەکات بە یەکێك لە مەبەستەکانی جێگیربوون لەسەر زەوی .

٥/ قال رسول الله ﷺ : (ثلاثة أقسم عليهن وأحدثكم حديثاً فاحفظوه؛ ما نقص مال من صدقة ، ولا ظلم عبد مظلمة فصبر عليها، إلا زاده الله بها عزّا.ولا فتح عبد باب مسألة،إلا فتح الله عليه باب الفقر)[١٠].

واتە: سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم وە قسەتان بۆ دەکەم جا لە بەری بکەن : ماڵ کەم نابێت بەبەخشین: وەهەرکەسێك ستەمی لێ بکرێ و ئارام بگرێ ئەوا خوای گەورە سەربەرزی زیاد دەکات بەو ئارام گرتنەی ، وەهەربەندەیك دەرگای سواڵ بکاتەوە ئەوا خوای گەورە دەرگای هەژاری بۆ دەکاتەوە)..

٦/ قال رسول الله ﷺ :

(إن الله عز وجل يقبل الصدقات ويأخذها بيمينه فيربها لأحدكم كما يربي أحدكم مهره أو فُلُوّه ، أو فصيله حتى إن اللقمة لتصير مثل جبل أحد)[١١].

واتە: خوای گەورە خێرو بەخشین قەبول دەکات و وەری دەگرێ بەدەستی ڕاستی جا پەروەردەی دەکات- هەروەك یەکێك لەئێوە بەچکە ماینەکەی پەروەردە دەکات هەتایەك لوقمە- کە بەخشراوە- گەورەی دەکات بەوێنەی کێوی ئوحد .

(٨) (سورة التوبة:٧١).

(٩) (سورة الحج:٤١).

(١٠) ((رواه الترمذي))(٢٣٢٥) إسناده صحيح.

(١١) (رواه أحمد و الترمذي)(٦٦٢)وصححه المنذري.

## چوارەم :

## هەڕەشە لەسەر نەدانی زەکات

١- قال الله تعالى: (وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ .يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ)(١٢) .

واتە:ئەوانەی هەڵدەگرن وکۆدەکەنەوە زێڕو زیو و لێی نابەخشن لە ڕێی خوادا ئەوا مژدەی ئازارێکی بەئێشیان بدەیە ، لەو ڕۆژەی کە زێڕو زیوەکەیان گەرم و سوردەکرێتەوە لەناو ئاگری جەهەننەمدا جا خاوەنەکانیان ناوچاوانیان و تەنیشتیان و پشتیان ئوتودەکرێن پێیان، وەپێیان دەگوترێ ئەوەیە کە لە دنیادا کۆتان کردۆتەوە بۆ خۆتان جابچێژن ئەوەی کۆتان کردۆتەوە.

٢- قال تعالى (وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْراً لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)(١٣) .

واتە: باوانەزانن ئەوانەی بە خیلن بەوماڵەی کە خوا بە فەزڵی خۆی پێیانی بەخشیوە ئەوا خێرو چاکە نیە بۆیان بەڵکو ئەوە شەڕە بۆیان وە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوماڵە دەکرێتە ئەڵقە لەملیان.

(١٢) (سورة التوبة:٣٤ -٣٥).

(١٣) (سورة آل عمران:١٨٠).

٣- وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکدا کە (أحمد وبخاری مسلم) گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی:

خاوەنی هەرخەزێنەیەك کە زەکاتی لێ نەداوە ئەوا ئەو ماڵە سوردەکرێتەوە بە ئاگری جەهەننەم جا دەکرێن بە پلێت ئینجا بە هەردوو تەنیشت ونێوچاوانیدا دەهێنرێ تاوەکو خوای گەورە حوکم دەکات لە نێوان بەندەکانی لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە پاشان ڕێگای خۆیان دەبینن" یان بۆ بەهەشت یان بۆ جەهەننەم .

جا ئاگادار بە ئەی برای موسوڵمان با خۆشەویستی ماڵ وات لێ نەکات ڕۆژی دوایت لە بیر بچێتەوە کە بە هۆی نەبەخشینی لە دنیادا پێی عەزاب بدرێ بۆ ماوەی (٥٠٠٠٠) ساڵ کە لە کاتێکدا لەوانەیە ماوەیەکی کەمیش لە دنیا لەزەتت لەو ماڵە وەرگرتبێ وە ئاگاداربە کە نەبەخشین دەبێتە هۆی کەم بونەوەی ماڵ و لەناوچونی ، وەبەخشینی دەبێتە هۆی زیاد بوون و جێگیر بوونی هەروەك لەو فەرمودە پیرۆزەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ :

(ما من يوم يصبح العباد فيه إلا ملكان ينزلان، فيقول أحدهما: اللهم أعط منفقاً خلفاً ويقول الأخر : اللهم أعط ممسكا

تلفا)[١٤].

واتە: هەموو ڕۆژێك کە بەیانی دادێت دوو فریشتە دێنە خوارێ یەکێکیان دەڵێت: ئەی خوایە ئەوەی دەبەخشێت ئەو ماڵەی بۆ لەجێگەی دانێوە، وە ئەوەی تریان دەڵێت ئەی خوایە ئەوەی دەستی گرتۆتەوە نابەخشێ ماڵەکەی بەهەدەر بەری.

جا برای بەڕێز : ئەوەی دەبەخشێ دووقازانج دەکات یەکێکیان پاداشتی بەخشینەکەی کە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێی دەکات. وەئەوەی تریان کە ماڵەکەی کەم نابێتەوە بەڵکو چەندی بەخشیوە ئەوەندە یان زیاتر دێتەوە جێگەی ، بەڵام ئەوە کە نابەخشێ دووزیانی لێ دەکەوێ یەکەمیان هیچ پاداشتی بەخشینی نییە لە دوا ڕۆژدا وەهەروەها ئەو نەبەخشینە دەبێتە هۆی لەناو چونی ماڵەکەی .

**پێنجەم:**

**حوکمی ئەوکەسەی زەکات نادات.**

زەکات فەرزێکە لەو فەرزانەی کە موسوڵمانان هەموویان لەسەری کۆن جا هەرکەسێك ئینکاری واجبیەتی بکات ئەوا کافرە و دەرچووە لە ئیسلام بەڵام کەسێك باوەڕی بە واجبیەتی زەکات هەبێ و زەکات نەدات لەبەر هەر هۆیەکی تر بێت . ئەوا کافر نابێت ، بەڵام پێویستە زەکاتی لێ بستێنرێ بەزۆری و وەنیوەی ماڵەکەشی سزای ئەوەی کە بە خۆشی نەی داوە .

**شەشەم :**

**زەکات لەسەر کێ واجبە؟**

زەکات واجبە لەسەر هەرموسوڵمانێکی ئازادی خاوەن ئەو ماڵەی کە گەیشتۆتە ئەندازەی زەکات- النصاب- ئەگەر ساڵێکی کۆچی بەسەردا تێ پەڕی، جگە لە کشتوکاڵ کە زەکات تێ دا فەرز دەبێت لەکاتی درونەوەیدا ئەگەر گەیشتبێتە ئەندازەی خۆی .

**حەوتەم :**

**ئەو ماڵانەی کەزەکاتیان تێدا واجبە**

زەکات واجبە لە ١- زێڕو زیو- پارە٢- کشتوکاڵ ٣- مەڕومالآت ٤- خەزێنەی دۆزاوەی سەردەمی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام .

لێرەدا تەنها باسی بەشی یەکەم دەکەین لە جۆری ئەو ماڵەی کە زەکاتی تێدایە.

*** زەکاتی زێڕو زیوو پارە**

١- واجبیەتیان : زەکاتی زێڕو زیو فەرز بوە بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر خوای گەورە دەفەرموێ :

(وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ)[١٥].

جا زەکات واجبە لە هەردووکیاندا

---

(١٤) البخاري (١٤٤٢ /٣٠٤ ٣).مسلم (١٠١٠ /٧٠٠ /٢).

(١٥) (سورة التوبة:٣٤).

پـاره بێـت يـان چـەك بێـت هــەركاتێك گەيشـتن بـە ئەنـدازەی خۆيـان و سـاڵی بەسەردا تێ پەڕی .

*** گەيشتنى ئەندازەى زەكاتى زێڕ – النصاب–**

هـيچ زەكـات فەرزنىيـە لەسـەر زێـڕ تـاوەكو : ١. دەگاتـە (٨٥ غـرام).واتـە (١٧)مسقالی عێڕاقی نەك بيست، چونكە يەك مسقاڵی پێنج غرامە، بـەلاَم دينارێـك يا مسقاڵێك لـە زێـری سـەردەمی پێشـوو تەنها چوار غرام و روبعێك بـووە ، بۆيـە كردويەتيە بيست دينار يا مسقاڵ.

٢. وەسـاڵێكی بەسـەر دا بـڕوات ، ئـەوكات دەبێـت چـارەكی دەيـەكی دەربكات لێی . واتە لـە (٤٠) دينـار يـەك دينار زەكاتە .

حديث عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده مرفوعا: ليس في أقل من عشرين مثقالا من الذهب ، وليس في أقل من مئتي درهم صدقة)) [١٦].

واتە هيچ لەسەر زێڕ نىيە هەتا دەبێتە بيست مسقاڵ جا ئەگەر . گەيشتە بيست مسقاڵ ئەوا نيو مسقاڵی زەكات تێ دايە . وە ئەگەر زياتر بوو لە بيست مسقاڵ بەم شێوەيە حساب دەكرێت،وەزەكاتىلەسەرنىيەتاساڵێكی بەسەردا نەڕوات .

*** گەيشتنى ئەندازەى زيو بۆ زەكات – النصاب–**

بەلاَم زيو هيچی لەسەرنىيە تا دەگاتە (٥٩٥ غـرام) جـا ئەگـەر گەيشـتە ئـەو ئەندازەيە ئەوا (٥) درهەمی تێ دايە

أن النبي ﷺ قال: (قد عفوت لكم عن الخيل و الرقيق ، فهاتوا صدقة الرقة (الفضة) من كل أربعين درهما : درهم ، وليس في تسعين ومائة شيء ، فإذا بلغت مائتين ففيها خمسة دراهم)[١٧].

واتە: لەزەكاتی ئەسپ و بەندە عەفوم كردن –بەلاَم زەكاتی زيو بدەن لە (٤٠) درهەم يەك درهەم ، وەزەكاتی تێ دانيە لە١٩٠ درهەم واتە تادەگاتە (٢٠٠) درهەم

*** زەكاتى قەرز**- زكاة الدين

زەكاتی قەرز سێ جۆرە :

يەكـەم : ئـەو قـەرزەی كـە زەكـاتی تێدانىيە ، وەك ئـەو جـۆرە ماڵانـەی كـە لەبنەڕەتـدا زەكاتيـان لەسـەر نىيـە وەك چەند كيلۆيەك لـە بـرنج يـان شـەكر ، وە وێنـەی ئەمانـە زەكاتيـان تێدا نىيـە لـە قەرزدا بێت يان نا.

دووەم : ئەو ماڵەی كە زەكاتی تێدايە وەك زێڕو زيوو پارە ، ئەگەر ئـەو جـۆرە ماڵە قەرز بێت:

---

(١٦) أبو عبيد صحيح بشواهده ((الإرواء))(٨١٥).

(١٧) رواه أبو داود ( ١٥٧٤ ) صحيح.

(أ) لەسەر كەسێكی هەژاری بێ ماڵ ، یان لەسەر كەسێك كە نكۆڵی لەو قەرزە بكات ، یان دوای بخات و نەیداتەوە . ئەوە زەكاتی لەسەرنییە هەتا قەرزەكەی وەرنەگرێتەوە. جا كە وەری گرتەوە زەكاتی یەك ساڵی لێ دەدات.

(ب) قەرز لە سەر كەسێك كەدانی پێدا بهێنێ، وەتوانای هەبێت بیداتەوە خاوەنەكەی . ئەو جۆرە واجبە هەموو ساڵێك زەكاتی لێ دەربكات.

## زەكاتی خشڵی ژنان

## زكاة الحلي

زانایان كۆن لەسەر تێدا نەبوونی زەكات لە ئەڵماس و مرواری و یاقوت و هەموو ئەو بەردانەی كە خاوەن بەهاو نرخ و رێزن ، ئەگەر نەبنە ماڵی بازرگانی، بەلاّم زانیان جیان لەسەر خشڵی ژنان كە زێڕو زیو بێت بۆ:

١- زەكات واجبە لە زێڕو زیوو خشڵی ژنان بەبەڵگەی ئەم فەرموودانە:

(أتت النبي ﷺ امرأتان في أيدهما أساور من ذهب ، فقال لهما رسول الله ﷺ : أتحبان أن يسوركما الله يوم القيامة أساورمن نار؟ قالتا: لا قال: فأديا حق هذا الذي في أيديكما)[18]

واتە: دوو ژن هاتنە لای پێغەمبەرﷺ وە لە دەستیاندا هەبوو بازنەی زێڕ ، وە پێغەمبەر پێیانی فەرموو ئایا پێتان خۆشە خوای گەورە بازنی ئاگرتان لە دەست بكات لە ڕۆژی قیامەتدا ؟ وتیان: نەخێر . فەرمووی كەواتە هەقی ئەوە بدەن كەلە دەستاندا هەیە .

٢- زەكات واجب نیە لە زێڕو زیو خشڵی ژنان ، هەرچەندێك بێت بەبڵگەی:

أ- پرسیار كرا لە جابر كە یەكێكە لە هاوەلاّنی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی زەكاتی خشڵی ژنان ، لە وەلاّمدا وتی واجب نیە زەكات تێدا[19] .

ب- عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ مندالّی هەتیوی براكەی لەلا بوون وخشڵیان هەبوو ، بەلاّم زەكاتی لێ دەر نەدەكرد . بڕوانە : (المُوَطأ)[20]

ج- عبد اللّهی كوری عمر زەكاتی خشڵی كچەكانی دەرنەدەكرد [20].

بەلاّم خطابی دەڵێت : ئەو ئایەتەی لە قورئاندا هاتووە باسی زەكاتی زێڕو زیو دەكات خشڵی ژنانی جیا نەكردۆتەوە، وە هەروەها فەرموودەی پێغەمبەریش باس لەوە دەكات كە زەكاتی خشڵی ژنان واجبە.

---

(١٨) مشكاة المصابيح:١٨٠٩.حديث حسن(تمام المنة:٣٦١)

( ) أخرجه الشافعي:٢٣٩/١.صحيح (الإرواء:٢٩٥/٣)

(٢٠) (المُوَطأ)٢٤٥/١ وصححه ابن حزم:٧٩/٦.

### زەكات لە مارەیی ژن

### الزكاة في صداق المرأة

ئەگەر مارەیی ژن گەیشت بەئەندازەی زەکات- النصاب- وە سالێکی بەسەردا ڕۆیش ، ئەوا زانایان سێ ڕەئیان هەیە .

١- زەکات تێدا واجب نییە هەتا وەری نەگرێ. وەکو زەکاتی قەرز وایە.

٢- زەکاتی تێدا واجبە ئەگەر وەریشی نەگرتبێ ،جا لێرەدا ئاگاداریەکە بۆ ئەو ژنانەی کە مارەیەکەیان لەسەر (١٠٠ یان ٢٠٠) مسقالْ یان زیاترە کە خۆیان ئاراستەی ئەو ئەمرەش دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ سود لەو مارەیە وەربگرن تەنها بۆ ناوە، وەبۆ ئەوەیە مێردەکانیان ببەستنەوە .

### زەکاتی کرێی خانوو دوکان وزەوی

زەکات واجب نییە لە پارەی کرێ هەتاوەکو نەگاتە ئەندازەی خۆیو سالێکی بەسەردا نەڕوات.

### زەكاتیماڵیبازرگانیدا(عروض التجارة)

بریتییە لەو ماڵەی کە دەخرێتە کرین و فرۆشتنەوە بۆ قازانج کردن.

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە زەکات واجبە لە ماڵی بازرگانیدا بەبەڵگەی :

أ- في عموم قوله تعالى : (والـذين في أموالهم حق معلوم ، للسائل والمحروم)[21].

واتە: ئایەتەکە باسی لەو بڕوادارە ڕاستەقینەمانە دەکات کە زەکات دەردەکەن لەو ماڵەی کە هەیانە بۆ فەقیرو هەژاران ، وەکەل و پەلی بازرگانیشی بەشێکە لەماڵ .

ب- پێغەمبەر بە معاذي فەرموو کاتێك ناردی بۆ یەمەن- (أعلمهم ان الله افترض عليهم صدقة في أموالهم تؤخذ من اغنيائهم فترد على فقرائهم)[22].

واتە: ئەی معاذ : بە خەڵکی ڕابگەیەنە کە خوای گەورە واجبی کردووە لە ماڵی دەوڵەمەندەکان زەکات وەردەگیرێت دەردێتەوە بە فەقیرەکانیان .

وە لە تەفسیری مەناردا هاتووە کە : کۆمەڵی زۆربەی زانایانی دەڵێن واجبە دەرکردنی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا ، وە لەقورئان و حەدیسدا بە تایبەت باسی نەکراوە. وە ئەگەر زەکات دەرکردن واجب نەبوایە لە ماڵی بازرگانییەوە" ئەو کاتە بازرگانەکان زەکاتیان نەدەداو هەژاران بێ بەش دەبوون .

---

[21] المعارج /٢٤-٢٥.

[22] أخرجه البخاري رقم (١٤٥٨)كتاب الزكاة . ومسلم رقم (٢٩) كتاب الإيمان.

وە کە خوای گەورە واجبی کردووە بە دەرکردنی زەکات لە ماڵی دەوڵەمنـدا بـۆ دڵ نـــەوایی هـــەژاران وە بـــەرپابوونی بەرژەوەندی گشتیـیە وە لێرەدا لەلایـەك سود بۆ دەوڵەمەندانە بە پاك کردنـەوەی نەفسیان لە ژەنگی بەخیلی. وەلە لایەکی تریشەوە هەستانی بەرژەوەندی گشتـیو سود وەرگرتنـی هەژارانـە لـەو زەکاتـە ، لەگەڵ ئەوەشدا زەکات دان ڕێ گرتنە لە فەسادو کۆبونەوەی مـاڵ لـەلای هەنـدێك خەڵکی دیاری کراودا . ئایا هـیچ خـاوەن ژیرێك وا هەست دەکات کە بازرگانان لەو مەبەســتە شــەرعیـیە بچــنە دەر کــە لەوانەیە زۆربەی دەست مایـە لەدەسـتی ئەوان دابێت؟!.

کەی ماڵ دەبێتە ماڵی بازرگانی ؟

ماڵ نابێتـە مـاڵی بازرگـانی تـەنها بـە دوو مەرج نەبێت :

١- خاوەنەکـەی خاوەنیـەتی بەسـەر ئـەو ماڵـەدا هـەبێت . بـە هەڵسـوکەوت کردنی لەو ماڵە بە ئارەزوی خۆی .

ب. لە کاتێ کە دەبێتـە خـاوەنی ئـەو ماڵە نیەتی ئەوە بێت کە بۆ بازرگانیـیە.

**چۆنیەتی دەرکردنی زەکات لە ماڵی بازرگانی دا :**

هەر کەسێك ماڵی بازرگـانی هـەبێت و گەیشــتە ئەنــدازەی زەکـات وە ســاڵی بەسـەردا ڕۆیشـوبێ ئـەوا دەی ژمێـرێ و دەی نرخێنــێ لــە کۆتــایی ســاڵدا ، وە زەکاتەکەی لێ دەردەکات کـە چـل یەکـە واتە لە ٤٠ دینار یەك دینار زەکات دەدا.

**ئەوانەی زەکاتیان دەدرێتێ**

**(مصارف الزکاة) .**

ئەوانەی زەکاتیان پێ ڕەوایە هەشت کۆمەڵن خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (التوبة)دا باسی کردوون :

(إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)[٢٣].

زەکات تەنها بۆ ئەو کۆمەڵانەیە:

١-٢ هەژاران **(الفقراء والمساكين)**:

ئەوانــەن کــە نــەدارن و نــاتوانن پێداویستـیـیەکانی خۆیان دابین بکەن" لە خـواردن وخواردنـەوەو جـل و بـەرگ و جێگـای نیشـتەجێ بـون بـۆ خۆیـان و منداڵـەکانیان . وە پێویسـتە ئەوەنـدەیان زەکـات بـدرێتێ هـەتا دەریـان دێـنن لـە هەژاری. بەڵام زەکات نادرێتە کەسێك کە توانای ئیش کردنی هەبێت وئیش نەکات

٣.**(العاملون عليها)**:ئەوانـەی هەڵدەسـتن بە کۆکردنەوەی زەکات و دابەش کردنی: ئەوانەن کەدیاری دەکرێن بۆ ئـەو ئیشـە، جا هەنـدێك لـە زەکاتیـان دەدرێتـێ وەك موچـەیەك لــە بەرامبــەر ئیشــەکانیان،

(٢٣) (سورة التوبة:٦٠).

وەپێویستە کەلەموسوڵمانان بن، وە نابێ لە هۆزی پێغەمبەرﷺ بن" چونکە زەکات حەرامە لەسەر پێغەمبەر ﷺ و هۆزەکەی .

٤-**(المؤلفة قلوبهم)**: بۆ ئەوانەی بە هۆی زەکاتەوە دڵیان ڕادەکێشرێ بۆ لای ئیسلام" کە ئومێدی موسوڵمان بونیان لێ دەکرێ، یان ئەو کەسانەن بۆ پابەند بونیان زیاتر بە ئیسلام، یان بۆ خۆپاراستن لەشەڕیان بە هۆی بێ دەسەلاتی موسڵمانان .

٥. **(وفى الرقاب)**: بۆ ئازاد کردنی بەندە " ئەو کەسانەی کە لەکاتی خۆیدا بەندە بوون زەکاتیان پێ ڕەوا بوو بۆ ئەوەی کە خۆیانی پێ بکڕنەوە و ئازاد بن لە کۆیلایەتی . وە پێویستە لێرەدا بە چاوێکی بە ویژدانانە سەیر بکەین کە چۆن ئیسلام خەڵکی ئازاد کرد لە کۆیلایەتی و دەرگای هاتنە ژورەوەی کۆیلایەتی بچوك کردو دەرگای چونە دەرەوەی فراوان کرد ، بۆ ئەوەی کەم بێنە ژورەوەو زۆر بچنە دەرەوە، هەتا وای لێ کرد بنەبڕی کردو کۆیلەیی نەهێشت و خەڵکی بەتەواوی ئازاد کرد ، بەڵام غەیری ئیسلام لە هەوڵی ئەوەدانە کە خەڵك هەموو ببنە بەندەو کۆیلەی بەشێکی کەم و بیانچەوسێننەوە .

وە پێویستە هەندێك لەو ڕێگایانە باس بکەین کە ئیسلام گرتنیەبەر بۆ نەهێشتنی بەندەو کۆیلە:

أ. بەندە ئازادکردنی کردە مایەی کەفارەتی هەندێك تاوان واتە ئەگەر کەسێك یەکێك لەو تاوانانەی کرد پێویستە بەندەیەك ئازاد بکات:

وەك کوشتنی بەهەڵەو، چوونی رۆژووەوان بۆ لای خێزانی بە ڕۆژی مانگی ڕەمەزان و، سوێند شکاندن و (ظهار) کردن لەگەڵ ژندا.

ب. ئەجرو پاداشتی بەندە ئازاد کردنی ئەوەندە گەورە کرد هەتا ئەو کەسەی کە بەندە ئازاد دەکات خوای گەورە ئەو ئازاد دەکات لە ئاگری جەهەننەم لە ڕۆژی دوایدا هەروەك لە حەدیسی ڕاستدا هاتووە: هەرکەسێ بەندەیەك ئازاد بکات ، ئەوە لەجیاتی هەر ئەندامێکی بەندەکە ئەندامێکی خۆی ئازاد دەکات لە ئاگر.

ج. جوڵانەوەی لەگەڵ بەندەدا بەشێوەیەك لێکرد، کە وەك ئازاد(الحر) وابێ لەهەق ومافدا. هەروەك لە حەدیسی ڕاستدا هاتووە: هەرکەسێك برایەکی خۆی لەلایە- واتە کۆیلەیەکی هەیە- با لەو خواردنەی بداتێ کە بۆ خۆی دەیخوا ، وە ئەو جل وبەرگەی لەبەر بکات کە بۆ خۆی لەبەری دەکات وە ئیشێکی وای پێ نەکات کەلە توانای دانەبێ .

٦. **(الغارمون)** قەرزداران: ئەوانەن كە قەرزداری خەڵكن و ناتوانن بیدەنەوە، جا توشی بەڵایەك بووبن وەك ماڵ سوتان یان ماڵ بەئاودا ڕۆیشتن، یان ژێر زەوی كەوتن بە هۆی ڕۆچونی زەوی، یان خوێنێكیان كەوتبێتەسەر .

٧-**(وفی سبیل الله)** لەپێناوی خوادا: بریتییە لەو ڕێگایەی كە دەگات بە ڕەزامەندی خوا لە زانست و ئیش كردندا.

زانایان كۆن لەسەر ئەوەی كە مەبەستی لێرەدا جیهاد كردنە لە پێناوی خوادا ، وە زەكات دەدرێتە ئەو جەنگاوەرانەی كە خۆبەخشن و مووچەیان نییە لە دەوڵەتدا. وە خۆ ئامادەكردنیش بۆ جەنگ دەگرێتەوە، بەكڕینی چەك و خواردن بۆ مجاهیدان و هۆی گواستنەوەو ئامادە كردنیان .

وە هەروەها ئەو كەسانەش دەگرێتەوە. كە خەریكی فێربوونی زانستی شەرعین" بەڵكو لە ڕیزی پێشەوەن بۆ پێدانی زەكات" چونكە هیچ پەرستنێك ناكرێ بەبێ زانست. وە زانایان فەتوایان داوە كە ئەوانەی خەریكی فێر بوونی زانستی شەرعین یەكێكن لە (فی سبیل الله). هەروەك شێخ محمد ابن صالح العثیمین فەرمویەتی:

(قال أهل العلم : ومن سبيل الله : الرجل يتفرغ لطلب العلم الشرعي ، فيعطى من الزكاة ما يحتاج إليه من نفقة ؛ من كسوة وطعام وشراب ومسكن وكتب علمية يحتاجها، **لأن العلم الشرعي نوع من الجهاد في سبيل الله** ، بل قال الإمام أحمد رحمه الله: (**العلم لا يعدله شيء لمن صحت نيته**). فالعلم هو أصل الشرع كله، ولاشرع إلا بعلم ، والله سبحانه وتعالى أنزل الكتاب ليقوم الناس بالقسط ويتعلموا أحكام شريعته وما يلزم من عقيدة وقول وفعل )[٢٤].

٨. **(وابن السبیل)** بۆ ڕێبواران: ئەگەر ڕێبوارێك دوور لەوڵاتەكەی خۆی پارەی لێبڕا ئەوا زەكاتی دەدرێتێ ئەوەندەی كە مەبەستەكەی پێ جێبەجێ دەبێ .

كەواتە زەكات واجبە بۆ ئەو هەشت كۆمەڵەی كە باس كران. بەڵام زانایان جیان لەسەر ئەوەی كە ئایا پێویستە هەر هەشت كۆمەڵەكە بگرێتەوە یان ئەگەر بدرێت بە كۆمەڵێك جگە لەوانی تر دروستە؟

وە پوختەی قسەكانیان دروستە ئەگەر بدرێتە یەك كۆمەڵ بەتەنها ، بەڵام ئەگەر بدرێتە هەرهەشت كۆمەڵەكە ئەوە باشترە.

### ئەوانەی نابێ زەكاتیان بدرێتێ
### (من يحرم عليهم الصدقة)

١- **كافر**: دروست نییە زەكات بدرێتە جگە لە موسوڵمانان. هەروەك زانایان تێی گەیشتون لە فەرموودەی

(٢٤) (فقه العبادات : ص٢١١) ( محمد بن صالح العثيمين).

پێغەمبەرﷺ (تؤخذ من أغنيائهم وترد على فقرائهم) واتە : وەردەگیرێ زەکات لە دەوڵەمەنـدی موسـوڵمان وە دەدرێتـە هـەژاری موسـڵمان . بـەڵام دروستە لـە خێرێکیتـر جگـە لـەزەکات بدرێتـە هەژارانی ناموسوڵمانیش.

٢- **نـەوەی هاشـم** : دروسـت نییـە زەکـات بدرێتـە خزمـی پێغەمبـەر ﷺ چونکە حەرامە لەسەر خۆیو خزمەکانی.

٣-٤- **کوڕو باوك** : دروست نییە کوڕ زەکات بداتە باوکی و باپیری، وە دایکی و نەنکی. وە هەروەها دروست نییە باوك زەکات بداتە کوڕیو کچی و نـەوەکانی. بەڵام زەکات دان بۆ خزمان کە یەکێك بن لەو هەشـت کۆمەڵـەی کـە زەکاتیـان پـێ ڕەوایە ئەوا ئەوان لە پێشـوو باشـترن لـە خـەڵکی تـر ، چـونکە خێرکـردن لەگـەڵ خزم هەم خێـرەو هـەم گەیانـدی سیلەی ڕەحمە . جا ئەگەر باوکت یان برات یـان دایکت یـان مامـت یـەکێك بـن لـە ئـەهلی زەکـات، ئـەوا ئـەوان لـە پێشـترن لـە خـــەڵکیتر. بـــەڵام ئـــەو زەکاتـــە بـــۆ پێداویسـتی ڕۆژانـەیان نـەبێت " چـونکە بژێوی ڕۆژانەی ئەوان لەسەر تۆ واجبە .

کەواتە لە غەیری پێداویستی بـژێویان (النفقة) ئەگـەر یـەکێك بـوون لـە هەشـت کۆمەڵەکـە، ئـەوا لـەو بـوارەدا زەکاتیـان دەدرێتـێ . بـۆ نمونـە : ئەگـەر باوکـت سەیارەیەك بکرێت بـە (٥٠٠٠٠) دینـار وە سـەیارەکەی بسـوتێ پـێش ئـەوەی ئـەو پارەیـە بـدات ئـەوا باوکـت ئـەو ئەنـدازە پارەیە قەرزدارە وە نەتوانێ ئـەو قـەرزە بداتـــەوە، ئەوکاتـــە دروســـتە کـــە تـــۆ زەکاتەکەت بدەیە باوکت، بۆ ئەوەی ئەو قـەرزە بداتـەوە " چـونکە واجـب نییـە لەسەر تۆ دانەوەی قـەرز . بـەڵام واجبـە لەسەر تۆ بژێوی باوکت .)[٢٥].

وقاعدة ذلك: أن الأقارب إذا أعطـاهم الإنسان زكاة ماله لدفع حاجاتهم وهم ممن تجب عليه نفقتهم ، فإن ذلك لايصح.

وإن أعطاهم لدفع أمر لايلزمه القيام به، فإن ذلك جائز، بل هم أحق بذلك مـن غيرهم)[٢٤].

٥- **ژن (الزوجة)**: دروسـت نییـە مێـرد زەکات بداتـە ژنـی خـۆی چونکە واجبـە لەسـەر مێـرد بـژێوی ژن و منداڵـەکانی. بـــەڵام دروســـتە ژن زەکـــات بداتـــە پیاوەکـەی، کەشایسـتەی زەکـات پێـدان بێت" چونکەبـژێویپیـاولەسـەرژنەکـەی نییە.



(٢٥) (فقه العبادات) ابن العثيمين .

گۆشەی فەتوا

( فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون )

# وەڵامی شەرعی بۆ پرسیاری خوێنەران

ئامادەکردنی : ماموستا خلیل احمد

ئەم گۆشەیەی گۆڤارەکەمان فەتوای زانایان و وەڵامی پرسیار و کێشەی خوێندەوارانی بەڕێز دەربارەی بابەتی فیقهو حەدیس و ئەو شتانەی پەیوندیان بە شەرعەوە هەیە لە ئامێز دەگرێ ، بە ویستی خوای گەورە لە هەموو ژمارەیەکدا هەڵدەستین بە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ژمارەیەك فەتوای بەسوود لە وەڵامی زانایانی متمانە پێکراو و سەرچاوەی زانستی متمانە پێکراودا .

**پ ١ / پێم خۆشە پرسیارێکتان ئاراستە بکەم بزانم حوکمی شەرع چی یە دەربارەی کڕین و فرۆشتن و بە خێو کردنی ئەو گیاندارانەی بۆ جوانی و ئارەزوو شکاندن بە کار دەهێنرین بۆ نموونە :**

**١- باڵندەی جوانی وەك : تووتی و باڵندە ڕەنگاو ڕەنگەکان .**

**٢- خشۆکەکان وەك : مارو مارمێلکەکان .**

**٣- دڕندەکان : وەك : گورگ و شێرو ڕێوی و .......... هتد .**

**ئەمانە بەکار دەهێنرێن لە بەر جوانیان یان لە بەر پێستەکانیان ، ئەووش بزانن ئەمانە گران بەهان و بەندو ماڵی دەکرێن ، بازرگانی کردن بەمانە قازانجێکی باشی تێدایە .**

وەڵام : یەکەم / فرۆشتنی باڵندەی جوانی وەك تووتی و باڵندە ڕەنگاو ڕەنگەکان و بولبول لە بەر دەنگیان کارێکی ڕەوایە ، چونکە تەماشا کردن و گوێ ڕاگرتن بۆ دەنگیان کارێکی حەلاڵە، هیچ دەقێك نەهاتووە لە سەر حەرام بوونی فرۆشتن و بەخێو کردنیان بەڵکو بەڵگە هاتووە کە ڕەوایەتی ڕاگیرکردنیان ببەخشێت بە مەرجێ خواردن و خواردنەوەیان پێ بدات وە ئەوەی لە سەری پێویستە بەرامبەریان ئەنجامی بدات ، لەو بەڵگانەش :

ئەو فەرمودەیەی ئیمامی بوخاری لە حەدیسی ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەنەس دەفەرموێ:

( كان النبي ﷺ أحسن الناس خلقاً وكان لي أخ يقال له أبو عمير – قال أحسبه

فطيما — وكان اذا جاء قال يا أبا عمير ما فعل النغير ؟ )) نغر كان يلعب به... ]

( نغـر )[(١)] جۆرێكـه لـه جۆرەكـانی باڵندە ، ئیبنولحەجەر لە كتێبی ( فتح الباری ) له میانەی ژماردنی سوودەكانی ئـەم فەرموودەیـەدا ئـەڵێت : ئـەم فەرموودەیە ئـەوەش دەگەیـەنێ حەلاڵـە منداڵ یاری بـە باڵنـدە بكـات ، باوكـان و دایكانیش واز لە منداڵەكانیان بهێنن یاری بكـەن بـەو شـتانەی حەلاڵـە یاریـان پـێ بكرێـت وە ئەوەشـی تێدایـە كـە حەلاڵـە پارە خەرج بكرێت لـەو شـتە ڕەوایانـەی منـاڵان پـێ ی ڕادەبـوێرن و خۆیانیـان پێوە خەریك دەكەن وە ڕاگرتنی باڵنـدە له قەفەسدا حەلاڵە و باڵكردنی باڵنـدەش حەلاڵە چونكه ئەوەی ( أبـو عمـير ) یـان قەفەسی كرابوو یان باڵی كرابوو هـەركام لـەو دووانـە بێـت ئـەویتریش حـوكمی یەكەمیان وەر دەگرێت ، هـەر وەهـا لـەو بەڵگانـە حەدیسـەكەی ( أبـو هريـره ) خوای لێ ڕازی بێت ریوایـەت دەكـات كـە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

( دخلت امرأةٌ النار في هرة حبسـتها لا هي اطعمتها و سقتها ولا هيَ تركتها تأكلُ من خشاش الارض)[(٢)].

واتـە ئافرەتێـك چـووە نـاو ئـاگری دۆزەخـەوە بـە هـۆی بەنـد كردنـی پشیلەیەك ، نە خـواردن و خواردنـەوەی پێدا وە نەهێشـتی بـۆ خـۆی لـە مـارو مێرووی زەوی بخوات .

كە وابوو له كاتێكدا ڕاگرتنی پشیله بـەو مەرجانـە ڕەوا بـێ ئـەوا ڕاگـرتنی باڵندەكان ڕەوایه . هەندێ لـە زانایـانیش بەخێو كردنی ئەمانەی باسمان كردن بـە ( مكروه) دا ئەنێن وە هەندێكی تریش لە زانایـان بـە حـەرامی دەزانـن ئـەڵێن : بیستنی دەنگیان و ڕابواردن بە بینینیان شتێكی پێویست نی یە و مرۆڤ پێویستی پێی نابێ ، بەڵكو لەخۆ بابیبون و خۆش گـوزەرانی و هەرزەیەتیـە ، چـونكە بـە دەنگـی گیانـداریك دڵشـاد دەبـێ كـە خولیـای فرینـەو خـەمی دەربـاز بـوون دەخوات.[(٣)]

دووەم : یەكێك له مەرجەكانی كڕین و فرۆشـتنی دروسـت ئەوەیـە ئـەو شـتەی مامەڵەی له سەر دەكرێ سوود وەرگـرتن لێی ڕەوا بێت بە بێ پێویستی بـوون كـە وا بوو مارو مارمێلكەكان سوودیان لی وەر ناگیرێت بـەڵكو زیـان بەخشـن كـەوا بـوو كڕین و فرۆشتنیان دروست نی یە .

---

(١)نەغر بێچوە چۆلەكەیە بڕوانە كتاب العين ل ٩٧٤ .

(٢)البخاري في الصحيح و مسلم ٦٢٢/٤ وغيرهم

(٣) بڕوانـە كتـێبی(الفـروع وتصـحيحه) المـرداوي( ٩/٤)، (الانصاف ) (٢٧٥/٤ ) .

سـێ یـەم : کـڕین و فرۆشـتنی گیـان دارە دڕندەکان وەك گورگ و شێرو ڕێوی و ئەوانەی کەڵپەیان هەیە دروست نی یە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێ کردوە ، هەر وەها لە بەر ئەوەی لە دەسـت دانـی ماڵی تێدایە و پێغەمبـەریش (ﷺ ) نـەهی کردوە لە فەوتاندن و لە ناو دانی سـامان بە بێ هودە[٤].

**پ ٢ / ئایـا لـە کـڕین و فرۆشـتندا ڕێژەیـەکی دیـاری کـراو دانـراوە بـۆ قازانج وەرگرتن یـان بـێ سـنوورە ؟ وە لاَمی ئـەم پرسـیارەمان دەوێ لـە گـەڵ باسکردنی بەڵگەی شەرعی .**

وەڵام / کەسـێ مـاڵێکی بـۆ بازرگـانی یان بۆ خۆی کڕی دروستە بیفرۆشـێتەوە زیاتر لە بەهاکەی خۆی کە پێی داوە بە حازر بێ یـان بـە قـەرز ، هـیچ سـنوورێك نـازانین دیـاری کرابێـت لـەوە بـەدەر دروست نەبێت ، ئەوەنـدە هەیـە سـوك و ئاسان کردن لە سەر موسڵمانان پێویستە لە بـەر ئـەو بەڵگانـەی هانـدەرن بـۆ ئـەم مەبەستە ، بەڵام ئەگەر شتێك نرخەکـەی زانراو بوو نابێ موسـڵمان بیفرۆشـێت بـە کەسـێکی نـەزان بـە زیـاتر لـەو نرخـە، مەگەر ڕاستی پێ بڵێ چونکە ئەوە جۆرە فێڵێکـی تێدایـە ، موسـڵمانیش بـرای موسڵمانە و نابێ ستەم و فێـل و ناپـاکی لەگـەڵ بکـات ، بـەڵکو دەبـێ ئامۆژگـاری بکـات هـەموو کـات پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی(الدين النصيحة) الحـديث[٥]، هەروەها لە بوخاری و موسلیم دا هاتووە لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای یەمانیـەوە کە فەرموویەتی : پەیمانم دا بە پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر نوێژ کردن و زەکـات دان و ئامۆژگـاری کردنـی هـەموو موسـڵمانێك . هـەر وەهـا لـە فەتوایـەکی تـردا ئـەڵێن: قـازانج وەرگـرتن لـە کـڕین و فرۆشـتن دا سنووری دیاری کراوی بۆ دانەنراوە بەڵکو بە پێی زۆرو کەمی بوون و داوا لە سـەر بوونـە ( العـرض والطلـب ) بـەلاَم بـۆ موسڵمان – بازرگان بێـت یـان کەسـێکی ئاسـایی- چـاکتر ئەوەیـە لـە کـڕین و فرۆشتن دا نەرم و نیان و بەخشندە بێت ، وە بـێ ئاگـایی بەرامبەرەکـەی نەقۆزێتەوە و فێڵی لێ بکات بـەڵکو مـافی برایەتی ڕەچاو بکات[٦]

**پ ٣ / ئایا حوکمی ( المقانعة ) چییە کە لە مزایەدەی ئاشکرادا دەکرێ ؟**

**( مقانعـة )ش بریتـی یـە لـەوەی هەندێ کەس لە مزایەدەی حکـومی دا**

---

(٤) وەڵامـی لیژنـەی هەمیشـەیی بـۆ لێکۆلینـەوە زانستیەکان و فەتوا دان بڕوانە کتێبی فەتاوی اللجنة الدائمة ب ١٣ ل ٣٨ فەتوای ژمارە ١٨٨٠٧ .

(٥) ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە

(٦) وەلامـی لیژنـەی هەمیشـەیی فـەتوای ژ ٤٥٥٢ کتـێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ٨٩

**دەیکەن پێکدێن لە سەر ئەوەی لە کاتی مزایەدەدا هاوبەش بن ، پاش مزایەدە جاریکی تر هەندێکیان ماڵەکە دەفرۆشنەوە بەوانی تریان ئەو بڕە قازانجەش کە دەستیان کەوتووە بە یەکسانی بە سەر هەموویاندا دابەش دەکرێت . . .**

وەلام : ئەمە کارێکی ناڕەوایە و جائیز نی یە چونکە هاریکاری یەکتر کردنە لە سەر تاوان و دوژمنکاری وە زوڵم کردنە لە فرۆشیار و خاوەنی ماڵەکە بۆ بەرژەوەندی ئەوانەی پێکهاتوون لە سەر کڕینی ، یان جاری وا هەیە لە کاتی مزایەدەدا کەسانێك بە ئاماژەکردن کەسانێکی تر قایل و بێ دەنگ دەکەن بۆ ئەوەی بە نرخێکی کەم شتەکەیان دەست کەوێت ،ئەڵێن بێ دەنگ بە و نیازم کردووە ئەگەر من کڕیم ئەوە تۆش بەشدار بیت ئەم مامەڵەیەش دروست نی یە چونکە زیان و فێڵی تێدایە لە فرۆشیار و دەبێتە مایەی بردنی ماڵەکەی بە نرخێکی کەم[٧] .

**پ ٤ / لە میانەی کڕین و فرۆشتندا پێشەکی( عربون ) دەدرێت بۆ دامەزراندنی مامەڵەکە کە بریتیە لە بڕێك پارەی کەم ئەم پێشەکی یە ماڵە فرۆشراوەکە دەبەستێتەوە ئایا حوکمی ئەم جۆرە مامەڵەیە چی یە ؟ زۆر لە فرۆشیارەکان لە کاتی تەواو نەکردنی بەها ( ثمن ) ی شتە فرۆشراوەکە لە لایەن کڕیارەوە یان پەشیمان بوونەوەی کڕیار ئەو پێشەکی یە بۆ خۆیان دەبەن ئایا ئەمەش حوکمی چی‌یە ؟**

وەلام / کڕین و فرۆشتنی (عربون) کە بریتیە لەوەی کڕیار بڕێك پارە وەك پێشەکی‌یەك = کە کەمترە لە بەها (ثمن) ی فرۆشراوەکە کە دوای بڕاندنەوەی مامەڵە بۆ زامنکردنی فرۆشراوەکە بۆ خۆی بدات بە فرۆشیار یان وەکیلی فرۆشیار بۆ ئەوەی جگە لەو کەسی تر نەیبات ، هەر وەها ئەگەر خۆی قایل بوو ماڵەکەی برد ئەوا ئەوەی لای ماوە ئەبێ بیدات ئەگەر هاتوو نەیبردوو پەشیمان بوو ئەوا دروستە فرۆشیار ماڵی خۆی بباتەوە و ئەو پێشەکی‌یەش بۆ خۆی ببات ، کڕین و فرۆشتنی جۆری پێشەکی دان دروستە ئەگەر کات بۆ تەسلیم کردنی ئەو بڕە پارەیەی ماوەتەوە دابنێت یان نا ، دروستە فرۆشیار دوای دامەزراندنی عەقدی کڕین و فرۆشتن و دوای وەرگرتنی فرۆشراوەکە داوای حەقی خۆی بکات ، ئەمانەی خوارەوە بەڵگەی دروستێتی ئەم جۆرە کڕین و فرۆشتنەی تێدایە : ئیش پێ کردنی

(٧) وەلامی لیژنەی هەمیشەیی، فەتوای ژ ١٩٦٣٧ کتێبی فتاوى اللجنة الدائمة ب ١٣ ل ١١٥ .

ئیمـامی عومــەر خــوای لــێ ڕازی بێــت ، ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت : ئەم کڕین و فرۆشتنە هیچی تێدا نی یە ، لە ( ابن عمر )ە وە دەگێڕنـەوە کـە بـە حـەلاڵی داناوە ، سەعیدی کوڕی (المسیب) و(ابن سـیرین ) وتوویانـە هیچـی تێـدا نـی یـە ئەگەر کڕیار پـێی ناخۆش بـوو بـە تـەنها ماڵەکە بگێڕێتەوە بەڵکو شتێکی لەگەڵدا بگێڕێتــەوە ، ئــەو فەرموودەیــەش کــە ڕیوایەت دەکرێت لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) کە فەرموویـەتی: (نهى عن بيع العربـــون) ئەوا حەدیسێکی لاوازەو ئیمامی ئەحمد و جگە لەویش بەلاوازیان داناوە ، کەوا بوو نابێتە بەڵگە[٨] .

**پ ٥ / حوکمی مامەڵەی ئەو کەسـە چی یە کە ئەڵێ ئـەم شـتەیەم لێ بکـڕە ئەگەر خەسارت ( زەرەرت ) کـرد ئـەوا من خەسارەکەت بۆ دەبژێرم ؟**

وەڵام / ئەگەر کڕیار بە مـەرجی گـرت کە خەسـار نابـژێرێ یـان ئەگـەر شـتەکە نەفرۆشرا ئەوا دەیگێڕێتەوە یان فرۆشیار بە مەرجی گرت و ووتـی ئـەم شـتەیەم لی بکڕە ئەگەر هاتوو خەسارت کرد ئەوا من بـۆت قـەرەبوو دەکەمـەوە ، لـەم کاتــەدا تــەنها مەرجەکـە بەتاڵــە و حســابی بــۆ ناکرێ بەڵام کڕین و فرۆشتنەکە دروستەو دامەزراوە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت:

(كلُّ شرطٍ ليس في كتـــاب الله فهـــو باطلٌ وإن كانَ مائة شـــرط )[٩]، چـونکە دامەزراندنی عەقدەکە ئەوە دەگەیـەنێ و پێویســـت دەکـــات فرۆشـــراوەکە دوای تەسـلیم کردنـی ببێتــە هــی کڕیــار و ئەویش ببێتە خاوەنی ماف لە ڕەفتار دا، ئەنجا سـودو خەسـاریش تـەنها لـە سـەر خۆیەتی و بۆ خۆی دەبێت ، هەر وەها لە بەر زیانی چاوە ڕوانکراو بە هۆی کەمتەر خــەمی کردنــی کڕیــار لــە بــازاڕ گــەرمی (ترویج ) کردن بۆ ماڵەکەی وە بە خەسار فرۆشـتنی ، هــەر وەهــا لــە بــەر ئــەوەی قسەی فرۆشیار کـە ئـەڵێ : ئەگـەر ئـەم ماڵەیـەم خەسـاری کـرد بـۆت دەبـژێرم چونکە هانـدان و فریـو دانـی تێدایـە لـەو لایەنەوە کە ماڵەکەی لە پێش چـاو واڵـی دەکات کە بازاڕی هەیـە و خەسـار ناکـاو ئەو پارەیە دەژی[١٠] .

**پ ٦ / ڕای بەڕێزتان چی یە لـەوەی هەنـدێ بازرگـان دەیکـەن کـە لەگـەڵ کڕیار دا پێکدێن لە سەر ئەوەی کڕیـار بۆی هەیـە شـتە کڕراوەکـە بگێڕێتـەوە بەڵام بۆی نی‌یە پارەکەی بباتەوە بـەڵکو**

---

(٨) وەڵامـی لیژنـەی هەمیشـەیی ، فـەتوای ژ ١٩٦٣٧ کتـێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ١٣٣ .

(٩) متفق عليه

(١٠) کتێبی فتاوى اللجنة الدائمة فەتوای ژ ١٩٦٣٧ ب ١٣ ل ١٩٨.

**تەنها بۆی هەیە شتی تر هەڵگرێ ، لەکاتێکدا هیچ شتێکی بە دڵ نەبوو فرۆشیار پارەکە لای خۆی دەهێڵێتەوە تا ئەو کاتەی کڕیار شتی تر دەبات ؟**

وەڵام / مەرجی ویستن یان نەویستن بۆ کاتێکی زانراو دروستە ، کڕیار بۆی هەیە لەو ماوە دیاری کراوەدا ئەو شتەیە رەتکاتەوە ، وە پارەکەی خۆشی کە داویەتی بە فرۆشیار وەر گرێتەوە ، بەڵام مەرجی نەبردنەوەی پارەو بردنی شتی تر لە جێگەی شتە گەڕاوەکە مەرجێکی نا دروستە و دروست نی یە کاری پێ بکرێ لە بەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێ ( كُلُّ شرط ليس في كتاب الله فهو باطلٌ وأن كانَ مائة شرط ) [١١] .

**پ٧/ ئایا دروستە گیاندار ( حیوان ) بە کێشانە بفرۆشرێت ؟**

وەڵام / بەڵێ گیاندار دروستە بە کێشانە بفرۆشرێت ، هەر وەها کڕین و فرۆشتنی بە بینین دروستە بە ئیجماع ، ئەو ئامێرانەش کە لە سکی دایە کار ناکاتە سەر ئەو حوکمەی باسمان کرد ، هەروەها خواردنیشی دروستە ،چونکە دروستە بفرۆشرێت چونکە حوکمی ئەو وەردەگرێت کەوابوو فرۆشتنی گیاندار بەو ئامێرانەشەوە- کە لە سکی دایە بە کێشانە دروستە [١٢] .

**پ٨/ ئایا بۆ موسڵمان دروستە ئۆتۆمبێل یان کەلوپەلی ناو ماڵ و ... هتد بکڕێ و بە مانگانە پارەکەی بدات؟ ئەگەر بەها ( ثمن ) و ماوەی قەرزەکەی دیاری کرد پاشان ماوەکە درێژەی کێشا و لە کاتی دیاری کراو تێپەڕی ئەوا بەهاکەی زیاتر دەبێ، زۆر لە موسڵمانانیش بیستومە فەتوای کۆڕی فیقهی ( المجمع الفقهي ) لە وولاتی سعودیة دەکەنە بەڵگە کە فەتوای حەڵاڵێتی ئەم شێوە کڕین و فرۆشتنەیان دابێ ئایا راستە ؟**

وەڵام / کڕینی ئۆتۆمبیل و کەل و پەل و شتی تر لە شت و مەك[١٣] بەقەرز بە نرخێکی زیاتر لە نرخی کڕینی حازر، بەو مەرجەی ئەو قەرزە بە ژەم ( قسط ) و لە کاتی زانراودا بیداتەوە کارێکی دروستە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێ:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ)(البقرة: من الآية٢٨٢)

وە ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

---

(١١)بڕوانە کتێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ١٩٩ فەتوای ژ ١٩٨٤٠ .

(١٢) بڕوانە کتێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ٢٨٩ فەتوای ژمارە ٣٢٣٩

(١٣) نەك دراوو ئاڵتون و زیوو ئەو شتانەی سوو (ربا) یان تێدایە دێتەجێ .

( وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا )(البقرة: من الآية٢٧٥)

ئەمەش هەمووی دەگرێتەوە : کڕین و فرۆشتنی دەستبەجێ و قـەرزی بـە ژەم (قسط) و قەرزی گرد [١٤].

**پ ٩ / لای بــــەڕێزتان زانـــــراوو ئاشکرایە جۆرێک لە جۆرەکانی مامەڵەی بازرگانی لە نێوان خەڵک و بـە تایبـەت بازرگانەکان لە نێوان خۆیاندا بریتی یـە لــە کــڕین و فرۆشــتنی دراوی جیــاواز یەکتر بە یەکتر ، بۆ نموونە : دۆلار بە ڕیاڵ و ڕیاڵ بە ( جنیە ) ی ئیستەرلینی ، ( جنیە ) بە دیناری کـوێتی ..... هتـد ، هەروەها بـۆ هـەر جـۆرە دراوێـک دوو نـرخ هەیـە ( کـڕین و فرۆشـتن )..... بۆیە پێمان خۆشـە ئـەم پرسـیارانە لـە بەڕێزتان بکـەین : (أ) ئایـا ئـەم جـۆرە مامەڵەیــە دروســتە ؟ وە بــە کـــڕین وفرۆشتن ناو دەبرێـت ؟ (ب) ئەگـەر دروســتە بەڵگــە چــی یــە لــە ســەر جیاکردنەوەی لەو شتانەی سـوو ( ربـا ) یان تێدایە کە دروست نی یە لە کـاتی گۆڕینەوەدا زیادیان لە سەر وەرگیرێت ؟**

وەڵام / ئەم شـێوە مامەڵەیـە کـڕین و فرۆشتنە لە دوو شتدا کـە سـوو (ربـا) ی تێدایە ئەمەش حەڵاڵە بە مەرجێك دەست بە دەست بکرێت واتە قەرزی تێدا نـەبێ بـا بــە زیــادو کــەم بفرۆشـرێت چـونکە هەردوو شتەکە لە ڕەگەزدا لە یەك جیـان بە بەڵگەی ئەو حەدیسەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی ( لا تبيعوا الذهب بالذهب الا مثلاً بمثل ولا تُشفوا [١٥] بعضها علــى بعض و لا تبيعوا الورق بالورق الا مثلا بمثل ولا تُشفوا بعضها على بعض ولا تبيعوا منها غائباً بناجز [١٦] ) .

پارەی کاغـەزیش لـە جـێ ی هـەردوو دراو ( ئاڵتون و زیو ) ە ، ئەو پارانەی لە پرسـیارەکەدا باسـکراوون جیـاوازن لـە ڕەگەزدا کـەوابوو دروسـتە بـە یـەکتر بـە زیادو کەم بفرۆشرێت بە مەرجێك قـەرزی تیا نەبێ ، چونکە هەموو دراوێکی کاغەز بۆ خۆی ڕەگەزەکەی تایبەتـە بـە پـێ ی ئـەو وولاتــەی دروسـتی دەکـات چـونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردوە لە بـە قـەرز فرۆشتنی ئەو جۆرانەی ( ربا ) یان تێدایە لە گەڵ یـەکتردا ئـەم مامەڵەیـەش پـێ ی دەوتــرێ ( صــرف ) [١٧] جۆرێکــە لـــە جۆرەکانی کڕین و فرۆشتن .

ب/ هەر وەها ئەو شتانەی سوو ( ربا) یـان تێدایـە وەك گـەنم و جـۆ و خورمـاو مێـوژ ئەگـەر لـە ڕەگـەزدا یـەك بـوون

---

(١٤) بڕوانە کتـێبی (فتـاوی اللجنـة الدائمـة) ب ١٣ ل ٣١٢ فەتوای ژ ١٩٤٧٩ .

(١٥) لا تشفوا. واتە : بە زیاد و کەم .

(١٦) غائب ( نا ئامادە ) ناجز ( حازر ) .

(١٧) ( صرف ) بریتیە لە فرۆشتنی دراو بە دراو .

دروسـتە بـە یـەکتر بگۆڕدرێنـەوە بـە هـەردوو مـەرجی چـونیەك و ئامـادە (التماثـل والتقـابض)، ئەگـەر لـە ڕەگەزیشدا جیاواز بوون دروستە بە زیادو کەم بگۆڕدرێنەوە بە مەرجێ قەرزی تێدا نەبێ ، زیادو کەم وەرگرتن دروست نـی یە ئەگەر هـەردوو ڕەگـەز یـەك بـوون بـە حازر بێ یـان بـە قـەرز ، وەرگـرتن و بـە قەرز دانی ئەو شـتانەی سـوو (ربـا) یـان تێدایـە دروسـت نـی یـە چ لـە ڕەگـەزدا یەکبن یان جیاواز ، هەروەها ئەگەر تەنها یەك لەوانەش بە قەرز بـێ ، مەگـەر یـەك لەو شتانە دراو ( نقد ) بێ و ئـەویتر دراو نەبێ ئەو کاتـە بـە قـەرز دروسـتە وەکـو سەلەم و ( بیع الأجل ) .

**پ١٠ / ئەو کەسانەی دوکاندارن هەر کاتەی بە نرخێـك دراو دەفرۆشـن بـە تایبەت لای ئێمـە بـەیانیان دۆلار بـەرز دەبێتەوە یان دادەبەزێت یان شـەوان ئایـا ئـەم فرۆشـیارە هـیچ تـاوانێکی لەسەرە ؟**

وەڵام / جیـاوازی نرخـی دۆلار لـە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بە پێ ی گۆڕانی دراو لـە بـازاڕدا هـیچ تـاوانێکی تێـدا نی‌یە ؟[18]

**پ ١١ / ئێمە بڕکەیەك ( مـەڕ ) مـان هەیە ئەو پاشماوەو پشـقڵەی لێـان بـە جـێ دەمێنـێ کـۆی دەکەینـەوە و قـەلا بەستەی دەکـەین ، وەلـە بـەر ئـەوەی کێڵگـەمان نـی یـە سـوود لـەم پەیینـە وەرگرین ، پرسیار لە بەڕێزتان دەکەین ئایا دروستە بیفرۆشین ؟ ئایـا پارەکـەی حەلاڵە بیخۆین ؟**

وەڵام / فرۆشتنی پەیینی پاك دروستە و هیچی تێدا نـی یـە وەك پـەیینی مـەڕو مانگاو ووشـتر ، هـەر گیانـدارێك گۆشـتی بخورێـت پاشماوەکـەی پاکـە و فرۆشتنیشـی حەلاڵـە و خـواردنی پارەکەشی حەلاڵە و پاکەو هیچ تاوانێکی تێـدا نـی یـە ، ئـەوەی کـەوا گومـان و کێشەی تێدایە ئـەو پەیینەیـە کـە پیسـە یـان پـیس کـراوە ، بـەڵام پـەیینی پـاك بـەکارهێنانی دروسـتە و فرۆشـتنی و پارەکەشی حەلاڵە)[19]

**پ١٢ / هەندێ بازرگان شت و مەك دەکـڕن و نـابینن و وەرینـاگرن تـەنها پارەکـەی دەداو وەسـلێکی لێ وەر دەگـرێ و دەیخاتـە کۆگـای ئـەو بازرگانـەی لای کڕیویـەتی ئـەمیش دەیفرۆشـێت وە بـە کەسـانێکی تـرو ماڵەکـەش هـەر لـە کۆگـای بازرگـانی**

(١٨) کتێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ٤٣٩ فـەتوای ژمارە ٣٠٣٧ .

(١٩) کتێبی (فتاوى اللجنة الدائمة) ب ١٣ ل ٤٦٣ فـەتوای ژمارە ١٨٦٤١ .

**یەکەمدایە ئایا ئەم جۆرە کارە حـوکمی چی یە ؟**

وەڵام / بـۆ کڕیـار دروسـت نی‌یـە ئـەو شـت و مەکـە بفرۆشـێت تـالای فرۆشـیار بێت و نەیهێنێتە لای خـۆی مـاڵی خـۆی یـان بـازاڕ لـە بـەر ئـەو فـەرموودە (صەحیح) انـەی لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) سـەلماون لەوانـە : ئـەم حەدیسـەی کـە دەفـەرموێ ( لا يحل سلف ولا بيع ولا بيع مـا لـيس عنـك )[٢٠] هـەر وەها ئـەم فەرموودەیـەی کـە بـە حـەکیمی کـوڕی حزام دەفەرموێ (لا تبع ماليس عنك)[٢١]، هـەروەها لـە زیـدی کـوڕی ثابـت ەوە دەگێرنەوە کە پیغەمبـەر (ﷺ):( نهـى أن تباع السلع حيث تبتاع حتى يحوز التجـار اى رحـالهم )[٢٢]، هـەروەها ئەوەشـی دەیکرێـت دروسـت نـی یـە بیفرۆشـێت تاوەکو نەیگوێزێتەوە بۆ ماڵی خـۆی یـان جێگایـەکی تـر لـە بـازاڕ لـە بـەر ئـەو فەرموودانـەی باسـکران و ئەوانەشـی باسنەکراون و ئەو مانایە دەگەیەنن[٢٣].

**پ١٣ / ئەوەی ئەمڕۆ لای زەڕەنگـەر بـاوە ئەوەیـە ئـاڵتونی بـەکارهێتراو وەردەگرن غەرامی بە(٣٠)ریال و ئاڵتونی تازەشی پێ دەفرۆشێت غەرامی بە (٤٠) ریال،ئایا حوکمی ئەم مامەڵەیە چی‌یە ؟**

وەڵام/ دروست نی‌یە ئاڵتونی خراپ بە چـاك بگوڕدرێتـەوە و سـەرای لـە سـەر وەربگیرێت ، بەڵگەش ئەو حەدیسەیە کە بوخاری وموسلیم وکەسانی تر ریوایەتیان کردوە لەبە سەر هاتی بیلال خـوای لێی ڕازی بێت کەهەندێ خورمای تازەی هێنا بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)ئەویش پـێی فەرموو ئەمـەت لـە کـوێ هێنـا ؟ بـیلال ووتـی : خۆمـان خورمـای خراپمـان هـەبوو دوو (صاع) ی ئـەوەی خۆمـانم گۆڕییـەوە بـە یەك ( صاع ) ی ئەم خورمایە بۆ ئـەوەی بیدەم بە تۆ ، پیغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی ( أُوَّه، لا تفعلْ؛ عين الربا عـين الربـا ) پێغەمبـەر(ﷺ)ڕوونـی کـردەوە ئـەو شـتەی گۆڕینـەوەی بەرامبـەر واجبـە بـە بـێ زیـاد گۆرینەوەی لەبەر چاك وخراپی سوو(ربا) یەو دروسـت نـی یـە،بـەڵام پێغەمبـەر (ﷺ) بەڕەوشـتی بـاوی فێـری کـردو خسـتیە سـەر ڕیگەیـەکی حـەڵاڵ هـانیدا خراپەکـە بفرۆشـێت و بـە چـەند دیرهـەمێك پاشـان خورمایـەکی تـازە بکرێـت لـە بـەر ئـەم بەڵگەیـە ئـەڵێین ئەگـەر ئافرەتێـك ئـاڵتونی خراپی هەبوو یـان ئاڵتونێك بـاو نـەبێ ئـەوا لـە بازاڕ دەیفرۆشێت ئەنجا پارەکـەی وەر دەگـرێ وئـاڵتونی چـاکی پـێ دەکـرێ ، ئـەو ڕێگەیـە

---

(٢٠) اخرجة الامام احمد واهل السنن باسناد صحيح .

(٢١) اخرجة الخمسة الا أبا داود بأسناد جيدة

(٢٢) رواه احمد وأبو داود و صححه ابن حبان والحاكم

(٢٣) وەڵامی شێخ ( ابن باز ) بروانە فتاوى البيوع ل ٣٢ .

دەگرێتــە بــەر کــە پیغەمبــەر ﷺ بــۆی روون کردینەوە[٢٤] .

**پ١٤ / حــوکمی شــەرع چــی یــە لــە کەســێکدا کــە ئاڵتونەکــەی دەدات بــە کارگەی ئاڵتون بۆ ئەوەی بۆی دروســت کــات زۆر جــار لــە کــاتی تواندنــەوەی ئاڵتون دا لە کارگەکان ئاڵتونی کەسێک دەگۆڕێتەوە بە هی کەسێکی تر ، بەڵام کاتێ وەری دەگرێت بە هــەمان کــێش وەری دەگرێتــەوە کــە داویــەتی ؟ ئایــا کرێی دروست کردن مەرجــە لــە کــاتی وەرگرتنــەوەی ئاڵتونەکــەی یەکســەر بیدات یان مەرج نی یە و دروســتە بــە قەرز لە سەری حساب بکرێت ؟**

وەڵام / لــە ســەر کارگــەی دروســتکردنی ئاڵتون پێویستە ئاڵتونی خەڵك تێکەڵ بە یەك نــەکات و شــتی هــەر کــەس بــە جیــا دابنێت ئەگەر عەیارەکان جیاواز بــوون ، بەڵام ئەگەر عــەیارەکان یــەك بــوون ئــەوا دروســتە و هــیچ زیــانێکی تێدا نــی یــە ، پێویست نی یە یەکسەر کرێ ی پێ بدات چونکە ئەمە کرێ یە لە سەر کــار ئەگــەر لــە کــاتی وەرگــرتنی ماڵەکــەی کــرێ ی تەســلیم کــرد ئــەوا باشــە و ئەگــەر دوای خست ئەوا دروستە[٢٥] .

وبالله التوفيق
وصلى الله على نبينا محمد
وآله وصحبه وسلم .





(٢٤) وەڵامی شێخ محمد ابن العثيمين/ فتاوی البيوع ل ٧٤

(٢٥) وەڵامی شێخ محمد بن صالح العثيمين فتاوی البيوع ل ٨٠




دوو لادان هەیە لە سەر ڕێگای خەڵکی، کە هەر دەم دەبنە هۆی تێکچوونی هاوسەنگییەکان و لە بیرکردنی ( **ڕێگای ڕاست** ) ، ئەم لادانانەش بریتین لە زێدەڕەوی ، و گوێنەدان ( الإفراط ، والتفریط ) . ئەمانە دوو دیاردەن، کە هەردەم کاریگەرییان لە سەر دۆزینەوەی هێڵی ناوەڕاست هەیە لە هەموو شتێکدا .

ئەوەی کە بەرچاومان دەکەوێ لە هەڵس وکەوتی ڕۆژانەی دەوروبەردا هەر شتێکی نامۆی تێدا بوو بزانە کە ڕەگی لەم دوو لادانە وەرگرتووە و تەنها چارەسەریش هەنگاو نانە بۆ وریاکردنەوەی خەڵك لێیان .

دیاردەیەکی زۆر باو لە ناو میللەتی خۆمان کە سەرچاوەی لەم دوو شتەوە گرتووە و بووەتە ویردی زمانی گەلێك لە خەڵکی و بێ بیر کردنەوە دەیڵێنەوە ، ئەویش ڕستەی:(نازانم و ناشمەوێ بزانم)ە. لەکاتێکدا ئەمە ئەڵێن، کە ئاگاداریان دەکەیتەوە لە هەڵەیەك یان شتێك سەر لە تاوانەوە دەردەکا ، بە گومانی خۆیان کە ئەگەر نەیزانن هیچ پرسیاریان لە سەری ناکرێ و لە ڕۆژی دواییدا وەکو نەیانکردبێ وایە .

لە ڕاستیدا نەزانین یەکێکە لەو دەستپێچ (عوزر)انەی کە بەندە لە ڕۆژی دواییدا دەتوانێ خۆی پێ ڕزگار بکا لە سزای پەروەردگار ، بەڵام ئەم نەزانینە بەو جۆرە نییە کە ئەگەر بتوانیت فێری بیت خۆتی لێ کەڕ بکەیت و وا بزانیت ئەوە دەستپێچە بۆ دوارۆژ ، جا ئەم کارە کاردانەوەی هەندێك بیروڕایە بەرامبەر بیروڕای دژ بەم شتە ، کە ئەو دەبێتە هۆی دروستبوونی دوو لادانە کە (الافراط والتفریط ) .

ئەم ووتانە لەم ماوەیەدا بە زۆری دەبیسترێ و بەرگوێمان دەکەوێ ، هۆکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ خاڵ لەوانە کاردانەوەی ئەو کەسانەی بە یەکجاری زیادەڕەوی دەکەن لە بە دواکەوتنی زانینی هەندێ شتدا کە نە خواو نە پێغەمبەر (ﷺ) پێی

ڕازی نیین وەکو پەروەردگار ئەفەرموێ:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ)[1].

واتە ئەی باوەڕ داران پرسیار لە هەندێ شت مەکەن چونکە ئەگەر بۆتان دەرکەوێت زیانتان پێ دەگەیەنێت.

وە هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ئەفەرموێ :

( إِنَّما أَهْلَكَ الَّذينَ مِنْ قَبلِكم كثرةُ مسائلِهم واختلافُهم على أنبيائِهم ) .

ئەوەی بووە هۆی لە ناو دانی میللەتەکانی پێش ئێوە زۆر پرسیار کردن و سەرپێچیکردنیان بوو لە سەر پێغەمبەرەکانیان.

وە هەر وەها هۆکارێکی تر ئەوەیە، کە خاوەنی ئەو جۆرە وتانە کە دەبیستن ئەرکی زانایان لە نەزانان قورسترە وا بۆ خۆیان لێکدەدەنەوە کە ئەگەر نەزانن لە بەلاو سزای پەروەردگار دەیانپارێزێت ، گوایە بۆی دەبێتە دەستپێچ (عوزر).

## چەند نموونەیەك لە ئەرکی زانایان:

١- ئەگەر زانستی خوێندن تەنها دەبێ لە بەر خوا بێت و ئەگەر تۆزێك مەبەستی بگۆڕێت لە باتی خێر هەمووی بۆ دەبێتە تاوان ، ئەوشتەش کەم جار مرۆڤی لیێ ڕزگار دەبێت .

٢- هەر زانستێك زیاد بکات دەبێتە ئەرکێکی زیاتر لە سەری بۆ گەیاندنی ئەگینا سزای لە سەر وەردەگیرێت .

٣- جاری وا هەیە فەتوا دەدات و زانستی پێ نی یە ، ئەمەش تەنها دێتە ڕێی ئەو کەسانەی کە بە دوای زانست دا دەگەڕێن .

٤- پێویستە لە سەر زانایان، کە لە خوا ترسان کاری هەمیشەیی یان بێت ، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ:

(إِنَّمَا يَخْشَى اللهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ)[2] .

واتە تەنها لە ناو بەندەکانی خوادا زانایان لە خوا دەترسن.

٥- پێویستە زۆر ئاگای لەلە خۆبایی بوون بێت و خۆی لە خەڵك بە گەورەتر نەزانێت و ئەمەش بە بەردەوامی ڕوو بە ڕووی زانایان دەبێتەوە .

٦- خۆ پاراستن لە شەڕە دەم و مشت و مڕ لە گفت و گۆدا ، ئەمەش زۆر قورسە مرۆڤی زانا خۆی لێ بپارێزێت .

٧- ئەبێت بەردەوام زانستەکەی دوو بارە بکاتەوە ، چونکە ئەگەر لە بیری بچێتەوە ئەوە زانستەکەی بۆ دەبێ بە تاوان.

---

(١) (المائدة: من الآية١٠١))

(٢) (فاطر: من الآية٢٨)

٨- خۆ پاراستن لە دەمار گیری و تەقلیدی کوێرانە، وە لە پێشخستنی ڕای کەس بەسەر ڕای پێغەمبەردا (ﷺ) .

٩- خۆپاراستن لە پەلە کردن لە فەتوادان ، وە زۆر بە ووردی ئەبێ بە دوایا بگەڕێ .

١٠- خۆپاراستن لە ڕق هەلگرتن لە موسلمانان، ئەمەش زۆر جار لەبەر ئێرەیی ( حەسادەت ) درووست دەبێ کە لە نیوان زانایاندا باوە .

ئەمانەو سەدان ئەرکی تر کە لە ژیانی ڕۆژانەی خاوەن زانستەکاندا پێویستن و ئەرکیان قورسە .

جا ئەو جۆرە کەسانەی ئەیانەوێ خۆیان لەوشتانە بدزنەوە ئەڵێن : ( لە ڕۆژی دوایی ئەو عوزرەم هەیە کە بڵێم: "خوایە من نەمزانی" و نەزانین یەکێکە لە دەستپێچەکانی بەندە بۆ خۆپاراستن لە ڕق و سزای خوا وەند .

بۆیە زۆر جار ئەبیسینەوە لە کاتی ئامۆژگاری کردندا خەڵکێکی ڕوو لە دین و لە خواترس( نازانم ... ، ناشمەوێ بزانم) یان کردووەتە ویردی زمان و وادەزانن ئەوەیان بەسە !! .

بۆیە دەبێ ئەم تراویلکەیە کە کۆتاییەکەی هەڵدێری خاوەنەکەی تێدایە بۆ موسلمانان ڕوون بکرێتەوە ، بۆ ئەوەی چیتر بەم فێڵەی شەیتان نەخەڵەتێن و پەیمانەکەی بەدرۆ بخەینەوە کە وتوویەتی : دەبێ هەموو بەندەکانی خودا لە ( **ڕێگای ڕاست** ) لا بدەم ) .

بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم ڕێگا خوارەی شەیتان و ڕووناکبیرکردنی موسلمانان بە تێگەیاندنیان لە لادانی ئەم ڕیگەیە دەبێ بە ڕوونی بنەبڕی هۆکارەکانی بکەین بۆ ئەوەی ئەنجامی ئەو تێکەڵ و پێکەڵ کردنە لە ناو میللەتی موسلمانی خۆماندا نەبینین ، بە تایبەتی لە ناو ئەو کەسانەی کە گەشبینن بە گەیشتن بە پەروەردگار و چاوەڕێی ئاسایشن لە ڕۆژی دوایی پر مەترسیدا ، بەم شێوەیە:

یەکەم : نابێ کاردانەوەی موسلمان بەرامبەر هیچ زیادەڕەوییەك بە گوێنەدان بێت ، هەروەکو چۆن کاردانەوەی گوێنەدان بە زیادەڕەوی نادرێتەوە ، چونکە زیادەڕەوی و گوێنەدان، دوو شتی هەڵەن و لەخاوەن هەڵە دەوەشێتەوە ، نابێ مرۆڤی ژیر و خوازیاری ( **ڕێگای ڕاست** ) ملی هیچیان بگرێت بۆ بنەبڕی ئەوەکەیان ، هەر لەم بارەیەوە شاعیر دەڵێ :

شوکر هۆشیارە( مەحوی) تێدەگا دونیا خەراباتە

کەبەد مەستی بکا ئەهلیخراپەی بۆچی لێ دەگرم ؟!

چارەسـەری، یـان هەوڵـدان بـۆ دوور کەوتنـەوە لـە هـەموو هەڵەیـەك، بـە گرتنەبەری ( ڕێگای ڕاست ) دەبێ . ئیتر ئەگەر چەند سەخت بێت بۆیە (مەحوی ) پێش ئەو بەیتەی پێشوو دەڵێ :

له پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاهو
هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی
تێدەگرم .

کەوابوو هەموو جارێ شـتی بەرامبـەر چارەسەر ناکا ، هـەروەکو چۆن هـەموو جـار ئـاگر بـە ئـاو ناکوژێتـەوە ، بگـرە هەندێ جار ئاگر بە ئاو زیاد دەکات وەکو زانایانی ( فیزیا ) دەڵێن .

ئەگەر ئەمەمان لا ڕوون بێت، ئەوەش ڕوون دەبێتـەوە کـە لـە ئـەنجامی زۆر ڕۆچوونی هەندێك لە ناو زانستخوازیدا تـا سەری لە زیادە ڕەوییەوە دەرکا" وامـان لـێ ناکـا ئێمـە دەسـت لـە زانسـتخوازی بشۆرین.

دووەم : ئەگـەر زانایـان ئـەرکیان قورسە بێگومان پاداشتیان لە خەڵکی تر گـەلێك زۆرتـرە ، وەکـو خواوەنـد دەفەرموێ :

[يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ][(٣)]

واتە: خوای گـەورە بـاوەڕداران بـەرز دەکاتەوە و ئەوانەی کە خـاوەن زانسـتن چەندین پلە بەرزیان دەکاتەوە.

وە ئەفەرموێ :

[قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الأَلْبَابِ ][(٤)]

واتـە: تـۆ _ واتـە پێغەمبـەر (ﷺ)_ پێیان بڵـێ:ئایا ئەوانـەی کـە دەزانـن و ئەوانـەی کـە نـازانن وەکـو یـەکن. تـەنها ئەوانە بیر دەکەنەوە کەخاوەن ژیرین).

سـێیەم : ئـەو ئەرکـە قورسـانەی لـە سەر زانایانە مانای وا نیە پەروەردگار لە سەر نەزان هیچـی دانـەناوە" چـونکە بـە پێویسـتی گێـڕاوە مـرۆڤ شـارەزابێت لـە ئایینەکەی بۆ ئەوەی توشی هەڵە نەیەت، چونکە (ڕێگـای ڕاسـت ) بـە بـێ زانسـت نادۆزرێتەوە، کەوا بوو هەر پێویسـتییەك کـە لـە ئیسـلامدا قەیـدی بـۆ دانـەنرابێت هـەموو رێگایـەك بـۆی پێویسـتە ، وە (**ڕێگـای ڕاسـت**) بـە پێویسـت دەگێـڕێ زانستی بۆ کۆبکرێتەوە . ئەگەر نا تاوانی نەدۆزینەوەی و تاوانی بەدوا نەگەڕانی لە سـەر خاوەنەکـەی دەنوسـرێت . وەکـو خوای گەورە دەفەرموێ :

[وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى . قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى

(٣) (المجادلة: من الآية١١)

(٤) (الزمر:٩)

وَقَدْ كُنتُ بَصِيرا . قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى] (طـه:١٢٤-١٢٦).

واتـه: هەركەسێك پشت لە قورئانەكەم بكات ئەوە ژیانێكی ناخۆشی دەدوینێ و لــە ڕۆژی دواییــدا بــە كــوێری زینــدووی دەكەینەوە.دەڵێ:خوایە بۆچی بە كوێری زیندووت كردمەوە وخۆم چاو ساغ بووم، خــــواش دەفــــەرموێ: هــــەروەها ئایەتــەكانمانت بـۆ هــات و لــە بـیرت كــرد وەهــــەروەها تــۆش ئــەمڕۆ پشــتگوێ دەخرێیت.

كەوا بـوو لــە بـیر كردنـی ئایەتــەكانی خواوەند دەبێتە هۆی پشـتگوێ خسـتنی لە ڕۆژی دوایی .

خوا هــەمووومان لــە سـزاكەی پـارێزراو بكــات و ڕێگــای زانســتی شــەرعیمان لا خۆشەویســت بكـا بـۆ ئــەوەی ( **ڕێگــای ڕاست**)ـەكەی خۆی كـە پێـی ڕازی بـووە بۆمان، بیدۆزینــەوەو بیكەینــە بەرنامــەی ژیانمان .

## ﴿من أقوال السلف﴾

١. ( من تَرَكَ حَديثاً مَعروفاً فلم يَعملْ بهِ وأرادَ لهُ عِلةً أن يطرحَهُ فهو مبتدع )[1] / نُعَيم بن حماد (رحمه الله) .

واتـه : هەر كەسێك فەرموودەیەكی ناسراو (واتـه:صحیح) واز لێ بێنێت و كاری پــێ نەكات و بەدوای ڕەخنەیەكدا بگەڕێت بۆ ئەوەی كاری پێ نەكرێت ئەوە بیدعەچی‌یە

٢. ( الجماعة : الكتابُ والسُنة ، وإنْ كُنتَ وحدَك )[1] / ابن مسعود (رضي الله عنه) . واتـه : (الجماعة) بریتی‌یە لە قوئان و سونەت ئەگەر تەنها هەر خۆشت بیت .

٣.( العلِمُ قبضات ، فإذا ماتَ عالِمٌ ذهبَتْ قبضةٌ )[1] / ابن مسعود (رضي الله عنه) . واتـه : زانسـته شــەرعیەكان چــەند مشــتێكن ، هــەركاتێك زانایــەك بمرێـت مشـتێكی لــەناو دەچێت و دەڕوات .

٤. ( إذا رويت عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) حديثاً صحيحاً فلم آخُذ بِهِ فأنـا أُشـهِدُكم أنَّ عقلـي قد ذهب )[1] / الامام الشافعي (رحمه الله) .

واتـه : ئەگەر فەرموودەیەكی (صحیح)م گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) و وەرم نەگرتوو كارم پێ نەكرد ، ئەوا ئێوە شاهید بن كە من عەقڵ و هۆشم نەماوە .

# ئامۆژگاریەك لەبارەی هاتنی مانگی ڕەمەزان

ئامادەکردنی: أحمد عبدالرحمن

وەرگێڕانی : علی عبداللّه

موعەللای کوڕی فەضل دەڵێت پێشینەکان ( صەحابە و تابیعیەکان ) لە شەش مانگی بەر لە هاتنی ڕەمەزان لە خوا دەپاڕانەوە کە خوای گەورە بیانگەیەنێتە مانگی ڕەمەزان ، وە لەپاش هاتنی ڕەمەزانیش شەش مانگ دەپاڕانەوە لەخوا کە پەرستنی ئەو مانگەیان لێ وەربگرێت ٠

وە هەروەها یحي بن ابی کثیر دەڵێت: پاڕانەوەی یەکێ لە پێشینەکان بریتی بووە لە : ئەی خوایە بمگەیەنە بە مانگی ڕەمەزان و مانگی ڕەمەزانیش بگەیەنە بە من ، وە ئەو مانگەم بۆ بەرە سەر بە قەبوڵ بوونی ئەو پەرستنەی کە کردوومە تێیدا ٠

گەیشتن بە مانگی ڕەمەزان و بە ڕۆژوو بوون تێیدا نیعمەتێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە یارمەتی بدات لەسەر ئەم پەرستنە ٠

وە بەڵگەی گەورەیی ئەم مانگەش ئەم فەرموودەیە کە باسی سێ کەسەکە دەکات کاتێك کە دوانیان شەهید دەبن ، لە پاشان ئەوی تریان دەمرێت لەدوای ئەوان لەسەر جێگەکەی، وە لە خەودا دەبینرێ کە پێش دوو شەهیدەکە کەوتۆتەوە بۆ بەهەشت ، لەم کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (( ئایا کەسی سێیەم ساڵێك نەمایەوە دوای دوو شەهیدەکە ، وە لەم ساڵەدا نەگیشتە مانگی ڕەمەزان و بە ڕۆژوو نەبوو ، وە ئەو هەموو نوێژ و کرنوشەی بۆ خوا نەبرد لەو ساڵەدا ، کەواتە ماوەی نێوان ئەم دوو شەهیدە وەکو ماوەی نێوان ئاسمان و زەویە ))[1]٠

هەر کەسێك بەزەیی بە خەڵکدا بێتەوە لەو مانگەدا ، ئەوا خواش بەزەیی بەودا دێتەوە ، وە هەرکەسێك بێ بەش بێت لەخێری ئەم مانگە ، ئەوە بێ بەش دەبێت لە خێر و پاداشتی خوا ، وە

---

(١) . رواه البيهقي وصححه الالباني في صحيح الجامع (٢٨١/١) رقم (١٣١٦)

هەركەسێك لەم مانگەدا هەوڵی توێشوی دوا ڕۆژ نەبێت ئەوا بەدبەختە.

هەروەك شاعیر دەڵێت :

أتى رمضان مزرعة العباد
لتطهير القلوب من الفساد
فأد حقوقه قولاً وفعلا
و زادك فاتخذه للمعاد
فمن زرع الحبوب وما سقاها
تأوه نادماً يوم الحصاد

واتە مانگی ڕەمەزان ـ كە كێڵگەی بەندەكانە ـ هات بۆ پاك كردنەوەی دڵەكان لە خراپە ، كەوابوو مافی ئەم مانگە بدە بە قسە و كردەوە ، وتوێشوی خۆت ئامادە بكە بۆ ڕۆژی دوایی ٠ وە هەركەسێك تۆوی دانەوێڵە بروێنێت و ئاوی نەدات ، ئاخی پەشیمانی هەڵدەكێشێت لە ڕۆژی دروونەوەی بەرهەمدا ٠

ئەی ئەو كەسەی كە ماوەیەكی زۆرە خۆت وون كردووە لێمان ، وا ڕۆژی ئاشت بوونەوە نزیك بۆوە ، ئەی ئەو كەسەی كە بەردەوام لە زیان و زەرەردایە ، وا ڕۆژی بازرگانی و قازانج كردن هات ، وە هەركەسێك ئەگەر لەم مانگەدا قازانج نەكات ، ئەدی لە چ كاتێكدا قازانج دەكات٠ وە هەركەسێك نزیك نەبێتەوە لە دۆستایەتی كردن لەو مانگەدا ئەوە بەردەوام هەر دوور دەبێت٠

شاعیر دەڵێت :

أناس أعرضوا عنا
بلا جرم ولا معنى
أساؤوا ظنهم فينا
فهلا أحسنوا الظنّا
فإن عادوا لنا عُدنا
وإن خانوا فما خُنا
فإن كانوا قد استغنوا
فإنا عنهم أغنا

واتە ئایا خەڵك پشتی لە ئێمە كردووە بەبێ تاوان و بێ مانا ، ئایا گومانی خراپ بە ئێمە دەبەن ، ئەوە بۆچی گومانی چاكمان پێ نابەن ٠ ئەگەر ئەوان گەڕانەوە بۆمان ئێمەش دەگەڕێینەوە ن وە ئەگەر خیانەتمان لەگەڵ بكەن ئەوا ئێمە خیانەت ناكەین وە ئەگەر خۆیان بێ پێویست بزانن لە ئێمە ، ئەوا ئێمەش لەوان بێ پێویست ترین ٠

چەند جار بانگ دەر بانگ دەكات : ( حي على الفلاح ) وەرە بۆ سەرفرازی بەڵام تۆ گاڵتەت پێ دێت ؟! وە چەندین جار بانگ ئەكرێی بۆ كاری چاكە بەڵام تۆ بەردەوامی لەسەر خراپە ؟!

إذا رمضان أتى مقبلاً
فأقبل فبالخير يستقبل
لعلك تخطئه قابلاً
وتأتي بعذر فلا يقبل

واتـە : مـانگی ڕەمـەزان بـەرەو ڕووت هات ، دەی تۆش بەرەو ڕووی برۆ ٠

چەندین کەس هەبوو بە هیـوای ئـەوە بوو کە بـەڕۆژو بێـت لـەم مانگـەدا بـەڵام هیواو و ئاواتەکەی خیانەتی لەگەڵ کردو پێش هاتنی ڕەمەزان چووە ناو تاریکایی قـەبرەوە ٠ وە چـەندین کـەس هـەبووە ڕۆژێـك پێشـوازی لێ کـرد و ئـەم ڕۆژەی تـەواو نـەکرد ، وە زۆر کـەس هـەبوو بەهیوای ئەوە بووە بەیانی بەڕۆژوو بێت بەڵام نەگەیشت پێی . ئێوە ئەگەر بتـان زانیبـا کـاتی مردنتـان چ کاتێکـە ، ئـەوە ڕقتـان لـە هیـواو ئـاوات خواسـتن دەبووەوە.

**عمـری کـوڕی عبـدالعزیز** لـە کۆتـا وتاریدا فەرمووی :

(( ئێـوە هـەروا بەگاڵتـە دروسـت نـەکراون وە وازتـان لێ ناهێنرێـت بـە خۆڕایی و بێ سود ، ئێوە کاتێکتـان بـۆ دیـاری کـراوە کـە خـوای گـەورە تێیـدا دادەبەزێ بۆ بڕیاردان لەنێوان بەندەکانی ، وە بەڕاستی هیوا بـڕاو و زەرەر مەنـدە هەرکەسێك لـە ڕەحمـەتی خـوای گـەورە دەرچێت ـ کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە ـ و بـێ بـەش بێـت لـە بەهەشـت کـە فراوانیەکەی فراوانی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە ٠

ئایا نابینن ئێوە لە پاشماوەو میراتـی خەڵکانی پێش خۆتان ، وە ئەوانەی دێن لەدواتان ئەم میراتە دەگرن ؟ هـەر بـەو شێوەیە تا دەگەن بە خوای گـەورە . وە هەموو ڕۆژێك هەندێکتان دەگەڕێنەوە لای خوا و بڕیاری مردنـی بـۆ دراوە، تەمـەنی کۆتـایی هـات ، ئێـوەش ماڵئاواییـان لێ دەکـەن ، لـەناو چـاڵی زەویـدا بـەجێی دەهێڵن کە سەرین و ڕایـەخی تێدا نیـە، ئەو مردووە لە کردەوە پچڕاو جیـا بـۆوە لە خۆشەویستان و، نیشتەجێی نـاو گـڵ بـووە ، وە بـەرەو ڕووی لێ پرسـینەوە بۆوە ٠ پەیوەندی نەما بەوەی کە بەڕێی کرد بەڵام هەژارە بۆ ژیـانی لەمـەو دوای، لەبەر ئەوە ئەی بەندەکانی خـوا لـە خـوا بترسـن پـێش دابـەزینی مـردن و کـاتی هاتنی، وە من ئەو قسـانەتان پـێ دەڵـێم وە نـازانم خـەڵك چـەند تاوانبـارە ئەوەندەی کە دەزانم من خۆم چەندە زۆر تاوانبارم ٠ بـەڵام مـن داوای لێبـوردن لـە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە لای ئەو )).

لەپاشـان لایـەکی عەبایەکـەی بـەرز کردەوەو دەستی کرد بە گریان و هاواری کـرد و هەنسـکی دا ٠ لەپاشـان لەسـەر مینبەرەکـە دابـەزی و نەگەڕایـەوە سـەر مینبەرەکە هەتا مرد.

ڕەحمەتی خوای لێ بێت ٠

وه شاعير دەڵێت :

يا ذا الذي ماكفاه الذنب في رجب
حتى عصى ربه في شهر شعبان
لقد أظلك شهر الصوم بعدهما
تُصيِّره أيضاً شهر عصيان
واتل القرآن وسبح فيه مجتهدا
فإنه شهر تسبيح و قرآن
واحمل على جسد ترجو النجاة له
فسوف تضرم أجساد بنيران
كم كنت تعرف ممن صام في سلف
من بين أهل وجيران وإخوان
أفناهم الموت واستبقاك بعدهم
حيا فما أقرب القاصي من الداني
ومعجب بثياب العيد يقطعها
فأصبحت في غد أثواب أكفان
حتى متى يُعمِّر الانسان مسكنه
مصير مسكنه قبر لإنسان

واته ئەی ئەو کەسەی کە وازی نەهێنا لە تاوان کردن لە مانگی ڕجەب دا ، وا سەرپێچی پەروەردگاری کرد لە مانگی شەعبانیش دا . وە بەڕاستی وا مانگی ڕۆژووش لەدوای ئەو دوو مانگانە باڵی کێشا بەسەرتا ، کەواتە ئەم مانگەش مەکە بە مانگی سەرپێچی کردن . هەوڵ بدە زیکر و قورئانی تێدا بخوێنە، چونکە ئەوە مانگی زیکر و قورئان خوێندنە ، خۆت هیلاك بکە و یارمەتی لاشەیەك بدە کە دەتەوێ ڕزگاری بکەی ، چونکە لەمەودوا زۆرێك لە لاشەکان بە ئاگر دەسوتێنرێن .

تۆ چەندین کەست دەبینی کە بەڕۆژو بوون لەپێش تۆ لە خزم و دراوسێ و براکانت. کەچی مردن ئەوانی لەناو برد و لەدوای ئەوان تۆی بەزیندوویی بەجێ هێشت . ئای ئەو مردنەی بەدوری دەزانی چەند نزیکە !

هەی وا بووە دڵی خۆش بوو بەجلەکانی جەژنی ، بەڵام بۆ بەیانی لێی بوون بە کفنی ناو گۆر!.

تا کەی مرۆڤ جێگای نیشتەجێ کاتیەکەی خۆی ئاوەدان دەکاتەوە ، کە بێگومان ئەو شوێنەی ڕۆێك لە ڕۆژان دەبێت بە گۆڕی کەسێك !.

*****************

( إنّما سُميت الدُنيا لأنها دَنَت ، و إنّما سُميَّ لأنَـهُ يميـل )[٢] / الامام سفيان الثوري (رحمه الله) .

واتە : دونیا بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە ئادەمیزاد کەم نرخ و سوك دەکات وە (مال/واتە:پارە) بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە ئادەمیزاد لار دەکاتەوە و لە خشتەی دەبات .

(٢) انظر : (الحلية) لابي نعيم الاصبهاني (٧/١٠، و(المجالسة) للدينوري برقم (٦٨) وقال محققه : سنده حسن .

# فەزڵەکانی مانگی رەمەزان وە هەندێ لەحوکمەکانی

مامۆستا عبداللطیف.

## فەزڵەکانی مانگی رەمەزان

گەورەیی و بەرەکەتیرەمەزان لەوخالآنەی خوارەوە دەردەکەوێت : مانگێکە:

١. شەوی (لیلة القدر)ی تێدایە کەخێری لەهەزار مانگ زیاترە ﴿ليلة القدر خير من ألف شهر﴾القدر.

٢. قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە کەهیدایەتدەری مرۆڤە بۆ هەموو خێرو چاکەیەك و بەختەوەری بەردەوامی وە رێ رۆشنکەرەوەیانە ﴿شهر رمضان الذي أُنزل فيه القرآن، هدى للناس وبيِّنات من الهدى والفرقان﴾البقرة.

٣. هەموو دەرگاکانی دۆزەخی تێدا دادەخرێن.

٤ . وە گشت دەرگاکانی بەهەشتی تێدادەکرێنەوە.

٥ . شەیتانەکان و جنۆکە سەرکەشەکانی تێدا زنجیر پێچ دەکرێن و دەبەسترێنەوە لە خراپکردنی بیروباوەڕو رەوشتی رۆژوەوانان .

٦. کاری چاکەکردنی تێدا سوك و ئاسان دەبێت .

٧. خراپەکاری تێدا بێزراوو نارەحەت دەبێت .

٨. بەرۆژووبونی بەئیمانەوە و چاوەڕێی پاداشتەوە دەبێتە هۆی لێخۆش بوونی گوناهی ڕابردوو .

(من قام رمضان إيمانا واحتسابا غفر له ماتقدم من ذنبه)[1] (ورمضان إلى رمضان مكفرات لما بينهن إذا اجتنبت الكبائر )[2]

---

(١) متفق عليه

(٢) صحيح مسلم

٩. وەهەروەها شەونوێژە کانیش (تەراویح) وەك ڕۆژوەکە ڕەشکەرەوەی گوناهەکانن .( من قام رمضان إيمانا واحتسابا غفر له ماتقدم من ذنبه)[٣]

١٠. دوعاو پاڕانەوەی تێدا قەبوڵ دەبێت.( وأن لكل مسلم دعوة يدعو بها فيستجاب له )[٤]

١١. وە لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا خەڵکانێك ئازاد دەکرێن لەدۆزەخ و بڕیاری نەچوونە ناودۆزەخیان بۆدەدرێت.

(إذا كان أول ليلة من شهر رمضان ، صفدت الشياطين ومردة الجن، وغلقت أبواب النار فلم يفتح منها باب، وفتح أبواب الجنة فلم يغلق منها باب، وينادي مناد: يا باغي الخير أقبل، ويا باغي الشر أقصر، ولله عتقاء من النار، وذلك كل ليلة)[٥].

وە بەڵگەی گەورەیی ئەم مانگەش لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ کە باسی دوو کەسەکە دەکات کاتێك کە یەکێکیان شەهید دەبێ ، لە پاشان ئەوی تریان دەمرێت لەدوای ئەو لەسەر جێگەکەی ، وە لە خەودا دەبینرێ کە پێش شەهیدەکە کەوتۆتەوە بۆ بەهەشت ، لەم کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((ئایا کەسی سێیەم ساڵێك نەمایەوە دوای دوو شەهیدەکە ، وە لەم ساڵەدا نەگەیشتە مانگی ڕەمەزان و بە ڕۆژوو نەبوو ، وە ئەو هەموو نوێژ و کڕنوشەی بۆ خوا نەبرد لەو ساڵەدا ، کەواتە ماوەی نێوان ئەم دوو کەسە وەکو ماوەی نێوان ئاسمان و زەوییە، واتە پلەو شوێنی دووەمیان بەرزترە ! ))[٦].

کەواتە براوخوشکی موسوڵمان ئەم هەموو خێرو بەرەکەتە لەدەست خۆت مەدە کە لەم مانگە پیرۆزەدا هەیە وخۆتی لێ مەحروم مەکە، ئەگینا لەهەموو خێرێك مەحروم دەبیت.

لەبەرئەوە هەوڵ بدە ئەم عیبادەتە پیرۆزانەی خوارەوەی تێدا بکەیت:

**یەکەم :**

## بەڕۆژووبونی مانگەکە بەتەواوی

چونکە ڕۆژوو گرتن بەگشتیو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بەتایبەتی فەزڵ وخێرو پاداشتێکی زۆر زۆری هەیە وەك لەمەودوا دەردەکەوێت .

### فەزڵەکانی ڕۆژوو گرتن

١ـ لێخۆش بوونی گوناه (من صام رمضان إيماناً واحتساباً غُفر لة ما تقدم من ذنبه).

---

(٣) متفق عليه

(٤) أحمد والبزار: صحيح.

(٥) الترمذي ٦٨٢ حديث حسن.

(٦) أحمد : ١٤٠٣، ٨٣٨١، ٨٣٨٠ . وصحيح الترغيب ٣٦٨ .

٢ـ پاداشتێکی بێ حیساب و بێژمار لەحەدیسێکدا هاتووەکەماناکەی ئەوەیە: هەموو کردەوە چاکەکانی مرۆڤ پاداشتی چەند جارەی بۆ هەیە و چاکەیەك بە (دە) چاکە دەنوسرێت تا (٧٠٠) قات پەروەردگار فەرموویەتی تەنها ڕۆژوو نەبێت (واتە ڕۆژوولەحەوسەت چاکە زیاتریش بێ حیساب پاداشتیەتی) وەڕۆژوو بۆمنە من خۆم پاداشتی ڕۆژوو دەدەمەوە چونکەڕۆژوەوان وازدەهێنێت لەخواردن وڕابواردنی لەبە رخاتری من)[٧]

٣. تامو بۆنی دەمی ڕۆژوەوان خۆشترەلەبۆنی میسك وەك لەحەدیسدا هاتوە[٨].

٤. ڕۆژو قەڵغانی خاوەنەکەیەتی و لەئاگری دۆزەخ دەیپارێزێت. (الصيام جنه يستجن بها العبد من النار )[٩]

٥ــ ڕۆژوو لەگەڵ قورئان خوێندن شەفاعەت دەکەن بۆخاوەنەکانیان لەڕۆژیدوایی . ڕۆژوو دەڵێت : ئەی پەروەردگار من خواردن و ڕابواردنم قەدەغەکردبوو لەم ڕۆژوەوانە بۆیە بەمنیببەخشەو بەرتکای منی بخە. وە قورئان دەفەرموێت : من خەوم لێ منع کردبوو بەشەوو دەی بەرشەفاعەتی منی بخە[١٠] .

٦. ڕۆژوو دەرگایەکی تایبەتی بۆ دانراوە لەبەهەشتدا پێی دەوترێ (الريان) و ڕۆژوەوانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا پیایدا دەچنە ناوەوە ، وە کەئەوان چونە ناوەوە دادەخرێت و ڕێگا بەکەسی تر نادرێت پیایدا بچێتە ناو بەهەشت وە هەر کەسێکیش پیایدا چووە ژورەوە خواردنەوەیەك دەخواتەوە کەتینوێتی دەشکێنێت وقەت تینوی نابێتەوە [١١].

**دووەم: شەو نوێژ ( قيام الليل ـ صلاه التراويح )**

واتە ئەو یانزە ڕەکعەتەی کە زیاتر شەوانی ڕەمەزان بە جەماعەت لە مزگەوتەکان دەکرێت زۆر زۆر خێر ێکی گەورەی هەیە و پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( من قام رمضان إيماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه )[١٢] .

واتە هەرکەسێك ئەو یانزە ڕەکعەتەی شەوانی ڕەمەزان بکات بە بیرو باوەڕێکی تەواو و چاوەڕێی پاداشتەوە ، ئەوا خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت ٠

وە دروست نیە لە شوێنی تەراویحەکان نوێژە چووەکانت

(٧) صحيح مسلم.

(٨) (متفق عليه).

(٩) أحمد :٣/٢٤١ صحيح.

(١٠) (أحمد: ٦٦٢٦ وسنده حسن ).

(١١) (متفق عليه، و ابن خزيمة ).

(١٢) خ:٣٧ ، م:٧٥٩.

بگێڕیتەوە،چونکە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستی لەسەر نییە.بەڵکو فەرمودەی سەحیح لەسەر ئەوەیە کە سوونەتەکان کەلێن و کەم وکورتی فەرزەکانیان پێ پردەکرێتەوە لەرۆژی لێپرسینەوەی دواییدا. وەقیاسی نوێژیش ناکرێتە سەر رۆژوو چونکە دوو عیبادەتی لێك جیاو سەربەخۆن و جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا، هەروەك دەبینین ئافرەت کە بەهۆی حەیزەوە نوێژو رۆژوی نەکردووە ، تەنها رۆژوەکانی دەگێرێتەوە نەك نوێژەکانیشی!. وە سوننەتە بە جەماعەت تەراویحەکەت بکەیت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( إن الرجل اذا صلى مع الإمام حتى ينصرف حسب له قيام ليلة)[١٣]. واتە ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ ئیمام بە جەماعەت نوێژەکانی شەوی کرد تا تەواو دەبێت ئەوە نوێژی تەواوی شەوەکەی بۆ حیساب دەکرێت ٠

وە دە شەوی ئەخیری مانگ بەتایبەتیش تاکەکانی زۆر خێرە کە زۆر بە گەرمی و چالاکیەوە عیبادەتی خوای تێدا بکرێت و نوێژەکان تەواوتر و درێژتر بکرێن و بە خشوع و لە خوا ترسانەوە ئەنجام بدرێن و قورئانیان زۆر تێدا بخوێندرێن و زیکر و دوعای زۆریان تێدا بکرێن ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو دە شەوەدا دوور دەکەوتەوە لە خەو و خێزان ، وە ماڵەوەی هەڵدەستاند بۆ عیبادەت و بە درێژایی شەوەکە نوێژی دەکرد چونکە لەم دە شەوەدا شەوێك لە شەوەکان شەوی قەدرە ( ليلة القدر ) کە خێری زیاترە لە هەزار مانگ و هەر کەسێك لەو شەوەدا نوێژەکان بکات بە ئیمان و چاوەڕێی پاداشتەوە، ئەوە خوا لە گوناهی ڕابردوو و(داهاتووی) خۆش دەبێت إن شاء الله ٠ وەك لە حەدیسدا هاتووە ( من قام ليلة القدر [ثم وُفِّقت له] إيماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه وما تأخر )[١٤] .

**بەڵام سوننەتە دە شەوەکە بە نوێژ و زیکری سوننەتی و دوعاو پارانەوە خوا و قورئان خوێندن ببرێنە سەر، نەك بە ئاهەنگ گێڕان و کۆڕ بەستن و وتار لە دوا وتار و پەندی پێشینان و دەفە لێدان و سرود وتن و دوعای جەماعی و ئایا دەزانی ٠٠٠ ؟!!**، چونکە بەتایبەت لەم دە شەوانەدا پێچەوانەی سوننەتی (سەلەف)ە . پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم دە شەوەدا یانزە رکات نوێژی دەکرد لەدوای عیشاوە تاوەکو پێش نوێژی بەیانی زۆر بە لەسەرخۆیی و ئارامی

(١٣)صحيح سنن الترمذي. وصحيح سنن ابن ماجة: ١٠٩٢.

(١٤) ( متفق عليه ، والزيادة لأحمد)

وتەواویــــەوە. وە لـــە نوێژەكەیــدا زۆر ڕادەوەســــتا و قورئـــــانی زۆری تێــــدا دەخوێنــد و لەســــەر هـــەموو ئایـــەتێك دەوەستا و لە ئایـەتی ڕەحمـەت دوعـای دەكـرد و لــە ئایــەتی باســی غــەزەبیش پەنای بەخوا دەگرت و لە ڕكوع و سجود زۆر دەمایـەوە بەتایبـەتی لـە سـوجدەدا بەئەنــدازەی ئــەوەی كەپــەنجا ئایــەت دەخوێندرێتەوە، وە زیكری تێدا دەكردن و دوعــای زۆری دەكـرد لــە سـجودو زۆر داوای عەفوی دەكرد و دەیوت:

(اللهم إنك عفوٌ تحب العفو فاعف عني)

وە هاوەڵانیشـی ﷺ كــە پێشــینە و پێشــەوای ئێمــەن تــەنها خــەریكی ئــەو یانزە ڕ ەكعەتـە دەبـوون تـاوەكو پـێش بـــەیانی وەكــو ئیمــام مالــك بۆمــــان دەگێڕێتەوە :

(أمر عمر بن الخطاب أبي بـــن كعـــب وتميما الداري أن يقوما للناس بإحدى عشر ركعة، وقد كان القاريء يقـــرأ بـــالمئين ، حتى كنا نعتمد على العصي مـــن طـــول القيام، وما كنـــا ننصـــرف إلا في بـــزوغ الفجر)[١٥].

وە قورئـــــــــان وەســــفی بەنـــــدە خـــوا پەرستەكانمان بۆ دەكات بە شــەو نوێژ و ڕاوەستانی زۆر و سجود و ڕكوعی درێژ تیایدا بە ترس و خشوعەوە و ، بـە ئومێدی پاداشتەوە نەك بە كوڕ و ووتـار و زیكـر و دوعــای بــە دەنگــی بــەرز و جەماعیيەوە:

﴿أمن هو قانت آناء الليل ساجدا وقائما يحذر الاخرة ويرجو رحمة ربه﴾ وە ﴿والذين يبيّتون لربهم سجدا وقياما ﴾.

وە پێویســتە وریــا بــین لــە سـیفاتی مونافیقان كە كاتێك هەڵدەستن بـۆ نوێـژ زۆر تـەمبــەڵ و بــێ ئــارەزوون و زیكــری خوای كەم تێدا ئەكەن :

(وإذا قاموا إلى الصلاة قاموا كسالى يراؤون الناس ولا يذكرون الله إلا قليلا).

وە پێویســـتە خۆمـــان ڕابهێـــنین ووردە ووردە نوێژەكانمان وەكو پێشینە چاكەكانمان ( السلف الصـــالح ) بكـەین نەك وەكو مونافیقەكان .

**سێهەم : زۆر قورئان خوێندن بەهۆش و بیر لێ كردنەوە و خشوع و لە خوا ترسان**

وە هــەوڵ بـدە زۆر قورئـان بخوێنیـت لەو مانگەدا هەموو كاتێك بـە تایبـەتیش شــــەوانە چـــونكە قورئـــــانی پـــیرۆز دابەزینەكەی لەشـەودا بـووە كـە شـەوی قـدر ( لیلـــة القـــدر )ە ، وە هــەروەها پێغەمبەر (ﷺ) هەموو شەوێك دیراســەی قورئانی دەكرد لەگەڵ جبریل لە شەوانی ڕەمەزاندا . كەواتە شـەوانت بـە قورئـان

(١٥) مالك بسند صحيح.

خوێنـدن و لێ وورد بوونـەوە و دیراسـە کردنی ببە سەر ، وە نەخوێندەواران با گـوێ لـە قورئـان خوێنـەکان یـا شریتەکانیان بگرن . وە قورئـانی پـیرۆز هـاوەڵ لەگـەڵ ڕۆژوودا، شـەفاعەتت بـۆ دەکەن، ڕۆژوو دەڵێت : ئەی پەروەردگار بە ڕۆژ من بوومە ڕێگری ئەو موسـوڵمانە لە خواردن و خواردنەوە دەی بۆ خاتری من لەو بەندەیە خۆش بە ، وە قورئانیش دەفەرمووێت : منـیش شـەوانە خـەوم لێ هەڵگرتبوو دەی بمکە بە شەفاعەت کاری و بە منی ببەخشە .

وە قورئـان خوێنـدن پاداشـتی زۆری هەیـە کـە لەبـەر خـاتری خـوا بـە تـەنها بخوێندرێت وە نەکرێتـە وەسـیلەیەك بـۆ پارە پەیدا کردن و شـوهرەت وەدەسـت هێنـان ! ! وە گـرنگیش ئەوەیـە موسوڵمانی تێگەیشـتوو کـار بـە قورئـان بکـات و شـوێنی بکـەوێت نـەك تـەنها خوێندنـەوەی ، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی ( أكثر منافقي أُمتي قراؤها ) واتە زۆربەی مونافیقەکانی ئوممەتی مـن قورئـان خوێنـەکانن ـ پـەنا بـەخوا ـ لـەو سیفەتە خراپە .

**چوارەم : زیکر و دوعا**

پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : هـەر کەسێ نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکـات لە پاشان دانیشێ زیکری خـوا بکـات تـا ڕۆژ هەڵدێ ، لە پاشان دوو ڕەکعەت نوێژ بکـات ، ئـەوە وەك خێـری حـەج و عومرەیەکی تەواوی هەیە ـ وە هەروەها دوا نوێژی عەسر و پێش مەغریب :

﴿یـا ایهـا اللـذین آمنـوا اذکـروا الله ذکـرا کـثیرا وسبحوه بکرة وأصیلا﴾ ﴿قبل طلوع الشمس وقبل الغروب﴾ .

دوعا کردن کاتی بەربانگ و سێیەکی کۆتایی شەو بەتایبـەت ( ليلة القـدر ) و نێوان بانگ و قامەت و سەعاتی ئـەخیری ڕۆژی جومعـە و لـە سـوجدەدا و دوای نوێژەکانیش پێش سەلام دانەوە .

**پێنجەم : خێر و چاکە**

**( ماڵ و خواردن بەخشین )**

پێغەمبـەری خـوا (ﷺ): ( كان أجـود الناس وأجود ما يكون في رمضـان حـين يلقاه جبريل ـ فيدارسه القرآن )[16] .

واتە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لـە هـەموو کەس بەخشندەتر بوو، وە لە ڕەمەزانـدا لە هەموو کاتێك زیاتر بەخشندە بوو، وە داوای هەر شـتێکی لێ کرابـا دەیبەخشـی لە پێناوی خوا ، بـە فـەقیر و هـەژاران و بەو کەسانەش کە دڵی گۆش دەکردن بۆ ئیسلام.

وە خۆی بـە ژیـانێکی کـەم و کـەفاف ڕازی دەبوو و زیاد لەوەی دەیبەخشی .

(١٦) متفق عليه.

وە بــە عــیلم و ئامۆژگــاری و مــاڵ و سامان و نەفس لە خزمەت موسـوڵمانانـدا بوو و ، بە هەموو شـێوەیەك بەخشـندە بـوو لەگەڵیانـدا و لەبەرامبەریشـدا داوای هــیچ پاداشــتێكی لــە خــەڵك نــەدەكرد ﴿ قل لا أسئلكم عليه من أجر ﴾ ، وە بـا ئێمــەش لەبــەر خــاتری خــوا وە شــوێن كەوتن بـۆ پێغەمبـەرانی خـوا بەخشـندە بین بەم شێوەیە :

١ـ خێر و صەدەقە كردن بـە فـەقیر و هەژاران و لێ قەوماوان ، چـونكە خێـر و صــەدەقە بــە خالسـی بـۆ خـوا گونـاهو تاوان دەكوژێنێتەوە ٠

٢ـ خواردن بەخشین بە جیران و خزم و میــوان و هـــەتیوو هـــەژار و كەســـانی برسی لەبەر خـوا ، كـە ئـەوەش دەبێتـە هۆی چوونە بەهەشت و ڕزگـار بـوون لـە ئاگر و سزای دۆزەخ ، وەك پـەروەردگار دەفەرمووێت :

﴿ ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيرا ، إنما نطعمكم لوجه الله لا نريد منكم جزاء ولا شكورا ، إنا نخاف من ربنا يوما عبوسا قمطريرا ، فوقاهم الله شرّ ذلك اليوم ولقاهم نضرة وسرورا ، وجزاهم بما صبروا جنة وحريرا ﴾ .

٣ـ بـەربانگ بەخشـین بـە ڕۆژوەوان : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( من فطّــر صائما فله مثل أجره من غير أن ينقص من أجر الصائم شيء )[17] .

واتە هــەر كەسـێك بـەربانگ بـدات بـە ڕۆژوەوانێـــك ئـــەوە بـــە ئەنـــدازەی ڕۆژوەوانەكە ئەجری هەیە، بێ ئەوەی لە ئەجری ڕۆژوەوانەكەش كەم بێتەوە ٠

**شەشەم :**

## تەقوا كردنی خواو خۆ پارێزی

لــە نەهیــەكانی و تــوڕەیی و ســزا و دۆزەخەكـــەی بـــە گوێڕایـــەڵی كردنـــی فەرمانەكانی و زۆر زیكر و یـاد كردنـی و بەردەوام هەسـت كـردن بـە چـاودێری و موڕاقەبەی خوا ٠

وە لـە ڕاسـتیدا تـەقوا كردنـی خـوا و خۆڕاهێنــان لەســەر موڕاقەبــەی خــوا ، گـــەورەترین حیكمـــەت و ئامانجـــەكانی ڕۆژوو گرتنە. وە كـە سـەیری سـەرەتا و كۆتایی ئایەتەكانی ڕۆژوو بكەین دەبینین هانی داویـن بـۆ تـەقوا كـردن ﴿ لعلكـــم تتقـــون ﴾ ﴿ لعلـــهم يتقـــون ﴾ واتـە : پەروەردگار ڕۆژووی لەسەر واجب كروون و حوكمەكانیشـی بـۆ ڕوون كردوونـەوە بـەڵكو بـە تـەقوا بـن و خـۆ پـارێزبن لـە خراپە و تاوان ٠ مەبەست لە ڕۆژوو گرتن ئەوەیـە موسـڵمان دڵ و زمـان ولا شـەی خـۆی پـەروەردە بكـات و ڕای بهێنێـت

(١٧) الترمذي:٨٠٤. وصححه وهو كما قال.

لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ خوا ، وە لەبەر خاتری خوا لە کاتی ڕۆژوو دا وازبهێنێت لەو ئارەزوانەی کە لە بنەڕەتدا بۆی حەلاڵن، وەك خواردن و خواردنەوە و جیماعی خێزانی خۆی، کەوابوو چاکتر و زیاتر پێویستە لە پێناوی پەروەردگار واز بهێنیت و دوور کەویتەوە لەو ئارەزوانەی تریش کە لە بنەڕەتدا و لە هەموو کاتێك هەر حەرام و قەدەغە کراون ، وەك درۆ و بوهتان و دووزمانی و غەیبەت و ئاژاوە نانەوە و نەزەر و گوێ گرتن لە مۆسیقا و گۆرانی و دانیشتن بەرامبەر تەلەفزیۆن و سەتەلایت بۆ بینینی بەرنامە و فلیمی ڕووت و بێ شەرعی ٠

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

١- ( من لم يدع قول الزور والعمل بـه فليس لله حاجة في أن يدع طعامه وشرابه)[١٨] .

واتە هەر کەسێك واز نەهێنێت لە قسەی درۆو ناحەق و کردەوەی خراپە و ناڕەوا ئەوا خوای گەورە هیچ پێویستیەکی بەوە نیە کە واز لە خواردن و خواردنەوەی بهێنێت و ڕۆژوەکەی خێری نیە ٠

٢ـ ( ربّ صائم حظه من صيامه الجوع والعطش )[١٩] .

واتە : ڕۆژوەوانی وا هەیە بەشی لە ڕۆژوەکەی تەنها برسێتی و تینوێتی‌یە (واتە هیچ خێری نیە چونکە دڵ و زمان و لا شەی نەپاراستووە لە گوناهو خراپە و ئازاردانی موسوڵمانان ) وە بەو مەرجە ڕەمەزان دەبێتە مایەی ڕەش بوونەوەی گوناهەکانت کە خۆت دوور بگریت لە گوناهە گەورەکان:

( و رمضان إلى رمضان مكفرات لما بينهنّ ، ما اجتنبت الكبائر) ٠

٣ـ ( ليس الصيام من الأكل والشراب إنما الصيام من اللغو والرفث فإن سابك أحد أو جهل عليك فقل إنّي صائم إنّي صائم)[٢٠] .

واتە : ڕژوو گرتن تەنها خۆ گرتنەوە نیە لە خواردن و خواردنەوە ، بەڵکو خۆ گرتنەوەیە لە قسەی پڕ و پوچ درۆ و جنێو و ناحەق، لەبەر ئەوە ئەگەر یەکێك جنێوی پێدایت یان نەفامێتی بەرامبەرت نواند ئەوە تۆ بڵێ من بەڕۆژووم من بەڕۆژووم ٠

******************

(١٨) البخاري.

(١٩) الدارمي ٢/٢١١/ صحيح

(٢٠) صحيح . ابن خزيمة:١٩٩٦والحاكم:١/٤٣٠.

**حەوتەم :**

## تەوبەو داوای لێ خۆش بوون كردن

﴿ أفلا يتوبون إلى الله ويستغفرونه والله هو الغفور الرحيم ﴾

وە بە تايبەت لە كاتی سحور :

﴿ وبالأسحار هم يستغفرون ﴾

موسـولْمانی كەمتەرخـەم : گـەر لـەم مانگە تەوبە نەكەيت كە لە هەموو شەوو ڕۆژێكـدا خـەڵكانێك ئـازاد دەكـرێن لـە دۆزەخ و بڕیاری نەچوونە ناو دۆزەخیان بـۆ دەدرێـت، كـەی تەوبـە دەكـەیت؟! دەی تا ئەوكاتـە پـیرۆزەی دوعـا قـەبوڵ بوون و خوا لێ خۆش بوونت بەدەستەوە مـاوە لـە ڕەمەزانـدا بـە زووتـرین كـات بگـەڕێوە لای پـەروەردگارت و داوای لێ خـۆش بـوونی لێ بكـە و بەڕاسـتی بيپەرسـتە و شـوێن قورئـان و نێردراوەكەی بكەوە ٠ وە هەركەسێك بە زمان داوای لێ خۆش بوون بكات ، بـەلاَم دڵەكـەی هـۆگری تـاوان بێـت و نیـازی گەڕانـەوەی هـەبێت ـ دوا ڕەمـەزان ـ بـۆ سەرپێچیەكانی پـێش ڕەمـەزان " ئـەوە ڕۆژوو گرتنەكـەی بـێ فايدەيـە و تۆبەكەيشی گاڵتەيە ٠

كەواتـە نيـەت و ئـيرادەت پتـەو بكـە لەسـەر خـوا پەرسـتی بـە بـەردەوامی و ئيسـتيقامەتت بـێ چـونكە عاقيبـەت حيسابە و ئاخير خێری گرنگە ٠

وە سوپاسی خوا بكە لەسـەر ئـەوەی كە لەو مانگەدا زياتر هيدايـەتی داويـت و دەرگـای دۆزەخـی بـۆ داخسـتويت و دەرگاكـانی بەهەشـتی بـۆ كردويتـەوە ، كەواتە چۆن جارێكی تر دوای ڕەمـەزان ئـەم فەزڵـە لەدەسـت خـۆت دەدەيـت و پشـت لـە مزگـەوت و خواپەرسـتی دەكەيتـەوە و ڕوو دەكەيتـەوە خراپـە و ڕيسەكەت دەكەيتەوە خوری ﴿ كالتي نقضت غزلها من بعد قوة أنكاثا ﴾ و بـەرەو ئـاگر دەڕۆيـت!!. موسـولْمانی ژيـر پێويسـتە خوا بپەرستيت تا مردنـت ﴿واعبد ربك حتى يأتيك اليقين ﴾ چونكە ئـەوەی لـە ڕەمەزانـدا دەيپەرسـتيت بـە ڕۆيشـتنی ڕەمـەزان ناڕوات ٠ وە هـەروەها لـە خۆبـايی مەبـە بـەو چـەند ڕۆژ عيبادەتـەی ڕەمـەزانت بـەڵكو مەترسـی ئـەوەت بێـت لێـت وەرنەگرێت ، چونكە پـەروەردگار تـەنها عيبـادەتی تـەقواداران قـەبوڵ دەكـات ﴿ إنما يتقبل الله من المتقين ﴾ وە مەترسـی ئـەوەت هـەبێت بـە تـەواوی ئـەنجامت نـەدابن و ڕۆژی قيامـەت ڕوو زەردی لای خوا بی٠

﴿ الذين يؤتون ما آتوا وقلوبهم وجلة أنهم إلى ربهم راجعون ﴾٠

******************

## حوكمی رۆژووگرتنی رەمەزان

پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی باڵغی عاقڵ کە لەسەفەردا نەبێت و نەخۆشیش نەبێ، ئەو مانگە بەتەواوی بەرۆژوو بێت وەئەمە روکنێکی ئیسلامە. بەڵام ئافرەت لەکاتی (حـيض)و(نفـاس) نابێت بەرۆژوو بێت ودوایی دەیانگرێتەوە بەڵام لە غەیری ئەم دوو حاڵەتە پێویستە بەرۆژوو بێت ئەگەر خوێنی (استحاضة)ش ببینێت .

وە ئەگەر پاك بۆوە لە حەیز لە سەرەتای رۆژدا ، ئەوە پێویست ناکات بە رۆژو بێت هەروەك لە قسەی زانایانەوە دەردەکەوێت ، چونکە هیچ رێی تێ ناچێت بەشێك لە رۆژ بەرۆژو بێت و بەشەکەی تری بە رۆژو نەبێت ٠

بەڵام ئەگەر ئەو ئافرەتانە پاك بوونەوە لە حەیز و نیفاس پێش بانگی بەیانی ئەوە پێویستە ئەو رۆژە بەرۆژو بن ئەگەر خۆشیان نەشوشتبێت ٠

### وە ئەوانەی کەبۆیان هەیە بەرۆژو نەبن ئەمانەن:

١ ، ٢. پیرەمێردو پیرەژن ئەگەر قورس و نارەحەت بوو لەسەریان و نەیان توانی. بۆیان هەیە لەبری هەر رۆژێك فیدیە بدەن بەهەژارێك وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين ﴾[٢١]

وەئەندازەی فیدیەکە بریتی‌یە لە دوو مشت گەنم یان مشتێك بەلای هەندێ لەزانایانەوە . وە بۆیان هەیە کە خواردنەکە بەشێوەی دانەوێڵە ـ واتە بە ئامادە نەکراوی ـ دابەش بکەن بەسەر هەژاران، یان بەشێوەی خواردنی ئامادە کراو، وە باشترە ژەمێك خواردن بدرێت لەبری هەر رۆژێك.

شێخ ( عبدالله البسام ) دەڵێت[٢٢] : ( بری ئەو خواردنەی کە دەدرێت بە هەژاران مشتێکە لە گەنم ، بەڵام بری یەك ( صاع ) جگە لە گەنم دەدات ، وە یەك ( صاع )یش چوار مشتە ٠

کەواتە ( صاع ) چوار مشتە و هەر یەك مشتیش (٦٢٥) غرامە ، کەواتە یەك صاع (٢٥٠٠) غرامە ٠

٣. نەخۆشی بەردەوام کە ئومێدی چاکبونەوەی نەبێت بۆی هەیە بەرۆژونەبێت و بەهەمان شێوەی پێشو فدیە بدات

٤،٥. ئافرەتی حاملە ئەگەر رۆژوو زەرەری هەبوو بۆی و لەخۆی ترسا توشی نەخۆشی بێت. وە هەروەها ئافرەتی شیردەر (مرضـع)کە بەرۆژوو

(٢١) ( سورة البقرة / ١٨٤ )٠

(٢٢) توضيع الاحكام من بلوغ المرام ( ٣ / ١٨٦ ) .

بـونی زەرەریدا لـە منداڵەکـەی ئـەوە بۆیان هەیە ئەوانیش تەنها فیدیە بدەن، بەگوێرەی تێگەیشتنی زانـای ئوممـەت ابن عباس لە ئایەتی ﴿وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين﴾[23]. بـەڵام هەنـدێ لـەزانایان فەرموویانـە بـەڵێ بۆیـان هەیـە بـەرۆژوو نـەبن، بـەڵام پێویسـتە رۆژوەکـەیان بگێرنـەوە وەکـو نـەخۆش وموسـافیر، چونکە حاڵیان لەوان نارەحەت تر نییە، وە کە ابـن عبـاس تـەنها باسـی فیدیـەی کـردووە مەبەسـتی ئـەوە نـەبووە کـە گێرانەوەیان لەسەر نییە[24].

٦،٧. موسافرو نەخۆش بۆیـان هەیـە بەرۆژونـەبن وەدوایـی رۆژوەکانیـان بگرنەوە لە چەند رۆژێکی تـردا ، وەکـو دەفەرمووێت :

﴿ فمن كان منكم مريضاً أو على سفرٍ فعدة من ايام أخر﴾[25]

ئەمەش بریتییە لە لابردنی ناخۆشی و نارەحەتی کە توشی نەخۆش و موسافیر دەبێت

(٢٣) قال ابن عباس : وثبت للشيخ الكبير والعجوز الكبيرة، إذا كانا لايطيقان الصوم ، والحبلى والمرضع إذا خافتا أفطرتا وأطعمتا كل يوم مسكينا . رواه أبو داود: ٢٣١٨. والبيهقي:٤/٢٣٠. بسند صحيح.

(٢٤) شيخ ابن عثيمين ئەم رايەی هەڵبژاردووە (الشرح الممتع:٦/٣٦٢) .

(٢٥) ( البقرة / ١٨٤ ) .

بـەڵام غـەیری ئەمانـە پێویسـتە بەرۆژووبن و چاوەرێی پاداشتیش بن لای خوا لەسەری .

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە یەکێك لـە رەحمەتەکانی خوای گەورە بریتییـە لـە ئایینی ئیسلام ، کـە ئـایینێکی ئاسـانە و قورسی تێدا نیە ، چونکە خـوای گـەورە داوای لە هیچ کەسـێك نـەکردووە کـە لـە توانایدا نەبێت ٠

خوای گەورە دەفەرمووێت :

﴿ وما جعل عليكم في الدين من حرج ﴾[26]

وە هەروەها دەفەرمووێت :

﴿ يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر ﴾[27]

لەبەر ئەوە خوای گـەورە رێگـەی بـە رۆژوو نەبوون داوە٠

وە هەرکەسێك رۆژو نەگرێت بـەهۆی عوزرێـك وەك ( حـەیز و نیفـاس و نەخۆشی و سەفەر ) وە تەمبـەڵی بکـات لـە گێرانـەوەی - قـەزا کردنـەوەی - رۆژوەکـە هـەتا ئەوکاتـەی کـە مـانگی رەمەزانی دووەم دێت بـەبێ عـوزر ئـەوە پێویستە لەسەری بەپەلە بگەرێتـەوە بـۆ تەوبە کـردن و داوای لێبـوردن کـردن لـە خـوای گـەورە چـونکە ئـەو رۆژوانـەی لەسـەری بوونـە دوای خسـتوون،

(٢٦) (سورة المؤمنون / ٧٨ )

(٢٧) ( سورة البقرة / ١٨٥ )

وەپێویستە ڕۆژوەکەش هەر بگرێتەوە بەبێ کەفارەت و فیدیە إن شاء الله.

بەڵام ئەگەر هاتوو دواخستنی ڕۆژوەکانی بەهۆی عوزرێکەوە بوو وەك بەردەوام بوونی سەفەرەکەی یان نەخۆشیەکەی ئەوە تاوانی لەسەر نیە و تەنها گرتنەوەی ڕۆژوەکانی لەسەرە ئەگەر دوای مانگی ڕەمەزانی دووەمیش بێت.

**( ترسناکی وازهێنان لە ڕۆژوو )**

ئەوکەسەی بزانێت کەڕۆژو واجبە و ڕوکنێکی ئیسلامە و ئینکاری بکات ئەوەکافرە .

* بەڵام کەسێك ئیمانی هەبێت بەوەی کە واجبە ڕۆژوو بگرێت، بەڵام بێعوزری شەرعی، بەویستی خۆی واز لەڕۆژوو گرتن بهێنێت لەمانگی ڕەمەزان ئەوە گوناهێکی گەورەی کردوە ڕوکنێکی دینەکەی لەڕوخاندایەو مەترسی زۆری لێدەکرێت. لەحەدیسێکدا هاتووە کە ئەمە ماناکەیەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ( لەکاتێکدا کەمن نوستبوم دوو پیاو هاتنەلام قۆڵیان گرتم وهێنایانم بۆ شاخێك و وتیان سەرکەوە وتم : من ناتوانم وتیان: بۆت ئاسان دەکەین. جا سەرکەوتم تا کە گەیشتم بەرەشایی شاخەکە گوێم لەدەنگێکی بەرز بوو وتم: ئەو دەنگانە چین . وتیان ئەوانە دەنگی هاواروشیوەنی ئەهلی ئاگرن! . لەپاشان بردیانم تا گەیشتم بە کۆمەڵە خەڵکێك هەڵواسرابون بەرەگی سەر پاژنە پێیان. دەمیان دابڕدابڕو کەلێن کەلێن کرابوو و خوێن لەدەمیانەوە دەهات . وتم ئەمانە کێن ؟ ووتیان ئەوانە کە پێش کاتی ڕۆژوو شکاندن (واتە پێش ڕۆژ ئاوابون) ڕۆژوو دەشکێنن[(٢٨)] .

ئەمە سزای کەسێك بێت پێش ڕۆژوو ئاوابون ڕۆژووی بشکێنێ ئەبی حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کەهەر بەڕۆژوو نەبێت؟! .

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه فەرموی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرکەوتە سەر مینبەرو فەرمووی: ((آمين آمين آمين)) وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا تۆ کەسەر کەوتیە سەرمینبەر وتت آمين آمين آمين؟ فەرمووی: جبرائیل سەلامی لەسەر بێت- هاتەلام وتی : هەرکەسێ بگاتە مانگی ڕەمەزان و خوا لێی خۆش نەبێت و ببێتە شایستەی دۆزەخ ئەوە خوا دوری خاتەوە لەڕەحمەتی خۆی )) بلێ: (آمين) منیش وتم (آمين) ...)[(٢٩)] .



(٢٨) (النسائي في الكبرى والحاكم: ١/٤٣٠) صحيح.
(٢٩) (ابن خزيمة٣/١٩٢. وأحمد: ٢/٢٤٦صحيح).

## ﴿ ڕوکنەکانی ڕۆژوو گرتن ﴾

١ـ **نیەت بوون** : پێویستە پێش کاتی بانگی بەیانی ئەو ڕۆژە نیەت دابمەزرێنیت لەسەر بەڕۆژوو بوون . واتە لەهەر بەشێکی شەودا بەمەرجێك بانگی بەیانی نەبوو بێت لەدڵدا نیەتی بەڕۆژوو بوون دەهێنێت . وەك لە حەدیسدا **هاتووە**: (من لم يُجمع الصيام قبل الفجر فلا صيام له )[30].

واتە هەرکەسێك پێش کاتی بەیانی نیەتی بە ڕۆژوو بوون نەهێنێت ڕۆژوو گرتنی بۆنیە ، بەڵام ئەم ڕوکنە تایبەتە بەڕۆژووی ( واجب ) نەك سوننەت .

٢ـ **خۆگرتنەوە** ( الإمساك )

لە هەموو ئەو شتانەی کەڕۆژوویان پێ بەتاڵ دەبێتەوە (المُفطرات) لە کاتی بانگی بەیانیەوە تا کاتی ڕۆژ ئاوابوون .

(**کاتی ڕۆژوو گرتن** )

خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ (البقرة:١٨٧)

واتە بۆتان هەیە بچنە لای خێزانتان و ئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردون بیکەن، وەبخۆن وبخۆنەوە تاوەکو ڕووناکی و سپیایی بەیانی [الخيط الأبيض من الفجر]دەردەکەوێت و تاریکایی شەو (الخيط الأسود من الليل ) نامێنێت کە ئەمە سەرەتای بەڕۆژوو بوونە. وەبەردەوام بن لەسەر ئەم خۆگرتنەوەیە لە : چونە لای خێزان و خواردن و خواردنەوە، وە بەڕۆژووبن تا خۆر ئاوا دەبێت و ڕۆژ دەڕوات و شەو دێت.

﴿ثُمَّ أَتِمُّوا الصيام إلى الليل ﴾ .

### چەند تێبینی یەك :

١ـ سەرەتای ڕۆژوو گرتن لە دەرکەوتنی ئەو ڕوناکییە دەبێت کەپێی دەوترێت (الفجر الصادق) کە بریتی لەڕوناکیەکی ڕەنگ سور و بڵاوو و پەرش بوەوە بەسەر لوتکە شاخ ودەورو بەردا، وەبەوە نوێژی بەیانی دەبێت و خواردن و خواردنەوە لەڕۆژوەوان حەرام دەبێت. چونکە لەو کاتەوە ڕۆژوو گرتنەکە دەست پێدەکات. بەڵام پێش ئەم بەیانیە ڕاستە (الفجر الصادق) ڕوناکیەکی سپی بەرز دەبێتەوە لەڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ئاسمان وەك عەمودێك. وەئەوە پێی دەوترێت بەیانی درۆ(الفجر الكاذب). وە نە نوێژ بووە

(٣٠) أبو داود:٢٤٥٤. صحيح الجامع الصغير.

لەوکاتەدا وەنەرۆژوش دەست پێدەکات.
وەك لەحدیسدا هاتوه:

﴿كلوا واشربوا ولايغـرنكم الصـاطع المصعد ، وكلوا واشربوا حتى يعترض لكم الأحمر ﴾[٣١].

٢ـ ﴿ إذا سمع أحدكم النداء والإناء في يده فلا يضعه حتى يقضي حاجتـه ﴾[٣٢].
واتـە : ئەگـەر یـەکێك لـەئێوە گـوێی لـەبانگی بـەیانی بـوو وە جامـە ئاویشـی بەدەسـتەوە بـوو، بـا دای نەنێتـەوە تـاوەکو لێی دەخواتـەوە بـەگوێرەی پێویستی خۆی.

کەواتە بە بەڵگەی ئایەتی :
﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ (البقرة:١٨٧)

وەبەبەڵگـەی سـوننەت کـە دوو حەدیسمان لێ باس کرد دەرکـەوت کـە دروستە تاوەکو کاتی بانگی بـەیانی نـان و ئاو بوخرێت وبوخرێتـەوە. وە لەمـەش زیـاتر پێغەمبـەری خـوا ﷺ روخسـەتی داویـن کـە ئەگـەر کـاتی بـانگیش جـامی ئاوت بەدەستەوە بێت لێیی بخۆیتـەوە . کەواتـە خۆگرتنـەوە لـەخواردن وخواردنـەوە (الامسـاك) پێـنج یـا دە دەقیقـە پـێش بـانگ هـیچ بەڵگەیـەکی شـەرعی لەسـەر نیـەو پێویسـت ناکـات ودروسـت نیـە خـواردن وخواردنـەوە لەخـەڵکی قەدەغـە بکرێـت لـەم کـاتی ئیمساکەدا ، وە بەتایبەتی رۆژوەوانی وا هەیـە ئـەم کاتـە بەخەبـەر هـاتووەو دەتوانێت لەم چـەند دەقیقەیـەدا شتێك بخوات و بخواتەوە ئەگەر کـەمیش بێت بـۆ ئـەوەی بەرەکـەتی سـحورکردنی بەرکەوێت.

٣- پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی (إذا أقبل الليل من هاهنا وغربت الشمس فقـد أفطر الصـائم)[٣٣]. واتـە ئەگـەر تـاریکی شەو لـە رۆژ هەڵاتـەوە هـات وخـۆر ئـاوا بوو ، ئـەوە رۆژوەوان رۆژوەکـەی تـەواو دەبێـت ودەبێـت بیشـکێنێت. کەواتـە دروست نیە رۆژوەکەت دریژبکەیتەوە بۆ دوای ئەوکاتـەو چـاوەرێی دەرکـەوتنی ئەستێرە بیت . بەڵکو ئەوە موخالەفـەی سـوننەتەو بیدعەیـە . وەئەگـەر هـاتوو بانگ بێژی ئێوارە درەنگتر لەکاتی خۆی بانگیدا، ئەوە دەبێت تـۆ لـەکاتی خـۆی بیشکێنیت.

(٣١) الترمذي:٧٦/٣.وأبو داود:٣٠٤/٢وسـنده صـحيح. انظر: صفة صوم النبي/٣٨.

(٣٢)أحمد ٥١٠/٢.وأبو داود:٢٣٥.وانظر الصحيحة:١٣٩٤.

(٣٣) متفق عليه.

## پارشێو ﴿ السحور ﴾ کردن

**حوکمەکەی** : واجبە سحورکردن چونکە پێغەمبەر فەرمانی پێکردوین بەکردنی ﴿تسحروا فإن في السحور بركة﴾[٣٤] .

واتە پارشێو بکەن چونکە پارشێو کردن بەرەکەتە، وەنابێ وازی لێ بهێنین ئەگەر قومە ئاوێکیش بێت چونکە پێغەمبەر نەهی کردوە لە وازهێنان لێی. وەك دەردەکەوێت لەحەدیسی ( السحور أكلة بركة فلا تدعوه، ولو أن يجرع أحدكم جرعة من ماء، فإن الله وملائكته يصلون على المتسحرين )[٣٥].

واتە خواردنی پارشێو خێرو بەرەکەتە، وە بە ڕوەردگار ڕحمەت وبەرەکەت دەڕێژێتە سەر ئەوانەی پارشێو دەکەن و مەلائیکەش داوای لێ خۆش بوون و ڕەحمەتیان بۆدەکەن.

## زەکاتی ڕۆژوو تەواو بوون
## ( سەرفترە ) ( زكاة الفطر )

١ـ ابن عمر دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەکاتی فیطری فەرز کرد کە بریتیە لە چوار مشت خورما یان جۆ ٠ لەسەر عەبد و ئازاد ( الحر ) و، نێر و مێ گچکە و گەورەی موسوڵمانان[٣٦].

لە حەدیسی تردا هاتووە کە گەنم و مێوژ و کەشك و هەر خواردنێکی تری عادەتیش بێت دروستە زەکاتەکەی لێ بدرێت[٣٧].

کەواتە بە گوێرەی حەدیسەکان پێویستە ئەو شتانە بدرێن کە ناومان هێنان و بەهیچ شێوەیەك دروست نیە لە جیاتیان پارە بدرێت کە ئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافیعیە ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ موافیقی سوننەتە ٠ وە جێگای سەر سوڕمانە کە هەندێ لە مامۆستایانمان لەم لایەنە لە مەزهەب باز دەدەن بەبێ بەڵگە ، وە دەڵێن پارە بدەن !! . بەڵام لە لایەکی ترەوە حوکمی لا مەزهەبی و گومڕایی و هەندێك جار موڕتەدیش دەدەن بەسەر ئەو گەنجانەی بەگوێرەی ڕای زانایانی تر لادەدەن لەو ڕایانەی مەزهەب کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرن (ﷺ) ٠

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیمام شافیعیش فەرموویەتی :

( إذا صح الحديث فهو مذهبي )!!.

وە فەرموویەتی:

( أجمع المسلمون على أن من استبانت له سنة من رسول الله لم يحل له أن يدَعها لقول أحد )

(٣٤) متفق عليه.

(٣٥)أحمد من ثلاثة طرق(٣/١٢و٣/٤٤) ويشد بعضها بعضا.

(٣٦) ( متفق عليه )

(٣٧) متفق عليه. وابن خزيمة٤/٨٠ بسند صحيح.

٢ـ ئەو زەكاتە:

**پاك كەرەوەيە** بۆ ڕۆژوەوان لە قسەی لەغو و ناشیرن ( طهرة للصائم من اللغــو والرفث )[٣٨] .

وە خواردنێکیشە بۆ هەژاران ( وطعمة للمساكين ) بۆ ڕۆژی جەژنیان.

وە هەر کەسێك هەژار نەبێ دروست نیە بیدرێتێ.

وە سوننەتە پێش نوێژی جەژن بدرێت، بەڵام دروستە تەنها ڕۆژێ تا دوو ڕۆژیش پێش جەژن بدرێت .

# هەڵوەشێنەرەوەکانی ڕۆژوو

بێگومان حوکمی هیچ شتێك تەواو نابێت و سودی لێ وەرناگیرێت ، تاوەکو مەرجەکانی تێدانەیەنە جێ و هەڵوەشێنەرەوەو ڕێگر(مانع)ەکانیشی لێ بەدوور نەبێ .

بۆ نمونە دەست نوێژ کاتێك تەواوەو دروستە نوێژی پێ بکەیت و ئەجرو پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت کە مەرجەکانی تێدابن و هەڵوەشێنەرەوەکانی نەبن . واتە ئەگەر یەکێ لەمەرجەکان بۆ نمونە شوشتنی قاچ بە گوێزینگەوە نەبوو، ئەوە دەست نوێژەکەی تەواو دروست نییە. وەهەروەها هەڵوەشێنەرەوەیەکی دەست نوێژ روو بدات وەك میز کردن بۆ نمونە، ئەوە دیسان دەست نوێژەکەی دروست نییەو هەڵوەشاوەیە و کەڵکی نامێنێت .

بەهەمان شێوەش ڕۆژوو کە مەرج و ڕوکنەکانی تێدا نەبن و لە هەڵوەشێنەرو ڕۆژوو شکێنەرەکان دوور نەبێت، ئەوە کەڵکی نییەو بە ڕۆژو گرتن دانانرێت لەشەرعدا .

کەوابوو دوای ئەوەی ڕوکن و مەرجەکانی ڕۆژوو گرتنمان زانی ، پێویستە هەڵوەشێنەرەوەکانیشی بزانین، واتە بزانین ڕۆژوو بەچی هەڵدەوەشێتەوەو بەتاڵ دەبێتەوە .

زانایان فەرمویانە: بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و تێگەیشتن لێیان دەردەکەوێت کە ئەوشتانەی ڕۆژوویان پێ دەشکێ ئەمانەن:

**١- خواردن و خواردنەوە بە ویست و ئیرادەی خۆت بێ عوزرێکی شەرعی ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە** . چونکە پەروەردگار لەشەودا خواردنی حەڵاڵ کردووە بۆ ڕۆژوەوان تاوەکو بەیانی ، واتە کەبەیانی هات ئەوە حەرام دەبێت لەسەری .

(٣٨) أبو داود١٦٢٢والنسائي٥/٥٠. وله شاهد صحيح.

جا هەر کەسێك دوای بانگی بەیانی بخوا یا بخواتەوە ئەوە سەرەڕای ڕۆژوو شکانی گوناهباریش دەبێت. وەپێویستە تۆبە بکات لەو گوناهە گەورەیە.

بەڵام ئەگەر لە بیری چوو بەڕۆژووەو شتێکی خوارد یا خواردەوە ، وەیا بەهەڵە توش بێت یا بەزۆر پێی بخۆنەوەو هیچ دەسەڵاتی نەمێنێ ، ئەوە هیچ تاوانێکی لەسەرنیەو ڕۆژوەکەشی ناشکێت . چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

(إذا نسي أحدكم فأكل وشرب فليتم صومه ، فإنما أطعمه الله وسقاه)[٣٩].

وە فەرمویەتی: (إن الله وضع عن أمتي الخطأ و النسيان وما استكرهوا عليه)[٤٠].

**٢- خۆ ڕشاندنەوە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :

(من ذرعه القيء فليس عليه قضاء، ومن استقاء فليقض)[٤١].

واتە: هەرکەسێ بێ ویستی خۆی ڕشایەوە ئەوە ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێتەوەو گێڕانەوەشی لەسەر نیە.

بەڵام هەرکەسێ بەویستی خۆی خۆبڕشێنێتەوە ئەوە گێڕانەوەی لەسەرە

**٣- حەیزو نیفاس :**

ئەگەر ئافرەتی ڕۆژوەوان لە هەرکاتێکی ڕۆژدا توشی حاڵەتی حەیز یا نیفاس بێت، ئەوە یەکسەر ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو دروست نیە بەردەوام بێت لەسەری . وە پێویستە لەسەری ئەو ڕۆژوانە بگێڕێتەوە وەکو عائیشە ڕەزای خوای لێبێت فەرمویەتی :

(كان يصيبنا ذلك ، فنؤمر بقضاء الصوم، ولا نؤمر بقضاء الصلاة)[٤٢].

واتە: ئێمەی ئافرەتانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەو حاڵەتەمان توش دەبوو ، فەرمانمان پێ دەکرا بە گێڕانەوەی ڕۆژوەکان، بەڵام فەرمانی گێڕانەوەی نوێژەکانمان پێ نەدەکرا .

**٣- جیماع کردن .**

گومانی تێدانیە کە هەر ڕۆژوەوانێك بەویستی خۆی لەڕۆژی ڕەمەزاندا جیماع بکات لەگەڵ خێزانی ، ئەوە ڕۆژوەکەی

(٣٩) خ (١٣٥/٤) م (١١٥٥).

(٤٠) الحاكم (١٩٨/٢) عن ابن عباس وسنده صحيح.

(٤١) أبو داود (٣١٠/٢) والترمذي (٧٩/٣). صحيح.

(٤٢) خ (٤٢٩/٤) م (٣٣٥).

هەڵوەشاوەتەوەو گوناهێکی زۆر گەورەی کردووەو گێڕانەوەی ئەوڕۆژوەو زیادە کەفارەتیشی دەکەوێتە سەر، بەم شێوەیەی کە لەو حەدیسەدا هاتوە :

(ئەبو هریرە فەرمووی : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ : وتی ئەی پێغەمبەری، خوا بەهیلاك چووم !

فەرموی : چی بەهیلاکی بردیت ؟

وتی: چومە لای خێزانم لەڕەمەزاندا !

فەرموی: دەتوانیت بەندەیەك ئازاد بکەیت؟

وتی : نەخێر .

فەرموی: دەتوانیت دوو مانگی بەدوای یەکدا بەڕۆژوو بیت؟.

وتی : نەخێر .

فەرموی: دەتوانیت یەك ژەم خواردنی شەست هەژار بدەیت؟ .

وتی: نەخێر .

فەرموی : دەی دانیشە، ئەویش لای دانیشت. وە زەنبیلێك خورمایان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا. پێغەمبەریش ﷺ دایە دەستی و فەرمووی: بیکە بەخێر لەبری کەفارەتەکە.

ئەویش وتی: لە مەدینەدا لە ئێمە هەژار تری تێدا نییە ! . پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی تاوەکو خرێکانی دەرکەوتن وە فەرموی : دەی وەری گرەو دەرخواردی خێزان و منداڵەکانی خۆتی بدە .

وە هەروەها فەرموی: لەبری ئەو ڕۆژەش ڕۆژێك بەڕۆژووبەوە. [٤٣].

* بەلام کەفارەتی نەخستە سەر ئافرەتەکە. وەپیاویش کە لەتواناییدا نەبوو، لەسەری لادەچێت وەك لە حەدیسەکەدا دەرکەوت . والله أعلم .

٥- دەرزی بەهێزکەرو تێرکەر. (الحقن الغذائية): ئەو دەرزیانەی کە لەبری خواردن و خواردنەوە دەدرێنە نەخۆش. ئەوانەش حوکمی خواردن وخواردنەوەیان هەیە.



(٤٣) (خ/١١/٥١٦) (م/١١١١).(أبو داود/ ٢٣٩٠).




# ڕۆژوو و ڕۆژووەوان

ن/ مامۆستا محمد عبد الرحمن

مەبەست لە ئادابەكانى ڕۆژوو ئەو سوننەتە پیرۆزانەیە كە ڕۆژوەوان پەیڕەوی دەكات وەك سوننەتەكانى پارشێوو بەربانگ كردن ،وەمەبەست لە ئادابەكانى ڕۆژوەوان ئەو كردار و ڕەوشتە جوان و بەرزانەیە كە پێویستە موسڵمانى ڕۆژوەوان لەكاتى ڕۆژووگرتنیدا ڕەچاوو پەیڕەوییان بكات ، وە لەئادابەكانى ڕۆژوان خۆگرتنەوەیە لەكردارو گوفتار و كارى خراپ و نابەجێ كەپێویستە موسڵمانى ڕۆژوەوان خۆى لێ بپارێزێت، واتە دەبێت ڕۆژوەوان خۆى پالاوتە بكات لە هەموو ڕەوشتێكى نابەجێ وخۆى برازێنێتەوە بەهەموو ڕەوشتێكى جوان و بەرز ، هەر كەس بەپێى تواناى خۆى بۆ ئەوەى ڕۆژووەكەى بە شێوازێكى تەواوو ڕێك وڕاست ئەنجام بدات بۆ خواى گەورە.

وەئاشكرایە لاى هەموو موسڵمانێك كەپێغەمبەرى خوا ﷺ نموونەى ئەدەب و ڕەوشت بەرزییە بەشایەتى خواى بالآ دەست كە دەفەرموێت

[ وإنك لعلى خلق عظيم ][1] .

واتە: ئەى محمد تۆ لەسەر گەورەترین و بەرزترین ئەخلاق و ڕوشت و ئەدەبیت ، وەپرسیاریان كرد لە دایكى ئیمانداران دایكە عائشە خواى لێ ڕازى بێت دەربارەى ئەخلاق و ڕەوشتى پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە ؟ئەویش لەوەڵامدا فەرمووى :

(كان خلقه القرآن)[2].

واتە: پێغەمبەرى خوا ﷺ ڕەوشتەكانى قورئان بووە ،واتە پەیڕەوى ئایەتەكانى قورئانى دەكرد.

وعن انس رضى الله عنه قال (كان النبي ﷺ أحسن الناس خلقاً )[3].

واتە پێغەمبەرى خوا ﷺ لەهەموو خەلكى ڕەوشت جوانتر بووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەرى خوا ﷺ

---

(1) /سورة القلم آية ٤

(2) /أخرجه مسلم برقم : (٧٤٦)بلفظ "إنّ خُلُقَ النبى ﷺ كان القرآن"قال النووى (معناه العمل به والوقوف عند حدوده والتأدّب بآدابه واالأعتبار بأمثاله وقصصه وتدبره وحسن تلاوته) شرح صحيح مسلم (٢٢/٦/٣ ) .

(3) / أخرجه البخارى برقم : (٦٢٠٣) كما فى الفتح : (٧١٣/١) .

لەمانگی ڕەمەزاندا ئـەدەب و ڕەوشـت و کـرداری چـاك و جـوانی زیـاتر لێ بـە دی دەکـرا و زیـاتر خـوا پەرسـتی دەکـرد و هـــەوڵ و تێکۆشـــانی زیـــاتر بـــوون تامانگـــەکانی تـــر وەك لـــە هەنـــدێ فـــەرموودەدا دەردەکـــەوێت ، وەهـــانی موسـڵمانانی داوە کـە لـە ڕەمەزانداو لـە کـاتی بـە ڕۆژوو بوونـدا زیـاتلر خـۆگر و خۆپارێزبن لە کـردار وگوفتـاری خـراپ و نابـــەجێ و زیـــاتر خۆیـــان بڕازێننـــەوە بەڕەوشتی بەرز و ئەدەبی جوان و کردار و گوفتـاری ڕێـك و ڕاسـت و ڕەوا لەگـەڵ خەڵکـــدا بەگشـــتی وە هانیـــانی دەدا بۆئەنجامــدانی خواپەرســتی _زیاترلــە کاتـەکانی تـر بـۆ ئـەوەی زیـاتر لـەخوای گـــەورە نزیـــك ببنـــەوە لەگـــەڵ ڕۆژوو گرتنەکەیاندا .

## ئادابەکانی ڕۆژوو

**یەکەم : پارشێو کردن ( السحور )**

١. سـوننەت وایـە موسـڵمان ئەگـەر ویستی ڕۆژوو بگرێت : پێش دەرکـەوتنی ئاسـۆی بەرەبـەیان (قبـل طلـوع الفجـر) پارشـــێو بکـــات، واتـــە : خـــواردن و خواردنەوە بخوات :

❖ بۆ ئەوەی بـەتوانا بێـت لەکاتی ڕۆژووگرتنەکەیدا، عن انس بن مالك رضی الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ: "تسحروا فـإنّ فی السّـحور برکَة" [٤]. واتە: پارشێو بکەن چونکە پارشێوکردن بەرەکەتی تێدایە .

❖ وەلەبـەر ئـەوەی بـەر ڕەحمـەت و لێ خۆشـبوونی خـوا بکـەوێت و بـەر دوعـای فریشـتەکان بکـەوێت کـەداوای لێ خۆشـبوون وچاوپۆشـی بـۆ دەکـەن لـە خـوای گەورە ، عن أبي سـعيد الخـدری ﷺ، قـال : قال رسول الله ﷺ: (السـحور أكله بركة ، فلا تدعوه ولو أن يجـرع أحدكم جرعة مـن مـاء ، فـإنّ الله وملائكته يصلّون على المتسحّرين )[٥]

واتە: پارشێو خـواردنێکی بـە فـەڕ و بەرەکەتـدارە،جـا وازی لێ مـەهێنن ئەگەر بەیەك قوم ئاویش بێت چونکە خـواو فریشـتەکان سـڵاوات بەسـەر پارشێوکەران ئەدەن .

❖ وەبـــۆ ئـــەوەی لەڕۆژووەکەمانـدا جیـاوازبین لـە جولەکـەوگاورەکان ، عـن عمـرو بـن

---

[٤] /أخرجه البخاری برقم (١٩٢٣) كما فی الفتح (١٧٨/٤) ومسلم برقم(١٠٩٥) ، وقال الحافظ (البركة تحصـل بجهـات متعددة وهی : إتّباع السنّة ، ومخالفة أهل الكتاب ، والتقوّي به على العبادة ، والزيادة فی النشاط ، ومدافعة سوء الخلق الـذي يثيره الجوع ، والتسبب بالصدقة على من يسأل إذ ذاك أو يجتمع معه على المأكل ، والتسبب للذكر والدعاء وقت مظنة الإجابة وتدارك نية الصوم لمن أغفلها قبل أن ينام ) الفتح (١٧٩/٤) .

[٥] / أخرجه أحمد : (١٢/٣) و(٤٤/٣) وابن أبي شيبة (٨/٣) أنظر (صفة صوم النبي ﷺ ص٤٨ ) .

العـاص ﷺ أنّ رسـول اللهﷺ قـال: " فصل مابين صيامنا وصيام أهل الكتاب أكلة الســحور"[٦] واتـە : جیـاوازی نێـوان ڕۆژووی ئێمـەی موسـڵمان وڕۆژووی جولەکـەو گاورەکـان خواردنی پارشێوە .

٢.وەئەگەر هیچ ئامادە نەبوو بیخۆی یـان ئـارەزووی خواردنـت نـەبوو ئـوا سوننەت وایە پارشێو بکەیت ئەگەر چی بەیەك قوم ئاویش بێت ، عـن أبـي سـعيد الخدري رضي الله عنه قال : قال رسـول الله ﷺ "تسحّروا ولو بجرعة ماء "[٧]

واتە : پارشـێو بکـەن ئەگـەر چـی بـە قومێك ئاویش بێت .

٣. وەسـوننەت وا یـە پارشـێو کـردن دوابخرێت بـۆ نزیکـی دەرکـەوتنی گـزنگ (الفجر) ، عن أبي الدرداء رضي الله عنه عن النبي قال : " ثلاثٌ من أخلاق النبـوّة : تعجيل الإفطار ، وتأخير السحور ، ووضع اليمين على الشمال في الصلاة " [٨]

واتـە:سـێ ڕەوشـت لـە ڕەوشـتی پێغەمبەرایەتییـە ! پەلـە کـردن لـە بـەربانگ کرنـدا و دواخسـتنی پارشـێو و دەسـتی ڕاسـت خسـتنە سـەر دەسـتی چەپ لەنوێژدا ، وەبۆ ئەوەی زیاتر ڕوون بێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـواﷺ لەگـەڵ صـەحابەدا چـەندێك پارشـێویان دواخسـتوە ئـەم فەرموودەیـە بـاس دەکەین ، عن أنس عن زيد بن ثابت رضى الله عنهما قال :" تسحرنا مع النبيّﷺ ثمّ قام الى الصلاة ، قلت : كم كان بين الصـلاة والسحور ؟ قال : قدر خمسين آية"[٩] .

واتـە : پارشـێومان کـرد لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ، ئـەنجا هەسـتا بـۆ نوێـژ (أنـس) وتـی : مـاوەی نێـوان نوێـژ و پارشـێوەکە چـەند بـوو ؟ (زیـد) ووتـی :بەقەدەر پـەنجا ئایـەت بـوو[١٠] ، قـال النووي : (فيه الحثّ على تأخير السحور الى قبيل الفجر ) [١١] واتە :ئەم فەر موودەیـە هاندەرە بۆ دواخستنی پارشێو بە تۆزێك پێش لە دەرکەوتنی گزنگ .

---

[٦]/أخرجه مسلم برقم (١٠٩٦) .

[٧]/صحيح سنن إبن ماجة للألباني برقم (٢٩٤٥) وصـحيح الجامع المرتب على الأبواب الفقهيّة برقم(٢٢) (٤٠٤/١) .

[٨]/ صحيح الجامع الصغير المرتب بـرقم : (٢٣) (٤٠٤/١) وجاء فيه أيضاً بلفظ (إنّا معاشر الأنبياء أمرنا أن نعجّل إفطارنا ، ونؤخر سحورنا ، ونضع أيماننا على شمائلنا فى الصلاة ) بـرقم (١٧) (٤٠٣/١) .

[٩]/أخرجه البخاري برقم (١٩٢١) كما في الفتح : (١٧٧/٤) ومسلم برقم (١٠٩٧) .

[١٠]/واتە: پەنجا ئایەتی مام ناوەندی نەدرێـژ و نـەکورت و بەخوێندنەوەیەکی مام ناوەندی نـە خێرا و نـە لەسـەرخۆ ، بڕوانـە (فتح الباري ) (١٧٧/٤) ، فائدة : وقال الحافظ (وقال ابن ابي جمرة : فيه إشارة إلى أنّ أوقاتهم كانت مستغرقة بالعبادة ) واتـە ئـەم فەرموودەیـە ئامـاژەی تێدایـە بـۆ ئـەوەی کـە سـەلەفی سـاڵح هـەموو کاتـەکانیان بەخواپەرسـتی بەسەربردووە و بەخواپەرستی پڕیان کردبووەوە .

[١١]/شرح صحيح مسلم (١٧٢/٨/٤) .

٤.وەسوننەت وایە پارشێو بەخورما بکرێت ، عن أبی هریره ﷺ عن النبیّ ﷺ قال :

" نعمَ سَحور المــؤمن التمـــرُ " واتـە : باشترین پارشێوی ئیماندار خورمایە .

**دووەم: بەربانگ کردن ( الإفطار)**

پێویستە لەسەر موسڵمانی رۆژوەوان کە خۆر (ڕۆژ) ئاوا بوو بەربانگ بکات و ڕۆژووەکەی بشکێنێت . عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ:"إذا أقبل الليل من ها هنا وأدبر النهار من ها هنا ، وغربت الشمس ، فقد أفطر الصائم "[١٢] واتە :ئەگەر شەو داهات لە ڕۆژ هەڵاتەوە و ڕۆژ پشتی هەڵکرد لە ڕۆژ ئاواوە و خۆر نەما بە دەرەوە ، ئەوا با رۆژوەوان بەربانگ بکات. وقال البخاري (وأفطر أبو سعيد الخدري حين غاب قرص الشمس )[١٣]

واتە : (أبو سعيد الخدري) بەربانگی دەکرد ئەوکاتەی بازنەی خۆر بەدەرەوە نەمایە، وەسوننەت وایە لە کاتی بەربانگ کردن وڕۆژوو شکاندنەکەیدا ڕەچاو و پەیڕەوی ئەم ئاداب و کردارانە بکات :

١. زوو ڕۆژوو شکاندن و پەلە کردن لە بەربانگدا (تعجيل الإفطار)

سوننەت وایە رۆژوەوان کە بازنەی خۆر (ڕۆژ) بەدەرەوە نەما زوو بەزوو بەربانگ بکات و ڕۆژووەکەی بشکێنێت و چاوەڕوانی هیچی تر نەکات وەك نەمانی سورایی ئاسمان یان دەرکەوتنی ئەستێرە ، چونکە زوو بەربانگ کردن سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ وخێر و پاداشتی زۆرە ، وەسەرپێچی و شوێن نەکەوتنی جولەکە و گاوری تێدایە.

❖ زوو بەربانگ کردن نیشانەی چاکێتییە و هۆکارە بۆ چاکێتی :عن سهل بن سعد ﷺ أنّ رسول الله ﷺ قال:"لاتزال الناس بخير ماعجّلو الفطر" [١٤] واتە :بەردەوام خەڵکی لەچاکەدان و چاکن تا ئەوکاتەی زوو بەربانگ دەکەن .

❖ زوو بەربانگ کردن سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ :

عن سهل بن سعد أنّ رسول الله ﷺ قال: "لايزال أمتي على سنّتي ما لم تنتظر بفطرها النجوم " [١٥] . واتە : بەردەوام ئوممەتەکەم لە سەر سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ تا ئەو کاتەی بەربانگ

---

[١٢]/أخرجه البخاري برقم (١٩٥٤) كما في الفتح (٢٤٩/٤) .

[١٣]/أنظر الفتح (٢٤٩/٤) .

[١٤]/ أخرجه البخاري برقم(١٩٥٧) كما في الفتح (٢٥٣/٤) ومسلم برقم : (١٠٩٨) .

[١٥]/ أخرجه ابن حبان برقم (٨٩١) بسد صحيح ، وأصله في الصحيحين كما تقدم .

دوانەخەن بۆ کاتی دەرکەوتنی ئەستێرەکان .

❖ زوو بەربانگ کردن پێچەوانەی جولەکەو خاچ پەرستانی تێدایە : عن أبي هريرە رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال :"لايزال الدين ظاهرة ماعجّل الناس الفطر ، لأنّ اليهود والنصارى يؤخّرون " [16] واتە :بەردەوام ئاینی ئیسلام ئاشکراو سەرکەوتووە بەسەرهەموو ئاینەکاندا تا خەڵکی زوو بەربانگ بکەن ، چونکە جولەکە و گاورەکان بەربانگ دوا دەخەن ، بۆیە ئەو کەسەی خۆی بەئەهلی سوننەت دەزانێت و بانگەشەی شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ دەکات دەبێت سوننەتی زوو بەربانگ کردن زیندوو بکاتەوە و هانی خەڵك بدات بۆ جێ بەجێ کردنی و لە قسە و لۆمەی لۆمەکاران نەترسێو گوێی پێنەدات ، بۆ ئەوەی سوننەتی پێغەمبەرەکەمانﷺ بەردەوام و ئاشکراو سەرکەوتوو بێت بەسەر ئاینی جوولەکەوخاچ پەرستان و بەسەر شوێن پێ هەڵگری داب و نەریتی جولەکەو گاورەکان [17]

٢.بەربانگ کردن پێش کردنی نوێژی مەغریب :

پێغەمبەری خواﷺ پێش ئەوەی نوێژی مەغریب بکات بەربانگی دەکرد [18] چونکە زوو بەربانگ کردن و پەلە کردن تیایدا ڕەوشتی پێغەمبەرانە .عن أبي الدرداء رضي الله عنه مرفوعاً :" ثلاثٌ من أخلاق النبوّة : تعجيل الإفطار ......"الحديث [19] واتە :( سێ ڕەوشت لەڕەوشتی پێغەمبەرانە : پەلەکردن لەبەربانگدا ........).

٣.بەچی سوننەتە بەربانگ بکرێت؟

عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : " كان النبي يفطرعلى رطبات قبل ان يصلي ، فإن لم يكن رطبات ، فتمرات ، فإن لم يكن تمرات حسا حسوات من ماء"[20] . واتە : پێغەمبەرﷺبەربانگی دەکرد بەچەند خورمایەکی تەڕ پێش ئەوەی نوێژ بکات ، جا ئەگەر خورمای تەڕ نەبوایە ، بەخورمای تر بەربانگی دەکرد ، وەئەگەر خورما هەردەست نەکەوتایە ، ئەوا چەند قومێك ئاوی دەخواردەوە .

---

[16] / أخرجه أبو داود برقم (٢٣٥٣) وابن حبان برقم (٢٢٤) وسنده حسن كما قال الشيخ الألباني .

[17] /أنظر :(صفة صوم النبيّ ﷺ) ص(٦٢-٦٥)

[18] / بدليل حديث أنس :" كان النبي ﷺ يفطر على رطبات قبل أن يصلّي ......"

[19] / تقدم تخريجه .

[20] /صحيح سنن أبي داود برقم (٢٣٥٦) وصحيح سنن الترمذي ( ) وصحيح الجامع المرتب (٢٢) (٤٠٧/١) .

٤. دوعــاو پاڕانــەوە لــەخوای گــەورە لەکاتی بەربانگدا :

لەچــەندین فــەرموودەی صــەحیحدا هــاتووە کــەدوعا و پاڕانــەوەی ڕۆژووەوان گیرایـــەو ڕەت ناکرێتـــەوە ، لـــەو فەرموودانــە :عــن أبــي هريــرةﷺعــن النبيﷺ: " ثلاثٌ لاترد دعوتهم : الصــائم حين يفطر......" الحديث [٢١].

واتـــە: ســـێ کـــەس دوعایـــان ڕەت ناکرێتــەوە : ڕۆژووەوان کــاتێ بــەربانگ دەکات ......) .

٥. چــی ســوننەتە بوترێــت لــەکاتی بەربانگدا ؟

باشـــترین دوعـــا ئەوەیـــە کـــە لـــە پێغەمبەری خواوەﷺ پێمان گەیشـووە ، پێغەمبـــەر ﷺ لـــەکاتی بەربانگـــدا دەپاڕایـەوە و دەیفـەرموو: (ذهب الظمأ، وابتلت العروق ، وثبت الأجر إن شاء الله ) [٢٢] واتە : تینوێتی نـەماو قـوڕگ تـەڕبوو پاداشتیش جێگیر بوو بەویستی خوا .

٦. بەربانگـدان بــە ڕۆژووەوان (إفطــار الصائم) :

عن زيد بـن خالـد الجهـني ﷺ قـال : قال رسول الله ﷺ: (من فطّر صائماً كان له مثل أجره ، غير أنه لاينقص من أجر الصائم شــيئاً )[٢٣] واتــە : هەرکەسـێك بــەربانگ بـدات بــەڕۆژووەوانێك لــەکاتی بەربانگـدا ، ئــەوا وەك پاداشــتی ئــەو ڕۆژووەوانــەی دەست دەکەوێت بێ ئەوەی لە پاداشـتی ڕۆژووەوانەکە کەمبێتەوە.

## ئادابەکانی ڕۆژووەوان
## ( آداب الصائمين )

**یەکــەم : خۆگرتنــەوەو خۆپاراسـتن لەکردارو گوفتاری نابەجێ :**

ڕۆژووەوانـــی ڕاســـتەقینە ئەوکەســـەیە هەموو ئەندامەکانی بەڕۆژوو بن لەتاوان و زمانیشی لە درۆ کردن و ووتـەی پڕو پوچ و بــێ ســوود و شــایەتی نــاڕەوا لەگــەڵ خۆگرتنـــەوە لـــەخواردن و خواردنـــەوەو جووت بوون لەگەڵ خێزاندا بەشێوە یـەك گــەر قســـەی کـــرد ووتـەیـــەك ناڵێـــت ڕۆژووەکـــــەی لەکـــــەدار بێـــــت ، وەکردەوەیەکیش ئەنجام نادات پاداشتی ڕۆژووەکەی بەتاڵ بکاتەوە بـەو شـێوەیە دەبینین ووتەو کردەوەیشی چاك دەبێت چونکە تەنها (گەروو و داوێنـی) بـەڕۆژوو نییە بەڵکو لەگەڵ ئەویشدا زمان و چاو و گوێ و دەست و قـاچ و دڵ و مێشکیشـی بەڕۆژووە .

---

[٢١] /صحيح سنن أبي داود (٢٣٥٦) وصحيح سنن الترمذي والصحيحة (٨٧٠) .

[٢٢] /صحيح أبي داود (٢٣٥٧) .

[٢٣] /صحيح سنن الترمذي ( ) وصحيح ابن ماجة ( ).

ئەمەیە ئەوڕۆژووەی كەخوای پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی ﷺ دەیانەوێ موسڵمانان ئەنجامی بدەن نەك تەنها خۆگرتنەوە لەخواردن و خواردنەوە و ئارەزووەكان ، چونكە ڕۆژوو: ڕۆژووگرتنی هەموو ئەندامەكانە لەتاوان وكردار وگوفتاری نابەجێ و ناڕەوا لەگەڵ خۆگرتنەوە لەخواردن و خواردنەوە و جووت بوون ، چونكە هەروەك چۆن خواردن و خواردنەوە ڕۆژوو بەتاڵ دەكاتەوە بەهەمان شێوە تاوان كردنیش پاداشتی دەبڕێت و بەرهەمەكانی لەناو دەبات و وای لێ دەكات هاو شێوە دەبێ لەگەڵ ئەو كەسەی هەر ڕۆژووی نەگرتبێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێت: (رُبّ صائم حظه من صيامه الجوع والعطش)[٢٤] واتە: زۆر ڕۆژوەوان هەیە تەنها برسێتی و تینوێتی بۆ دەمێنێتەوە لەبەر ئەمە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانی ڕۆژوەوانی هانداوە كە خۆی برازێنێتەوە بەجوانترین و باشترین ڕەوشت و دوریش بكەوێتەوە لەهەموو كردەوەیەكی خراپ و لەووتەی بێ نرخ و نابەجێ و زماندرێژی ، گەرچی ئەم خراپانە هەموو كردەوەیەكی نابەجێی تر قەدەغەو حەرامكراون لەسەر موسڵمانان لەهەموو كاتێكدا داوایان لێ كراوە دوورە پەرێزبن لێیان ، بەڵام قەدەغەكردنی لەمانگی ڕەمەزاندا و لەكاتی ئەنجامدانی ڕۆژوودا زیاتر جەختی لەسەر كراوە .

بۆیە لەسەر هەموو موسڵمانێكی ڕۆژوەوان پێویستە دوربكەوێتەوە لەهەموو ئەو گوفتار و كردارانەی ئەبنە هۆی ڕوشاندنی ڕۆژووەكەی بۆئەوەی سوود لەڕۆژووەكەی وەربگرێت و هۆی لەخواترسانی بێ ، ئەو لە خواترسانەی كەخوای گەورە باسی كردووە لەو ئایەتەی كەبەڵگەی فەرزێتی ڕۆژووە كە دەفەرموێ

[ يا أيها اللذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على اللذين من قبلكم لعلكم تتقون ][٢٥] .

واتە : ئەی كۆمەڵی ئیمانداران خوا ڕۆژووی لەسەر فەرز كردوون وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرزی كردووە بۆ ئەوەی لەخوابترسن .

بەڕاستی ڕۆژوو ڕێگەیە بۆ لە خواترسان ، لەبەر ئەوەی ڕێگرە لەهەموو ئەو تاوانانەی نەفس ئەیەوێت ئەنجامی بدات ،وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت :" الصيام جنّة "[٢٦] واتە:

---

[٢٤]/أخرجه أحمد (٢/ ٤٤١، ٣٧٣) والبيهقي (٤/٢٧٠) وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماحة (١٦٩٠) .

[٢٥]/سورة البقرة (١٨٣).

[٢٦]/أخرجه البخاري (١٥٩٤) كما في الفتح (٤/١٣٤) وقال الحافظ (والجنة :الوقاية والستر ....وقال عياض في (الإكمال) :

**ڕۆژوو قەڵغان و پارێزەرە لەتاوان لەدونیاداو لەئاگری دۆزەخیش لەدواڕۆژدا. جا لەبەر ئەمە پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایمانی کردووە بۆ ئەوەی خۆمان لەچەند ڕەوشتێکی نابەجێ کە لەگەڵ ڕۆژوودا ناگونجێ بپارێزین بۆ ئەوەی پاداشتی ڕۆژووەکەمان بەتەواوی دەستکەوێ بەویستی خوا ، وەلەوڕەوشتە خراپ ونابەجێیانە :**

❖ **وووتەی درۆ وکردەوەی ناڕەوا : عن أبي هريرة ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ**" من لم يدع قول الزور والعمل به فليس لله حاجة أن يدع طعامه وشرابه" (٢٧) **واتە: گەر ڕۆژوەوان وازنەهێنێ لەووتەی درۆ و ناڕەوا و کردەوە پێکردنی ، ئەوا خوای بە تواناو بالاّ دەست پێویستی بەوە نییە واز لەخواردن وخواردنەوە .**

❖ **ووتەی پڕو پووچ و بێ سوود و کاری نەفامانە**

**عن أبي هريرة ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ** :"ليس الصيام من الأكل والشرب، إنّما الصيام من اللغو والرفث ، فإن سابّك أحدٌ أو جهل عليك ، فقل : إنّي صائمٌ إنّي صائم " (٢٨)

**واتە: ڕۆژوو تەنها خۆ گرتنەوە نییە لەخواردن و خواردنەوە ، بەڵکو ڕۆژوو بریتیە لەخۆ گرتنەوە لەووتەی بێ نرخ و قسەی خراپ ، وەئەگەر کەسێك جوێنی پێدای یان نەفامییەکی بەرامبەرت ئەنجامدا ، ئەوا پێی بڵێ : من بەڕۆژووم من بەڕۆژووم . وەلەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت :** "إذا كان يوم صوم أحدكم فلا يرفث ولا يصخب ولايجهل ، فإن سابّه أحدٌ أو قاتله فليقل : إنّي صائم "(٢٩) **واتە : ئەگەر کەسێکتان**

---

معناه : ستره من الآثام أومن النار أو من جميع ذلك.....وقال ابن العربي : إنّما كان الصوم جنة من النار لإنه إمساك عن الشهوات ، والنلر محفوفة بالشهوات ، فالحاصل أنه إذا كفّ نفسه من الشهوات في الدنيا كان ذلك ساتراً من النار في الأخرة) الفتح (٤/١٣٤-١٣٥ ).

(٢٧)/أخرجه البخاري(١٩٠٣) كما في الفتح (٤/١٥٠) وقال الحافظ في الفتح (٤/١٥١) (وقال :ابن العربي : مقتضى هذا الحديث أن من فعل ما ذكر لايثاب على صيامه ، ومعناه أن ثواب الصيام لايقوم في الموازنة باثم الزور وماذكر معه ، وقال البيضاويي : ليس المقصود من شرعية الصوم نفس الجوع والعطش ، بل مايتبعه من كسر الشهوات وتطويع النفس الأمارة للنفس المطمئنة ، فإذا لم يحصل ذلك لاينظر الله إليه نظر القبول ......واستدل به على أن هذه الأفعال تنقص الصوم ).

(٢٨)/أخرجه ابن خزيمة في صحيحه (١٩٩٦) والحاكم (١/٤٣٠-٤٣١) وسنده صحيح .

(٢٩)/أخرجه البخاري برقم (١٩٠٤) كما في الفتح (٤/١٥٢) ، وبرقم (١٨٩٤) كما في الفتح (٤/١٣٤) ومسلم (١٠٩٥) . قال الحافظ في معاني مفردات الحديث :( قوله "فلا يرفث " المراد بالرفث : الكلام الفاحش ، وهو يطلق على هذا ، وعلى الجماع ، وعلى مقدّماته ، وعلى ذكره مع النساء ، أو مطلقاً ، ويحتمل أن يكون لما هو أعمّ منها ) (٤/١٣٥) ، وقال: ( وقوله "ولايصخب " الصخب : الخصام والصياح )(٤/١٥٢)

بەڕۆژووبوو بـا ووتـەی خـراپ و نابـەجێ نـەڵێت ، وەدەمـەدەم و هاوارنـەكات ، وەكـاری نەفامـەكانی لێ نەوەشـێتەوە ، وەئەگەر كەسێك جوێنی پێدا یان شـەڕی پێگێڕا ئەوا بابڵێت : من بەڕۆژووم .

بۆیە دەبینین هەڕەشەی توند لەلایەن پێغەمبـەرەوە ﷺ كـراوە لـەو كەسـانەی ئـەم خراپانـە ئـەنجام دەدەن و خۆیـان ناگرنەوە و بەڕۆژوو نابن لەتاوان و كردار و گوفتـاری خـراپ و نـاڕەوا وەك چـۆن بـەڕۆژوون لـەخواردن و خواردنـەوە : كەئەوانـە تـەنها برسـێتی و تینـوێتی و مانـدو بوونیـان بـۆ دەمێنێتـەوە و هـیچ پاداشـتێك بەدەسـت ناخـەن لەڕۆژووەكەیان .

عـن أبـي هريـرة ﷺ أنّ رسـول الله ﷺ قـال:" ربّ صائم حظه من صيامه الجـوع والعطش " [٣٠]

واتـە :زۆر ڕۆژەوان هەیـە تـەنها برسـێتی و تینـوێتی بـۆ دەمێنێتـەوە. هۆكـاریش ئەوەیـە ئەوكەسـەی ئـەو كردەوە خراپانە ئەنجام دەدات لەڕاستی و حەقیقـەتی ڕۆژوو نەگەیشـتووە كـەوا خوای گەورە فەرمانی پێكـردووە ، بۆیـە خوای پەروەردگار سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە بەبێ بەشكردنی لەئەجر و پاداشتی ڕۆژووەكەی [٣١] .

**دووەم : زۆر تێكۆشـان لـە ئەنجامـدانی خواپەرسـتی و كـردەوەی چاكەدا** : موسڵمانی ئیمان بەرز هەموو كـات پێشـبڕكێ دەكـات لەئەنجامـدانی كـردار وگوفتـاری چـاكەدا و زیـاتر هـەوڵ دەدات خواپەرستی بكات و فەرمانەكانی خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی ﷺ بـەجێ بێنێت بەمەبەستی زیـاتر نزیـك بوونـەوە لەخوای باڵا دەست و پاداشتێكی زیاتری دەست كەوێت لەدونیاو دوا ڕۆژدا ، بەڵام لـەكاتی بـەڕۆژوو بوونـدا بەتایبـەت و لـەمانگی ڕەمەزانیشـدا بەتایبـەتی تـر دەبێـت زۆر زیـاتر تـێ بكۆشـێ و هـەوڵی زیـاتر بـدات بـۆ ئەنجامـدانی كـردەوە چـاكەكان ، چـونكە ڕەمـەزان مانگێكـە قورئـانی تێدا دابـەزیوە و شـەیتانەكانی تێـدا دەبەسـترێتەوە و دەرگاكـانی بەهەشتی تێدا دەكرێتـەوە و دەرگاكـانی دۆزەخـی تێـدا دادەخـرێ [٣٢] . بـۆ یـە دەبێـت _موسـڵمانی بـەڕێز _پێشـوازی مـانگی ڕەمـەزان بكـەیت بەتەوبەیـەكی

، وقال : (وقوله "ولايجهل" أي لايفعل شيئاً من أفعـال أهـل الجهل كالصياح والسفه ونحو ذلك ) .فائدة : وقال أيضاً :( قال القرطبي : لايفهم من هذا أنّ غير يوم الصوم يباح فيه ماذكر ، وإنّما المراد أنّ المنع من ذلك يتأكّد مع الصوم )(٤/١٣٥).

[٣٠] /صحيح سنن ابن ماجة (١٦٩٠) .

[٣١] /أنظر : (صفة صوم النبي ﷺ ) ص (٥٠-٥٢) .

[٣٢] / ودليل ذلك حديث صحيح أخرجه البخاري (٣٢٧٧) كما في الفتح (٤٠٥/٦) ومسلم (١٠٧٩) .

ڕاستەقینەو هیممەتێکی بەرز و ڕاست بۆ ئـەوەی لەدەسـتی نـەدەیت ، وەهـەموو کاتـەکانی ئـاوەدان کەیتـەوە بـەکرداری چاك و جوان بۆ ئەوەی بەر ئەم دوعایەی پێغەمبەر ﷺ نەکەویت کەدەفەرموێت :" رغم أنف رجلٍ دخل عليه رمضان ثمّ انسلخ قبل أن يغفر له "(٣٣) واتە: بیٚدەسـەلاتی و سەر شۆڕی بۆ کەسێك مـانگی ڕەمـەزانی هات بەسەردا و ئەنجا بڕوات پێش ئەوەی خوا لێی خۆش ببێت .

لەڕاسـتیدا مـانگی ڕەمـەزان مـانگی هەوڵـدان و جیهـاد و مـاڵ و کـات بـەخت کـردن بـووە لـەژیانی پێغەمبـەردا ﷺ ، هـەروەها سـەلەفی سـاڵحیش مـانگی ڕەمـەزانیان زینـدوو دەکـردەوە بەئەنجامدانی دەیان کاری خێر و چاکەو تێکۆشـان و هەوڵـدان بـۆ زیـاتر نزیـك بوونـەوە لـە خـوای گـەورە ، نـەك وەك هەنـدێك خـەڵك واتێدەگـەن و وادەزانـن ڕەمـەزان مـانگی ڕابـواردن و تەمـەڵی و بیٚکاری و خەوتنە ! .

**جـا لـەو کردارانـەی کـە زیـاتر لەمانگی ڕەمەزاندا جەختی لەسـەر کــراوەو پێغەمبــەری خــوا ﷺ ئـەنجامی داوەو هـانی موسڵمانانی بۆ داوە ئەمانەی خوارەوەن:**

١. **ڕۆژووگرتن لەڕۆژدا** (**الصيام في النهار**) (٣٤).

٢. **شەونوێژ کردن**: (**القيام بالليل**)

یەك لەسوننەتەکانی مـانگی ڕەمـەزان ئەنجامـدانی نوێـژی تەراویحـە بەدرێـژایی هەموو مانگەکە .

وەپێغەمبەری خوا ﷺ تـەنها یـانزە ڕکعات نوێژی تەراویحی کردووە .

عن عائشة رضي الله عنها قالت :

"ماكـان الـنبي يزيـد في رمضـان ولافي غيره على إحدى عشرة ركعة " (٣٥)

واتە : پێغەمبەری خـوا ﷺ زیـاتر لـە یانزە ڕکعات نوێژی نەکردووە لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزاندا .

وعن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما :

" أنّ النبيﷺ لمّا أحيى بالنـاس ليلـة في رمضان صلّى ثماني ركعات وأوتر"(٣٦).

واتــە پێغەمبــەر ﷺ کـاتیٚ شــەوێك لەڕەمــەزانی بەخــەڵك زینـدوو کـردەوە هەشت ڕکعات نوێژی ویتری کرد.

وعن السائب بن يزيد أنه قال :

---

٣٣ / صحيح سنن الترمذي () .

٣٤ / تێبینی : باس و بەڵگەی ئەم کارە باشانە پێشتر لەبابەتی ﴿ فەزڵەکانی مانگی ڕەمەزان ﴾ باس کراوە ، جا بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە لێرە هەڵگیراون.

٣٥ /أخرجه البخاري (٢٠١٣) . ومسلم : (٧٣٨) .

٣٦ /أخرجه ابن حبان في صحيحه (٩٢٠) والطـبراني في " المعجم الصغير " ص١١٨وسنده حسن في الشواهد أنظر " صفة الصوم "ص(٩٧) .

" أمر عمر بن الخطاب أُبيّ بن كعب وتميماً الداري أن يقوما بالناس بإحدى عشرة ركعة ......." [٣٧].

واتە : (عمر) ی کوڕی (الخطاب) فەرمانی کرد بە (أبي بن كعب) و (تميم الداري)کەنوێژی تەراویح بۆ خەڵك بکەن بە یانزە ڕکعات .......

**٣. بەربانگدان بەرۆژوەوان (إفطار الصائمين)**

**٤ . زۆر قورئان خوێندن (الاجتهاد في قراءة القرآن) :**

مانگی ڕەمەزان بەمانگی قورئان ناسراوە ، چونکە قورئان لەمانگی ڕەمەزاندا دابەزیوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت :

[ شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن هدى للناس وبيّنات من الهدى والفرقان ] [٣٨]

واتە : مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کەتیایدا قورئان دابەزیوە وەك ڕێپیشاندەر بۆخەڵك و بەڵگەی ڕوونی تێدایە لەڕێنموویی و جیاکەرەوەی حەق و ناحەق . وەلەبەر ئەوەی جبريل (عليه السلام ) هەموو ساڵێك لەمانگی ڕەمەزاندا دەهات بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی قورئانی لەلا دووبارە بکاتەوەو زیاتر لەدڵ و مێشکیدا دامەزرێت ، پێغەمبەرﷺلە ساڵی کۆتایی تەمەنی پیرۆزیدا جبريل (عليه السلام) دووجار قورئانی پێ دووبارە کردەوە ، بۆیە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ لەمانگی ڕەمەزاندا زیاتر لەمانگەکانی تر قورئانی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە .عن فاطمة رضي الله عنها قالت : "أسرّ اليّ النبيّ ﷺ أنّ جبريل كان يعرضني كلّ سنة ، وإنّه عارضني العام مرتين ، ولا أراه إلاّ حضر أجلي" [٣٩] ،وعن ابن عباس رضي الله عنه قال :" وكان يلقاه في كلّ ليلة من رمضان فيدارسه القرآن ....." [٤٠] واتە : هەموو شەوێك لەشەوەکانی ڕەمەزان جبريل (عليه السلام) دەگەیشت بەپێغەمبەر ﷺ وەقورئانی پێ دەووتەوە .

قال الحافظ (وفي الحديث فوائد منها :

إستحباب الاستكثار من القراءة في رمضان وكونها أفضل الأذكار ....) [٤١]

واتە : زۆر قورئان خوێندن سوننەتە لە ڕەمەزاندا وەقورئان باشترین ویردە .....

**٥. خێرکردن و ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا (الصدقة في الله) :**

---

[٣٧]/ رواه مالك (١/١١٥) بسند صحيح ، وانظر :"صفة صوم النبي ﷺ "ص(٩٦-١٠٠) وصلاة التراويح للشيخ الألباني رحمه الله .

[٣٨]/سورة البقرة ١٨٥.

[٣٩]/أخرجه البخاري (٣٦٢٤) كما في الفتح (٦/٧٦٦) .

[٤٠]/أخرجه البخاري (٦) (٤٩٩٨) . م (٢٣٠٨) .

[٤١]/ فتح الباري : (١/٤٢) .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەمووکات بەخشندە بووە و بەردەوام بووە لە یارمەتی هەژار و بێنەواکان ، بەلاَم کەمانگی ڕەمەزان دەهات زیاتر کات و ماڵی دەبەخشی بۆ زیاتر نزیك بوونەوە لەخوایگەورە ، تەنانەت (عەبدوڵلای کوڕی عەبباس) بەخشندەیی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕەمەزاندا دەشوبهێنێ بەشنە بای پڕ خێر و ڕەحمەت بۆ خەڵك و گیان لەبەران . عن ابن عباس رضي الله عنهما قال " كان رسول الله ﷺ أجود الناس ، أجود مايكون في رمضان حين يلقاه جبريل،وكان يلقاه في كلّ ليلة من رمضان فيدارسه القرآن ، فلرسول الله أجود بالخير من الريح المرسلة "(٤٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو خەڵك بەخشندەتر بوو، بەلاَم لەڕەمەزاندا زیاتر بەخشندەتر دەبوو کاتێ جبریل پێی دەگەیشت ، وەجبریل دەگەیشت بە پێغەمبەرﷺ هەموو شەوێك لەشەوەکانی ڕەمەزان قورئانی پێ دەخوێند ، وە پێغەمبەری خواﷺ بەخشندەتر بوو لە چاکەوخێردا لەشنەبایپڕخێرو ڕەحمەت.

قال الحافظ (الجود في الشرع : إعطاء ماينبغي لمن ينبغي وهو أعمّ من الصدقة .وأيضاً فرمضان موسم الخيرات ، لأن نعم الله على عباده فيه زائدة على غيره فكان النبي ﷺ يؤثر متابعة سنة الله في عباده ، فبمجموع ماذكر من الوقت والمنزول به والنازل والمذاكرة حصل المزيد في الجود ،والعلم عند الله تعالى) (٤٣)

واته : بەخشندەیی لەشەرعدا پێناسە کراوە بە بەخشینی ئەوەی کەشایستەیە بۆ ئەو کەسەی کە شایستەیە ، وەبەبەخشندەیی فراوانترە لە بەخشینی ماڵ ، هەروەها ڕەمەزان کاتی خێر و چاکەیە ، چونکە نیعمەتەکانی خوا بەسەر بەندەکانیەوە تیایدا زۆرترە جگە لە ڕەمەزان بۆیە پێغەمبەر ﷺ شوین سوننەتی خوا دەکەوت لەبەندەکانیدا ، بۆیە بەکۆی ئەوەی باسکرا کەکاتی ڕەمەزانی پیرۆزە . وەئەوەی کەدابەزێنراوە قورئانی پیرۆزە . وەئەوەی کە دابەزیوە (جبریل)ە علیە السلام . وەئەو بیرخستنەوە و خوێندنەی قورئان بەهۆی هەموو ئەمانەوە زیاتر بەخشندەیی پێغەمبەر ﷺ پەیدا بوو لەمانگی ڕەمەزاندا ، والعلم عند الله تعالى، وقال الحافظ (والمرسلة أي المطلقة تعني أنّه في الإسراع بالجود أسرع من الريح ، وعبّر بالمرسلة إشارة الى دوام هبوبها بالرحمة ، والى عموم النفع بجوده

---

(٤٢) أخرجه البخاري (٦) كما في الفتح (١/٤١-٤٢) .

(٤٣) الفتح (١/٤٢-٤٣) .

لما تقع الريح المرسلة جميع ماتهب عليه ...)[44]. (المرسلة) : (نێردراو) : مەبەستی ئەوەیە کەپێغەمبەر ﷺ لە بەخشندەیەتیدا خێراتر بووە لە با ، وە دەربڕینی ئەو مەبەستە بە وشەی (المرسلة) ئاماژەیە بۆ بەردەوامی هاتنی بەڕەحمەت و چاکە ، وەئاماژەیە بۆ گشتێتی سودی ئەو بەخشندەییەی پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن شنەی بای نێردراو سوودەکانی هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کەدەچێت بەسەریدا .

**٦. مانەوە لەمزگەوتدا (الإعتكاف):**

زۆر مانەوە لەمزگەوت بەمەبەستی چاوەڕوان کردنی نوێژە فەرزەکان و خوێندنەوەی قورئان و زیکر و دوعا کردن و ئەنجامدانی نوێژی سوننەت (التطوع المطلق) واتە : نوێژی سوننەتی بێ سنور و دیاری نەکراو ، ئەم جۆرە مانەوەیە لەمزگوتدا سوننەتێکی زۆر پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ کەسەلەفی سالّەح هەولّیان داوە بەجێ بێت و کردەوەی پێ بکەن ، بەلاّم لەڕەمەزاندا زیاتر دەمانەوە لەمزگەوتدا بەمەبەستی ئەنجامدانی عیبادەتێکی زیاتر بۆ خوای گەورە : عن أبي هريرة رضي الله عنه قال " كان رسول الله ﷺ يعتكف في كلّ رمضان عشر أيّام ، فلمّا كان العام الذي قبض فيه اعتكف عشرين يوماً "[45] واتە : پێغەمبەر ﷺ لەهەموو ڕەمەزانێکدا دە ڕۆژ لەمزگەوتدا دەمایەوە ، بەلاّم لەوساڵەی کە تێیدا وەفاتی کرد بیست ڕۆژ مایەوە لە مزگەوت . وفي حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال :" إنّ رسول الله ﷺ كان يعتكف في العشرالأوسط من رمضان ....."[46] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەدە ڕۆژی ناوەڕاستی ڕەمەزاندا لەمزگەوت دەمایەوە .

قال الحافظ (الاعتكاف لايختص بالعشر الأخير وإن كان الإعتكاف فيه أفضل) الفتح (٣٦١/٤) .واتە : مانەوە لەمزگەوت (بۆ خواپەرستی) تایبەت نییە بەدەڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان ، هەرچەندە مانەوە لەمزگەوت لەدەڕۆژی کۆتاییدا چاکترە ، وەبەڵگە لەسەر چاکێتی دەڕۆژی کۆتایی ئەمەیە :

عن عبدالله بن عمر رضي الله عنه قال: "كان رسول الله ﷺ يعتكف عشر الأواخر من رمضان "[47] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لەدەڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لەمزگەوتدا دەمایەوە .

---

/الفتح (٤٣/١).

/أخرجه البخاري (٢٠٤٤) كما في الفتح (٣٦١/٤) .

/أخرجه البخاري (٢٠٢٧) و(٢٠٣٦) و(٢٠٤٠) .

/أخرجه البخاري (٢٠٢٥) (٣٤٤/٤) .

**٧. گەڕان بەدوای شــەوی قــەدردا (تحرِّي ليلة القدر)** :

پێغەمبــەری خــوا ﷺ زۆر بەگــەرمی دەگەڕا بەدوای شەوی قەدردا وەفەرمانی بـە هـاوەڵان دەکـرد کەبەدوایـدا بگـەڕێن وەخێـزان و منـداڵ و خزمـانی بەخەبـەر دەکردەوە لەدەشەوی کۆتایی ڕەمەزانـدا بــەهیوای دەستخســتنی شــەوی قــەدر و پاداشتە زۆرەکەی ، قال الله تعالى

[إنا أنزلناه في ليلة القدر وما أدراك ما ليلة القدر ليلة القدر خير من ألف شهر تنزل الملائكة والروح فيها بإذن ربهم من كل أمر سلام هي حتى مطلع الفجر ][48]

وعن أبي هريرة ﷺ أنّ النبي ﷺ قال : " من قام ليلة القدر إيماناً واحتساباً غفر لــه ماتقدم من ذنبه " (٤٩).

واتــە : هەرکەســێ لەشــەوی قــەدردا هەڵسـێت بــە خــوا پەرسـتی بـەئیمان و بەتەما بوونی پاداشتی خوا گەورە ئـەوە خـــوای گـــەورە لەهـــەموو تاوانـــەکانی ڕابوردووی خۆش دەبێت .

عن عائشة رضي الله عنها قالـت : كـان رسول الله ﷺ يجاور في العشر الأواخـر مـن رمضان ويقـول : "تحرّوا ليلــة القــدر في العشر الأواخر من رمضـــان " (٥٠) واتـە : پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەدەڕۆژی کۆتـایی ڕەمەزانــدا لەمزگــەوت دەمایــەوە (بــۆ خواپەرسـتی) وەدەیفــەرموو : بــەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن لەدەشەوی کۆتایی ڕەمەزاندا .

**٨ . عـــــومرە کــــردن (العمــــرة في رمضان)**:

ڕۆیشــتن بـۆ ئەنجامـدانی عـومرە لـە مەککـە لــەمانگی ڕەمەزانـدا بەتایبــەت پاداشـــتێکی زۆری تێدایـــە وەك لــــەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت:

عن ابن عباس رضي الله عنهما قــال : قال رسول الله ﷺ :"عمرة في رمضان تعدل حجة " (٥١). وفي رواية "تعدل حجة معي".

واتـــە : عومرەیـــەك لەڕەمەزانـــدا پاداشـتەکەی بەرامبــەر حــەجێك وایــە ، لەڕیوایەتێکدا هاتووە : وەك حەجێك وایە لەگەڵ پیغەمبەردا .





٤٨/ سورة القدر .

/ أخرجه البخاري (٢٠١٤) كما في الفتح (٤/٣٢٣) .

/أخرجه البخاري (٢٠٢٠) كما في الفتح (٤/٣٢٩) .

/ أخرجه البخاري (١٧٨٢) و(١٨٦٣) ومسلم (١٢٥٦).

# ئایا ڕۆژوو گرتنەکەت وەك ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەرە ﷺ ؟

ماموٚستایان: عدنان بارام و علی عبداللّه

بێ گومان ڕۆژوو گرتن یەکێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام ، وە عیبادەتێکی مەزنە“ بەلأم شتێکی بەلّگە نەویستە کە ئەم عیبادەتەش وەکو تێکڕایی عیبادەتەکانی تر بۆ گیرابونی لەلایەن خوا پێویستی بە دوو مەرج هەیە :

یەکەم : عیبادەتەکە بۆ خوا بکرێت بەتاك و تەنهایی بەبێ هیچ مەرام و مەبەستێکی تر. ئەگینا شیرك دەکەوێتە ناو عیبادەتەکەوە .

دووەم : بەو شێوەیەش عیبادەتەکە بۆ خوا بکرێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی و ئامازەی بۆ کردووە ، واتە عیبادەت کردنەکە موافقی شەریعەت و سونەتی نێردراوەکەی خوا بێت . ئەگینا بیدعەو شتی داهێنراو دەکەوێتە ناو عیبادەتەوە. وە لەجیاتی پاداشتیش سزای دەکەوێتە سەر .

کەوابوو پێویستە مرۆڤی موسولّمان لە هەموو عیبادەتەکانیدا بە گشتی نیەتی خۆی تەنها کات بۆ اللّه ، وە بەو شێوەیەش ئەنجامی بدات کە سوننەتە.

وەبەتایبەتیش ڕۆژوو وپەرستشەکانی ڕەمەزان کە هۆکارێکی گەورەی نزیك بوونەوەو خۆشەویستی‌یە لەلای خوای پەروەردگار و هۆی زیاتر لەخواترسان ولێ نزیك بوونەوەیەتی، پێویستە لەسەر هەموو موسلّمانیك هەولّی ئەوە بدات کە بەشەکانی ئەم پەرستشە بەشێوەیەك ئەنجام بدات کەلەگەلّ قورئانی پیرۆز وفەرموودە وسوننەتەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تەواو بەرامبەر بێ. بەلأم دەبینین زۆرێك لە ڕۆژووەوانان مەرجی دووەمیان وەکو پێویست تێدانی‌یە لە ڕۆژوگرتنەکەیان .

واتە: بەگوێرەی شەریعەت و سوننەت ڕۆژوەکانیان ناگرن بەتەواوی ، بەلّکو زۆر شتی داهێنراوو بێ شەرعی‌یان تێدا بەدی دەکرێت. کە ئەو سەرپێچی‌و بێ شەرعی و داهێنراوانە بەگشتی دەبنە هۆی لە دەست چونی ئەجرو پاداشتی تەواو، وەهەیانە گوناهیشیان بۆ دەنوسرێت و تاوانبارو قەرزداریش دەبنەوە لەسەری .

## سەرپێچی و داهێنراوەکانی ڕۆژوەوان:

**یەکەم/ هەندێک داهێنراو کە لەپێش مانگی رەمەزان دەکرێت:**

١ - بەکارهێنانی ژمێریاری گەردوونی **"الحساب الفلكي"** لەدەست پێکردنی مانگی رەمەزان:

پرسیار کرا لە **"اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء"**-شێخ **محمد بن صالح العثيمين-رحمه الله-** وشێخ **عبد الله بن عبد الرحمن الجبرين-** سەبارەت بە بەکارهێنانی ژمێریاری گەردوونی واتە**"الحساب الفلكي"** لەدەست پێکردنی مانگی ڕەمەزان کە ئایا ڕەوایە یان نا؟

ئەوانیش لەوەلأمدا فەرموویان: ڕێگەی شەرعی بۆ دەست نیشان کردنی هاتنی مانگی ڕەمەزان بینینی چاوە هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:"صُومُوا لرؤيَته وأَفْطرُوا لرؤيَته"[١] واتە: بەبینینی مانگ ڕۆژوو بگرن وبەبینینیشی وازی لێ بهێنن ،واتە بەبینینی مانگی ڕەمەزان بۆدەست پێکردن وبەبینینی مانگی شەوال بۆ کۆتایی پێهێنان.

پاشان بەکارهێنانی ژمێریاری یە گەردونیەکانیان بەنامۆ وبیدعە داناوە، وفەرموویانە نابێ ئەنجام بدرێ[٢].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

" إنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ لانَكْتُبُ ولانَحسبُ، الشَّهرُ هكذا وهكذا"[٣].

پێشەوا"النووي" فەرموویەتی کەزانایان فەرموویانە:أُمِّيَّة: واتە ئێمە گەلێکین لەسەر ئەوە ماوین کەلەسەری لەدایك بووین نەدەنووسینەوە ونە"حساب"یش ئەکەین[٤].هەروەها پێشەوا "إبن حجر" فەرموویەتی:"والمراد بالحساب هنا حساب النجوم.....، بل ظاهر السياق يُشعر بنفي تعليق الحُكم بالحساب أصلاً"[٥].

کەواتە: بەکارهێنانی ژمێریاری یە گەردوونیەکان کارێکی نارەوا وبیدعە وداهێنراوە ونابێ پشتی پێ ببەسترێ بۆ دەست نیشان کردنی هاتنی مانگی ڕەمەزان یان کۆتایی هاتنی.

٢- گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی گومان"يوم الشك" بەنیەتی ئیحتیات کردن:

چونکە ئەم کردارە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ هەروەکو

---

(١) البخاري(١٩٠٩)، ومسلم (١٠٨١).

(٢) فتاوى رمضان.أشرف بن عبدالصمد ١(/٦٠_٦٣).

(٣) البخاري(١٩١٣)، ومسلم(١٠٨٠) .

(٤) شرح صحيح مسلم (١٩٢/٧).

(٥) الفتح (١٥١/٤).

لـە"عمَّـار" ەوە ڕەزای خـوای لێبێـت ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

"مَنْ صَامَ اليومَ الذي يُشَكُّ فيــه فَقَــدْ عَصَى أبا القاسم "(٦).

واتە: ئەوکەسـەی ئـەو ڕۆژە بـەڕۆژوو بێــت کەخـــەڵکی لێ ی بەگومانـــە کـــە ڕەمەزانـــە یـــان نـــا ئـــەوا سەرپێچـــی فـــەرمانی "أبـــا القاســـم"ی کـــردوە کەپێغەمبەری خوایە ﷺ . هەروەها"أبـو هريـــــرة" ڕەزای خـــــوای لێ بێـــــت لەپێغەمبـــــەری خـــــواوە ﷺ بۆمـــــان ئەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی":

لايَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَومٍ أو يَومين، إلا أَنْ يكون رجل كـــان يصـــومُ صَومه، فَلْيَصُمْ ذلك اليوم"(٧).

واتــە: نـابێ کەسـێ لـەئێوە پێشـی ڕەمـەزان بکـەوێ بـەڕۆژووی ڕۆژێـك یـان دووان بـە نیـازی ئیحتیـات کـردن، بـەڵام ئەگەر کەسێك لـەئێوە ئـەو ڕۆژە لەگـەڵ ڕۆژی ڕۆژووی سـوننەتی جـووت بـوو بـا بەڕۆژوو بێت.بۆیە گرتنی ڕۆژووی ڕۆژێك یان زیاتر بەر لەڕەمەزان بەنیازی ئەوەی نەوەکو ڕۆژێك ڕۆژووی ڕەمەزانی بفەوتێ، بیدعەیە ونابێ بکرێ جگە لەو کەسانەی کـــە ئـــەو ڕۆژە لەگـــەڵ ڕۆژی ڕۆژووی سوننەتیاندا هاوکات ئەبێ.

### دووەم/ئەو بیدعانەی کەلەنیەت هێنانی ڕۆژوودا دەکرێ:

١-نیەت هێنان بە زمان:

وتنی نیەت لەکاتی ڕۆژوودا بیدعەیـە، چونکە نیـەت نیـازی دڵـە وشوێنەکەشـی دڵە نەك زمان،هەر بۆیە هێنانی بە زوبـان شـــتێکی داهێنـــراو وخراپـــە باهەنـــدێ خەڵکیش بەچاکی بزانن(٨).

هەروەها لەبارەی"نیەت"ەوە پرسیار کرا لە شێخ -صالح الفوزان- بۆ ڕۆژووی مـــانگی ڕەمـــەزان ، ئـــەویش لەوەڵامـــدا فەرمووی:

هـــەموو کردارێـــك پێویســـتی بەنیـــەت هەیە ولەم بارەشەوە پێغەمبەری خـوا فەرموویـەتی"إِنَّما الأعمالُ بالنِّيات وإِنَّمـــا لِكُلِّ إمرىءٍ ما نَوَى"(٩).

ڕۆژووش وەکو هەر کردارێك پێویستی بەنیەت هەیە بـەڵام پێویسـت ناکـات کـە ئەونیەتــە بــەزمان بــوترێ، بــۆ نموونــە بوترێ (نیەتمە ڕۆژوو دەگرم) ئـەم کـارە بیدعەیە ونابێ ئەنجام بدرێ (١٠).

(٦) وعلّقه البخاري ووصله أبو داود والترمذي وابن ماجه والنسائي والحديث حسن .

(٧) أخرجه البخاري(١٩١٤) ومسلم(١٠٨٢) .

(٨) "صفة صوم النبي ﷺ "في رمضان للشيخ علي بن حسن والشيخ سليم الهلالي ص(٣٠)

(٩)البخاري(٦٦٨٩)، ومسلم(١٩٠٧) .

(١٠) "فتاوى الصيام :ج١ ص١٦٢_١٦٣ .

٢-دانانی ڕستەیەکی تایبەت بۆ وتنی نیەت لە ڕۆژووگرتندا:

ئەمیش دیسان پەیوەندی بە خاڵی یەکەمەوە هەیە، بەلاَم لێرەدا ئاماژە بەوە دەدەین کەلەناو خەڵکداو لەکوردستانی خۆماندا هەندێ ڕستە تایبەت کراون بۆ چۆنێتی ووتنی نیەت لەمانگی ڕەمەزاندا، کەئەم ڕستانەش هەمان حوکمی " حوکمە گشتیەکەیان" هەیە، واتە ئەمانیش جائیز نی یە ووتنیان و بەداهێنراوو بیدعە دائەنرێت لەڕوی شەرعەوە ئەمەش لەبەر نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی دروست کەڕاستیەکەی بسەلمێنێ چ لەقورئانی پیرۆز یان لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دا. دیارە ئەم ڕستانەش بەگوێرەی جیاوازی لەهجەو شێوەزارەکان و جیاوازبوونی ناوچەکانیش ئەگۆڕێت، بەلاَم بۆ نموونە چەند ڕستەیەك باس ئەکەین، بۆ نموونە ئەڵێن(نیەتمە سبەینێ بەڕۆژوو ئەبم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ، خوا وەری گرێت لێمان)، یان(نیەتمە سبەی بەڕۆژوو ئەبم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزە لەسەرم، ئەیگرم بۆخوا- الله أکبر)، وەیان ئەڵێن(نیەتمە سوبحەی بەڕۆژوو ئەبم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان- ساڵی ئەمساڵ، خوا قەبوڵی کات لێمان، اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين) و....هتد.

**سێیەم/لە بیدعەکانی بانگ دان و پارشێوکردن:**

١- بیدعەی ئاگادار کردنەوە بۆ پارشێوکردن.

بەمەبەستی ئاگادار کردنەوەی خەڵکی بۆ پارشێو کردن چەند شێوازێکی بێشەرعی داهێنراون وەك:

*بانگی خەڵکی دەکەن و دەڵێن : هەڵبستن نان بخۆن ئەمەش جۆرێکی تری بیدعەیە

*سوڕانەوە بە دەوری ماڵاندا بە لێدانی تەپڵ و دەف و گۆرانی و دەهۆڵ لێدان، لەلایەن پێرێکی بەکرێ گیراو بۆ ئەم مەبەستە! وە پارشێو دەکەنەوە

*یا لەسەر مینبەرەکان بە ئامێرێکی دەنگی خەڵك هۆشیار دەکەنەوە و چەند ئایەتێك وهۆنراوەیەك دەڵێن ، چەند جارێك ئەم ئامێرە بەکار دەهێنن.

سەیریش لەوەدا ، هەر هەمان پێریشە کە لەکاتی ئاهەنگ و گۆرانی وتندا هەمان ئامێر بەکار دەهێنن و بەشەقام وکۆڵانەکاندا دەڕۆن.

لەپاشان کاتێ کەمانگی ڕەمەزان دێت ، ئەو مانگەی کە مانگی خوا پەرستیە ، مانگی نوێژو ڕۆژوو گرتنە، مانگی

تەوبەو گەڕانەوە لە هەموو تاوانێك، ئەو کەسانە دەبینن پێشوازی لەم مانگە دەکەن بە شێوەیەکی ناشەرعی .

لەبەر ئەمە پێویستە لەسەر هەر موسوڵمانێك ئەگەر توانای گۆڕینی ئەم کارەی هەبوو پێویستە بیگۆڕێت بەتایبەتیش بانگ دەرو پێش نوێژ خوێن، هەریەکەو لە وڵات و شاری خۆی هەوڵی گۆڕینی بدات، ئەگەر توانای هەبوو ، وە ئەگەر نەیتوانی با لە مزگەوتەکەی خۆیدا بیگۆڕێت.

ئەم پارشێو کردنەوەیە هیچ پێویست و زەرور نییە . چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بۆ ئێمە داناوە بانگدانی یەکەمە لەکاتی بەیانبدا کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوادن و خواردنەوە دروستە، وە بانگ دانی دووەمیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خواردن و خواردنەوە حەرامە " کەواتە پێویست بە هیچ شتێکی تری زیاد ناکات بیکەین بە بیدعە ، چونکە ئەگەر بانگ دەرەکان دوو جار بانگ بدەن ئەوا ڕێك و تەواو دەبن و دەزانرێن.

٢-الإمساکیة:کە لەپێش بانگی بەیانیدا ئەوترێت (الإمساك- الإمساك یا أمة محمد الإمساك) یان هەر وتەو زیکرێکی تر کە بەنیازی وازهێنانی خەڵکی لەخواردن و خواردنەوە ئەوترێت. هەموو ئەو ووتانە بیدعەیە و هیچ ئەصل و بنەوایەکیان نی یەلە ئاینی پاك و بێگەرد وپیرۆزی ئیسلامدا.

١- وازهێنان لەخواردن بەبیستنی بانگەوازی بەناو "الإمساکیة":

ئەوەی کەلەفەرموودەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە ئەوەیە کە وازهێنان لەخواردن لەپارشێوی مانگی ڕەمەزاندا بەستراوە بە بانگی دووەمی بەیانی یەوە کەلەکاتی دەرکەوتنی گزنگی ڕاستدا "الفجر الصادق "دا دەدرێت.

وەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (الفجرُ فَجْران فأمَّا الأول فإنَّهُ لا يُحَرِّمُ الطعام، ولا يحلُّ الصلاةَ وأمَّا الثَّاني فإنَّه يحرِّم الطعام ويحلُّ الصلاة")[11].

واتە: گزنگ دووانە: یەکەمیان کە گزنگی ڕاستەقینە نی یە ، خواردن وخواردنەوە قەدەغەناکات ونوێژیش نابێت لەوکاتەدا بکرێت، بەڵام دووەمیان کە گزنگی ڕاستەقینە یان "ڕاستگۆ"یە خواردن وخواردنەوە قەدەغەئەکات وئەوکاتەش کاتی نوێژی بەیانی یە.

بەڕێز ڕۆژوەوان: کەواتە وازهێنان لەخواردن وخواردنەوە لەکاتی بیستنی بانگەوازی "الإمساکیة"دا کەبەر لە بانگی بەیانیدا ئەکرێت بیدعەیە وپێچەوانەی

(١١) أخرجه ابن خزيمة والبيهقي وسنده صحيح .

سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ ، جا ئیتر بەهەر نیەتێکەوە بێت ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە نەك هەرپێش بانگ دەکەوێ ، بەڵکو ئەبێ بزانین کە خودی بانگەکە پێش گزنگی ڕاستگۆ دەدرێت بەنیازی ئیحتیات کردن بەگومانی خۆیان.

٤- پێش خستنی پارشێو:

سوننەتە پارشێو دوابخرێ تا کاتی گزنگی ڕاستەقینە چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:

(وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر)[12].

وەلەسوننەتدا هاتووە کەئەوەندەی کاتی خوێندنی پەنجا ئایەت ئەتوانرێت پارشێو پێش بخرێت نەك وەکو هەندێك لەموسوڵمانان ئەنجامی ئەدەن لەپێش وەختێکی زۆر زوودا[13].

٥- بانگ دان پێش دەرکەوتنی فەجری ڕاستگۆ بەنیەتی ئیحتیاتەوە:

پرسیار کرا لە شێخ محمد بن صالح العثيمين - رحمه الله- حوکمی ئەو کەسانە چی یە کە بانگ پێش ئەخەن لەکاتی خۆی؟

لەوەڵامدا فەرمووی: ئەوانەی کە پەلەئەکەن لەبانگداندا وپێشی ئەخەن لەکاتی گونجاوی خۆی بەنیازی ئیحتیات کردنەوە هەڵەن و هەڵەشەکەیان لەم ڕوانەوەیە:

یەکەم: ئیحتیات کردن لە پەرستشەکاندا ئەوەیە کەپابەندی ئەوەبین کەلەشەرعدا هاتووە، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت:

"كُلوا واشربوا حتى يُؤَذِّنَ إبنُ أُمِّ مَكتوم فَإنَّه لا يؤذِّنُ حتَّى يطلع الفجر".

نەیفەرموو تاکاتی نزیك بوونەوەی دەرکەوتنی فەجری ڕاستگۆ بەڵکو فەرموویەتی تاکاتی دەرکەوتنی فەجری ڕاستگۆبو ئیحتیات کردن بۆبانگ دەران ئەوەیە کەبانگ نەدەن تاکاتی دەرکەوتنی گزنگی ڕاستەقینە.

دووەم: ئەوبانگ دەرانەی کەبانگ پێش ئەخەن بەنیازی ئیحتیات کردنەوە خۆیان هەڵەن وخەڵکانێکی زۆرێش ئەخەنە هەڵەیەکی گەورەترەوە بەوەی کەزۆرێك لەوانەی کەنوێژەکانیان بەجەماعەت ئەنجام نادەن وەکو ئافرەتان یان ئەوانەی کە ڕێگرێکی شەرعیان هەیە بۆ نەچوونیان

---

(١٢) (سورة البقرة :١٨٧).

(١٣) پێشەوا الحافظ فەرموویەتی:ئایەتەکانی ناوەندی بن، نەدرێژ و نەکورت، وەلەسەرخۆ بخوێنرێ.الفتح :(١٦٤/٤).

بۆجەماعەت نوێژەکانیان پێش لەکاتی ڕاستەقینەی خۆی ئەنجام بدەن[١٤].

**چوارەم/**

**لەبیدعەکانی بەر بانگ:**

١- دواخستنی بەر بانگ بەبیانووی دڵنیابوون لەتەواوبوونی کات :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی":

لا يزالُ الناس بخير ما عجَّلوا الفطر"[١٥]

واتە:خەڵکی هەر لەسەر خێر بەردەوامن تائەوکاتەی پەلەئەکەن لەبەربانگ دا.وەفەرمووی:

"لاتزال أُمَّتي على سُنَّتي ما لم تنتظر بفطرها النجوم".

واتە: ئوممەتەکەم لەسەر خێر بەردەوامە تائەوکاتەی چاوەڕێی دەرکەوتنی ئەستێرە نەکەن بۆ بەربانگ.کەواتە مانەوەی موسڵمانان لەسەر خێر بەستراوە بەپەلەکردن لەبەربانگ ودوانەخستنی تا کاتی دەرکەوتنی ئەستێرە.

بەڵکو هەر بەئاوابوونی خۆر پێویستە ڕۆژووەوان بەربانگ بکاتەوە.هەروەکو پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

"إذا أقبلَ الليلُ مِنْ هاهنا،وأدبرَ النهارُ مِنْ هاهنا، وغربت الشمس فقد أفطر الصائم"[١٦].

لەوەش زیاتر کەئەبێ ڕۆژووەوان زیاتر پابەندبێ بەسوننەتەکانی پێغەمبەر وفەرمانەکانیانەوە،پێویستە کەدوور بکەوێتەوە لەخۆ شوبهاندن بە جوولەکەو خاچ پەرستان"اليهود والنصارى"چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی:

"لايزال الدين ظاهراً ما عجَّلَ النَّاسُ الفطْرَ، لأنَّ اليهود والنصارى يؤخرون"[١٧]

کەواتە:پەلەکردن لەبەربانگ سوننەتی پێغەمبەری ئازیزمانەﷺ وپێچەوانەکەشی کەدواخستنیەتی سوننەتی جوولەکە وخاچ پەرستانە وئەنجام دانی بیدعەیە وخۆشوبهاندنە بەوان-خوا پەنامان بدات.

**پێنجەم/**

**لەبیدعەکانی خۆ بەپاك ڕاگرى**

**[من بدع التطهر]**

١. ئاو لەدەم و لوت وەرنەدات لە کاتی دەست نوێژ هەڵگرتنیدا .ئەمەش کەمتەرخەمیە" چونکە دەبێت هەموو دەست نوێژ گرێك ئاو لە دەمیو لوتی وەردات . بەڵام ڕۆژوەوان غەرغەرەی پێ ناکات و زۆر بەلوتی ئاو هەڵنامژێت وەك

(١٤) فتاوى رمضان ١ /(١٩٦_ ١٩٧).

(١٥) رواه البخاري(١٩٥٧)، ومسلم(١٠٩٨).

(١٦) رواه البخاري(١٩٥٤)، ومسلم(١١٠٠-١١٠١) .

(١٧) رواه أبو داود (٢٣٥٣) وسنده صحيح .

لــه حەدیســدا پێغەمبــەر ﷺ فــەرمانی کردووه .

(وبالغ في الاستنشــاق إلا أن تكــون صائماً)[١٨].

٢. بــەکار نــەهێنانی ســیواك کــاتی بـــەڕۆژوو بـــون بەگشـــتی ، وەدوای نیوەڕۆیانیش بەتایبەتی لەبەر ڕۆژوو .

ئەمــەش پێچــەوانەی ســوننەتە کــە دەفەرموێت :

"لولا أن أشُقَّ علــى أُمَّـــتي لأَمَــرْتُهُم بالسواك عند كل صلاة"[١٩].

واتــە: ئەگــەر بەقورســیم نەزانیایــە لەســـەر ئوممەتەکـــەم ئـــەوا فـــەرمانم پێئــەکردن بەســیواك کــردن لەهـــەموو نوێژێکدا.ئـەم فەرموودەیـەش ڕۆژووەوان وکەســانی تــر لێــك جیاناکاتــەوە بۆیــە وازهێنــان لەســیواك کــردن دوای لادانــی خـــۆر لەناوەڕاســـتی ئاسمـــان بـــەرەو خۆرئـــاوابوون تایبـــەت کردنێکـــی بـــێ بەڵگەیە وئیش پێکردنیشی بیدعەیە بۆیە ئەبینین بۆچوونی پێشەوا"البخاري و ابن خزیمـــة"وغـــەیری ئـــەمانیش ئەوەیـــە کەســـیواك کـــردن ســـوننەتە لەهـــەموو کاتێکـــدا بـــۆ ڕۆژووەوان وبۆغـــەیری ئەوانیش[٢٠].

هــەروەها بۆزیـاتر دڵنیـابوون لـەوەی کەسیواك کردن بەدرێـژایی ڕۆژ سـوننەتە بــۆ ڕۆژووەوان وبۆغەیریشـــی ، بڕوانـــە کتێبــی"فتـاوی رمضـان: ج٢-ص ٤٩٠-٤٩٣" کەتێیـدا "شـێخ محمد بـن صـالح العثیمین وشیَخ صـالح بـن فـوزان وشـێخ عبـدالله بـن جـبرین " هـاودەنگن لەسـەر ئــەوەی کەسـیواك کـردن بـۆ ڕۆژووەوان سـوننەتە بەدرێـژایی ڕۆژ بــەبێ تایبــەت کردنی بەپێش لادانی خۆر لە ناوەڕاسـتی ئاسمــان. هەرلــەو سەرچـاوەیەدا شـێخ "محمـد بـن صـالح العثـيمين رحمـه الله" ئاماژە بۆ فەرموودەیەکی ضعیف ئـەکات کەبەڵگەی ئەو کەسانەیە کەئـەم تایبـەت کردنە ئەکەن وبەڕاستی ئەزانن ئەویش:

"إذا صُمْتُم فاستاكوا أوَّلَ النَّهـــار ولا تستاكوا آخِرَهُ".

٣- بە تاوان زانینـی تـوش بـوون بـە جەنابەت لـە ڕەمەزانـدا . ئیحـتلام بـوون واتە (جەنابەت) ڕۆژوو بە تاڵ ناکاتەوە ، چونکە بە ئارەزوی ڕۆژوەوان نـیە. بەڵام پێویسـتە خـۆی بشـوات کـە توشـی ئـەم حاڵەتــە هــات . بەهـــەمان شـێوە ئـــەو ئافرەتەی توشـی حـەیزو نفـاس دەبـێ ، ئەگــەر لــەم دووحاڵەتــە پــاك بوونــەوە لەشــەودا و" خۆیـان نەشوشـت تـا دوای بــەیانی، ئــەوا تاوانیـان لەســەر نـیـە و ڕۆژوەکـەیان دروسـتە .. بــەڵام دروسـت

---

(١٨) أبي داود(٢٣٦٦).

(١٩) رواه البخاري(٨٨٧)، ومسلم(٢٥٢).

(٢٠) صفة صوم النبي ﷺ في رمضان ص(٥٣).

نییە بۆ پیاوو ژن کە خۆشوشتنەکە، یان نوێژەکـــەیان دوابخـــەن بـــۆ کـــاتی دەرکەوتنی خۆر .

٤- ڕێگە گرتن لە بەڕۆژوو بوونی کچی بچوك .

هەرکاتێك ئافرەت گەیشت بـە تـووش بوون بە حەیز ئەوە دەبێت بەڕۆژو ببێت و نابێت دایکی و باوکی قەدەغـەی بکـەن لەبـە ڕۆژوو بـوونی "بەبلگـەی ئـەوەی کەتەمـەی کەمـە ، چـونکە زۆر لەکچـان توشـی ئـەم حاڵەتـە دەبـن لـە تەمـەنی دەساڵییان یازدە ساڵیدا .

٥- بەتاوان زانینی بەکارهێنانی خەنە لەکاتی بەڕۆژوو بوندا .

پرسیار کـرا لـە شـێخ (ابـن عثـيمين). ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ ئایـا دروسـتە خەنەدان لەسەر لەکاتی بەڕۆژوبونداو ئایا ڕۆژو دەشکێنێ ؟

لـە وەڵامـدا فـەرموی : (ئەمـە ڕاسـت نییە ، چـونکە خەنـەدان لـە قـژ لـەکاتی بەڕۆژو بون دا هیچ کار ناکاتە سەر ڕۆژوو ، هـەروەك بـەکارهێنانی کـل و قـەترەی چاوو گوێ کە ئەمانـە زیـان بـەڕۆژوەوان ناگەیەنن و ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوەوە).

٦- بـــەتاوان دانـــانی تـــام کردنـــی خواردەمەنی :

هەندێ ئافرەت تام کردنی خواردن بە تاوان دەزانن لە ترسی ئـەوەی کـە زیـان بەڕۆژوەکـەیان بگەیـەنێت . بـەلاّم ئەمـە بەتاوان دانانرێت ئەگەر تەنها خواردنەکە تام بکات و قوتی نەدات .

٧- پاك بوونـەوەی ئـەو ئافرەتانـەی کە تووشی نیفاس بوون پێش چـل ڕۆژ ، وە خۆ قەدەغە کردنیان لە نوێژو ڕۆژوو.

هەندێك ئافرەت پاك دەبنەوە لە نیفاس پێش تەواو بوونی چل ڕۆژ، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی قەدەغە دەکات لە نوێژو ڕۆژو هەتا چل ڕۆژەکە تەواو دەکات !.

بـەلاّم ئـەم کـارە هەڵەیـە ، بـەڵکو هەرکاتێك خوێنلە ئافرەتەکـە وەسـتا لـە ڕۆژەکانی نیفاس دا " ئەگەر پێش تـەواو بوونی چل ڕۆژەکەش بوو- ئەوە خۆشی دەشوات و لەپاشـان نوێـژو ڕۆژوو بـەجێ دەگەیەنێ .

گەواتە پوختەی ئەم باسە ئەوەیە کە: ئـەم ئافرەتانـە ئەگـەر ، خوێنەکـەیان وەستا پێش چل ڕۆژ ئەوە نوێژ دەکات و بەڕۆژو دەبێت و حەلاڵە بۆ مێردەکـەی ، وە ئەگەر خوێنەکەی دووبارە هاتەوە لەو ڕۆژەدا ئـــەوە خـــوێنی نیفاســـەو دوور دەکەوێتەوە لەنوێژو ڕۆژووگـردن وچـونە لای مێردەکەی، وە ئەگەر خوێن هاتنەکە لـە چـل ڕۆژ تێپـەڕی کـرد ئـەوە خـوێنی نیفاس نییە بەڵکو خوێنی (استحاضة)یە

٨- ئەو ئافرەتەی کە پاك دەبێتـەوە پێش بەیانی و خۆی ناشوات :

یان: (پاك بوونەوەی ئافرەت پێش بەیانی و خۆنە شوشتنی ):

هەندێك ئافرەت كاتێك كە پاك دەبنەوە لە عادەتی خۆیاندا كەمێك پێش بەیانی و بۆی نەكراوە خۆشی بشوات لەبەر كەمی كات ، ئەوە خۆی قەدەغە دەكات لە ڕۆژوو گرتن بەبەڵگەی ئەوەی كە بەیانی داهات و هێشتا خۆی نەشوشتوە .

٩- بەڕۆژو بوونی ئەو ئافرەتەی كە خوێن هاتنی بەردەوامە دوای ئەو ڕۆژانەی كە عادەتی خۆیەتی :

هەندێك ئافرەت ئەگەر هاتوو خوێنەكەشیان بەردەوام بوو دوای ئەو ڕۆژانەی كە عادەتی خۆیانە " ئەوا دەچن خۆیان دەشۆن و هەڵسوكەوت دەكەن وەك ئەو ئافرەتانەی كە پاك بوونەوە. ئەوەش دروست نی‌یە ، چونكە كە خوێن هاتن بەردەوام بوو لە ئافرەتەكە " ئەوە دەبێت دووربكەوێتەوە لە ڕۆژوو نوێژ .

شێخ (ابن عثیمین) دەفەرموێ : (ئەگەر هاتوو عادەتی ئافرەتەكە شەش ڕۆژو یان حەوت ڕۆژو بوو ، لەپاشان ئەو ماوەیە درێژ بوەوەو گەیشتە هەشت یان نۆیان دەیان یازدە ڕۆژو ، ئەوە ئەو ئافرەت نوێژ ناكات هەتا پاك دەبێتەوە ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونكە پێغەمبەر ﷺ هیچ سنورێكی دیاری نەكردووە بۆ خوێنی حەیز...).

**شەشەم/لەبیدعەكانی نوێژی تەراویح و زیكرو پارانەوە:**

١. نقر صلاة التراویح . كردنی نوێژەكان بەپەلە وەك چۆن باڵندە دەنوكی دەدات بە زەوی دا بۆ خواردن ، وە پەلەكردن لە خوێندنی قورئان لە نوێژەكەدا

وە هەروەها یەكێ لەسەر پێچی‌یەكان بریتی‌یە لەكەم و كوری كردن لە بەجێگەیاندن نوێژی تەراویح ، نوێژەكە تەنها لە ڕواڵەتدا نوێژە ئەگینا زۆر لە ڕوكنەكانی نوێژ وازلێ دێنن وەك وازهێنانیان لە روكنی ئارام گرتن لە ركوع و سوجدەبردن و خێرا خوێندنی قورئان و تێكەڵ كردنی پیتەكان بەیەكتری . ئەوە گەورەترین فێڵە كە شەیتان لە باوەڕدارانی دەكات . وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :(أسوأ الناس سرقة الذي يسرق من صلاته. قالوا يارسول الله كيف يسرق من صلاته ؟ قال : لايتم ركوعها ولا سجودها).

پێشەوا"مالك"فەرموودەیەكمان بۆ ئەگێڕێتەوە بەسەنەدێكی صحیح كەئەفەرموێت "-

وقد كان القارىء يقرأ بالمئين حتى كُنَّا نعتمد على العصى مِنْ طول القيام، وما كنا ننصرف إلاَّ في فروع الفجر".

واتە:قورئان خوێنەکان نزیکەی دووسەد ئایەتیان ئەخوێند لەکاتی بەرنوێژی کردنیاندا بەشێوەیەك خۆمان ئەدا بەسەر گاڵۆکەکانماندا لەبەر درێژی وەستانمان، بلاوەشمان لێ‌نەدەکرد تاکاتی سەرەتاکانی فەجر.

بەلاَم بەداخەوە لەم سەردەمەی خۆماندا ولەمزگەوتێك لەمزگەوتەکانی کوردستاندا کەسێك بۆی گێڕامەوە کە پێش نوێژو وتارخوێنەکەیان سورەتی "الإخلاص"کە چوار ئایەتە لەچوار ڕکاتی نوێژی تەراویحدا ئەخوێنێ.

ڕەنگە هەندێك بڵێن: کەموسڵمانان توانای یەکەمیان نیەیە، ئەمە ڕاستە بەلاَم ڕاستی ئەو قسەیە مانای کردنی دووەمیش ناگەیەنێ بەڵکو دەبێت پێش نوێژەکان ڕەچاوی باروڕۆخی نوێژکەرەکان بکەن وبەشێوەیەکی مام ناوەندی نەزۆر کورت ونەزۆر درێژ نوێژەکانیان بۆبکەن.

٢- لە دەست دانی نوێژی عیشاو نوێژی تەراویح :

لەڕەمەزاناندا تێبینی دەکرێت هەندێك کەس نوێژی عیشا ناکەن بە جەماعەت چونکە دەیانەوێت بگەن بەنوێژ کردن لە دوای ئیمامێك کە کردوویانە بە عادەتی خۆیان نوێژی تەراویح دەکەن لە دوای ئەو ئیمامە . ئەوەش تاوانەو دروست نیەیە ، چونکە کەمتەرخەمی کردنە لە کردنی نوێژە فەرزەکانە بەجەماعەت . وە ئینسان سەری سوڕدەمێنێ کە دەبیستێ و دەبینێ ئەو نوێژەکاران کۆمەڵ کۆمەڵ دێن بۆ مزگەوتێکی دیاری کراو، هەرکە کۆمەڵێك نوێژان کرد بە جەماعەت کۆمەڵێکی تر دێن جەماعەتێکی تر دروست دەکەن ، ئابەم شێوەیە بەردەوام دەبن هەتاوەکو ئیمامی ئەسلی (ڕەسمی)لە دوویان سێ نوێژی تەراویح سەلام دەداتەوە .

٣- بەردەوام بوون لەسەر قنوت کردن لە نوێژی تەراویح دا :

وە یەکێك لە سەرپێچی‌یەکان بریتی‌یە لەبەردەوام قنوت کردن لە هەر ویترێك لە ڕەمەزاندا وەلە دوای رکوع دا ، وەبەهەڵە دانانی ئەوکەسەی کە جارێك قنوت نەکات ، یان پێش رکوع قنوت بکات ، چونکە قنوت کردن هەندێك جار دوای رکوعەو هەندێك جاریش پێش رکوعە. ئەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە .

٤- زێدەڕەوی کردن لە گریاندا لە نوێژی تەراویح دا .

گریان لەکاتی قورئان خوێندن دا بەڵگەیە لەسەر ئیمانی نوێژکارو

کاریگەری قورئان بەسەرییەوە، ئەوەش گومانی تێدانییە شتێکی باشە ، بەڵام گریان بەدەنگی بەرزەوە بەشێوەیەك كە ببێتە هۆی مەشغولّ کردنی کۆمەڵێك لە نوێژکاران و هەروەها جووڵە جووڵ کردن لەگەڵ گریاندا . بەڵکو وە هەندێکیان بە زۆری لە قنوت کردندا دەگریەن ، بەڵام باشتر وایە گریانەکە لەکاتی بیستنی قورئان دابێ .

٥- درێژکردنەوەی دوعاو پاڕانەوە لەکاتی قنوت کردندا :

درێژکردنەوەی دوعاو پاڕانەوەولە قنوتدا دەبێتە هۆی دروست بوونی ناڕەحەتی وقورسیو بێزاری بۆ نوێژکاران ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووەکە چاودێری حاڵی نوێژکاران بکرێت :

(إذا صلى أحدكم للناس فليخفف فإن فيهم الضعيف والسقيم والكبير وإذا صلى أحدكم لنفسه فليطول ماشاء)[٢١].

٦- چاو بەرزکردنەوەو سەیر کردن لەکاتی دوعای قنوت دا :

وە هەروەها ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە قنوتەوە ئەوەیە کە هەندێك نوێژکاران کاتێك دەستیان بەرز دەکەنەوە بۆ پاڕانەوە ، چاویشیان بەرزدەکەنەوە. چونکە چاو بەرزکردنەوە لە نوێژدا قەدەغەکراوە لە هەموو حاڵە تەکانیدا " لەکاتی دوعاکردندا بێ یان نا .

٧- وتنی (ئامین) لە قنوتدا لە دوای ئەو ووشانەی کە ئیمام دەیڵێت کە ستایشی خوای تێدایە .

وە یەکێکی تر لە هەڵەکان لە قنوت کردندا ، جیاوازی نەکردنە لە نێوان ڕستە (جملة)ی دوعاو ڕستە (جملة)ی ستایشی کردنی خوا . چونکە هەندێك لە نوێژکاران لەکاتی قنوت کردندا دەڵێن (ئامین) لەسەرەتاوە تاکۆتایی کەواتە پێویستە بیر لە قسەکانی ئیمام بکەینەوە ، ئەگەرووتەکانی دوعابوون " ئەوکاتە دەڵێین (ئامین).

٨-دەست هێنان بەدەم و چاودا لە دوای پاڕانەوە شێخ(ابن تیمیە)ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: (وأما رفع النبي ﷺ يديه في الدعاء فقد جاء فيه أحاديث كثيرة صحيحة. وأما مسح وجهه بيديه فليس عنه فيه إلا حديث أو حديثان لا يقوم بهما حجة، والله أعلم).

٩- بەرزکردنەوەی دەنگ لەکاتی پاڕانەوەدا ، لەکاتی قنوت دا ، بۆ نمونە: پێش نوێژ کار دەنگی بەرز دەکاتەوە لەناکاو لە هەندێك دوعای دیاری کراودا ، بەڵام سوننەت وایە دەنگ بەرز نەکرێتەوە . خوای گەورە دەفەرموێ :

(٢١) رواه البخاي(٧٠٣)، ومسلم(٤٦٧).

(ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ)[٢٢].

(قـرطبي) لـە تەفسـیری ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ : (الاعتداء في الدعاء في الدعاء على الوجوه منها الجهور الكثير والصياح).

١٠- پێش نوێـژ خـوێن خـۆی تایبـەت بکات بەپاڕانەوە لە قنوت دا ، واتە تەنها بـۆ خـۆی بپاڕێتـەوە یـان ڕانـاوی کەسـی یەکەمی تاك(ضمير المتكلم) بەکار بهێنێ پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ : (....ولا يؤم قوما فيخص نفسه بدعوة دونهم...)[٢٣].

١١- وتنی هەندێ زیکری تایبـەت یـان هەندێ وتە لەنێوان هەموو دوو ڕکاتێکدا.

بۆ نموونە وتنی :

"سبحان الله"و"الحمد لله"و"الله اكبر" و"لا اله الا الله" وصەلاوات دان یـان هـەر زیکرێکـی تـر" چـونکە هـیچ جۆرێـك لەوزیکرانـە تایبـەت نـەکراوە بەوکاتـەوە واتـــە"نێـــوان هـــەموو دوو ڕکاتێـــك لەنوێـژەکانی تـەراویح"بەهـەر شـێوەیەك بێت بەتاك بێت یـان بەکۆمـەڵ بـەدەنگی بەرز بێت یان بەبێ‌دەنگی.

١٢- زیکر کردنی بەکۆمـەڵ لەهەنـدێك مزگەوتدا بەدەنگی بـەرز بەتەسـبیح یـان بـەبێ تەسـبیح بەشـێوەیەك کەلەهەنـدێ مزگەوتـــدا لەئـــەنجامی زۆرکـــردن وزۆرمانـەوە لـەو زیکرانـەدا هەنـدێك لـەو کەسـانەی کـە بەشـداری تێـدا ئەکـەن تفەکـەیان ئەبێتـە خـوێن لەئەنجامـدانی دەنگ هەڵبڕین وسەرباداندا.

١٣- بیدعەی زکرکردن لە دوای سەلام دانەوە لە نوێژی تەراویح :

وە هەروەها ئەوەی کە داهێنراوە لەم مانگـە پـیرۆزە . زیکـر کردنـە لـە دوای هـەموو دوو سـەلام دانەوەکـەی نوێـژی تـەڕاویح و نوێـژکاران دەنگـی خۆیـان بەرزدەکەنـەوە بـە دەنگێـك کـە لـە یـەك ئاسـتدا بێـت، ئەمەشـی هـەر هـەمووی بیدعەیە .

هـەروەها ئەمـەش بـە بیدعـە دادەنـرێ کاتێـك کـە خەڵکەکـە لـە زیکرکـردن دان بانگدەرەکـە بـە دەنگێکـی زۆر بـەرز دەڵێـت: دە هـەزار سـەڵاوەت لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ یـان (الصلاة يـرحمكم الله) واتـە (نوێـژ بکـەن ڕەحمـەتی خواتـان لێبێ). وە بۆ هەستان بـۆ دوو ڕەکعـەتی دووەم دەڵێـت بیسـت هـەزار سـەڵاوەت لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ، وەبـەم شـێوەیە بـۆی هەڵدەکشـێت !. ئەمـەش شـتێکە داهێنـراوەو بیدعەیـە" چـونکە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ ریوایـەت نـەکراوە کـە کردبێتـی یـان بڕیـاری لەسـەر دابـێ،وە

(٢٢) (سورة لأعراف:٥٥).

(٢٣) رواه الإمام أحمد وأبوداود والترمذي(٣٥٧).

هەروەها نە هاوەڵان و نە تابیعی و نە پێشینە چاکەکانیش کردویانە . کەواتە داهێنان لە دین قەدەغەیە ، وە باشترین هیدایەتیش هیدایەت و ڕێگەی محمدە ﷺ . لە پاشان خەلیفەکان لە دوای خۆی، لەپاشان هاوەڵانی (**خوا لە هەموویان ڕازی بێ**)، کە ئەمانە هیچ شتێك لەم بیدعانەیان نەکردوو . دەبا ئێمەش لەسەر ڕێگەی ئەوان بین" چونکە هەموو خێرو بەختەوەرییەك لە شوێن کەوتنی ئەوان دایە و هەموو خراپەو زیانێکیش لە داهێنان لە دین دایە.

١٤- بیدعەی "مرحبا-مرحبا" لەپانزە ڕۆژی یەکەمدا

و"الوداع-الوداع"لەنیوەی کۆتایی ڕەمەزاندا

ئەمەش یەکێکی ترە لەداهێنراوەکان و ووشەکانیش بەگوێرەی جیاوازی لەهجەو ناوچەکان ئەگۆرێت.

**حەوتەم**

**لەبیدعەکانی زەکاتی سەرفترە:**

١- خەملاندنی ئەم زەکاتە بەپارە:

زانایان "شێخ عبد الله بن عبد العزيز بن باز وشێخ محمد بن صالح العثيمين وشێخ صالح بن فوزان وشێخ عبد الرحمن بن جبرين"هەموو هاودەنگن لەسەر ئەوەی کەنابێ زەکاتی سەرفترە بەپارە بدرێت ، بەڵکو ئەبێ بەخواردن بدرێ هەروەکو لەفەرمودە صەحیحەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە( ).

٢- زەکات دان بەمنداڵەکانت: زۆر لە خەڵکی لەمانگی ڕەمەزاندا زەکات دەدەت بە منداڵەکانیان، ئەوەش دروست نییە چونکە نەفەقەو دابین کردنی بژێوی منداڵان واجبە لەسەر خاوەنەکەیان .

٣- بەردەوام زەکات دان بەکەسێکی دیاری کراو.

وەیەکێکی تر لەسەر پێچییەکان ئەوەیە کە هەندێك کەس زەکاتەکەی دەدات بە کەسێك یان خێزانێکی دیاری کراو لەخەڵکی ، ئەوکارە دەکات بە عادەتی خۆی هەرکاتێك زەکاتی دا لەماڵەکەی ، بەڵکو بەوەش ناوەستێ دەبینین ئەوکەسە زەکات دەرە فەرمان بەخزمەکانیشی دەکات کە زەکات بەو خێزانە یان ئەو کەسە دیاری کراوە بدەن، ئەوەش دروست نییە چونکە لەوانەیە ئەو کەسەی کەبەردەوام زەکاتی پێ دەدرێت دەوڵەمەند بووبێت پێویستی بەزەکات نەبێت، لەبەر ئەوە ئەبێ بدرێت بەکەسێك شایەنی زەکات پێدان بێت.

٤- بەدوادا نەگەڕان و نەپشکنین بۆ زەکات دان .

( )"فتاوى رمضان "ج٢ ص(٩١٨_٩٢٨).

سەرپێچـی‌یەکی تـر دەبیـنین کـە هەندێك خەڵك ناگـەڕێن بـە دوای کەسێك کـە شایسـتەی زەکـات پێـدان بێـت " هەرکەسـێکی فـەقیری بینـی یەکسـەر بەپەلـە زەکاتەکـەی دەداتـێ بـۆ ئـەوەی تاوانبار نـەبێت ، بـەبێ ئـەوەی بـیر لـەو کەسەبکاتەوە کە زەکاتی دەداتێ ئەگـەر چی فەقیریش بێت . چونکە نابێ زەکـات بدرێت بەکەسێك کە عیبادەتی خوای پێ نەکات و لەسەر پێچی‌کردنی خوا بەکاری بهێنێت ، یان نوێژنەکات

**هەشتەم/ هەندێك بیدعە لەشەوی خەتم کردنی قورئان**

وە ئـەوەی داهێنـراوە لـەم شـەوە گەورەیـەدا: لـە بەرزکردنـەوەی دەنگـە پاڕانەوە لە دوای خەتم کردنـی قورئـان ، ئەم پاڕانەوەش بە کۆمەڵ دەکەن ، یـان هەرکەسەو بۆ خۆی دەپاڕێتـەوە ، بـەڵام بـەدەنگێکی بـەرز" بەمـەش پێچـەوانەی ئـەم ئایەتەیـە ڕەفتـار دەکـەن کـە دەفەرموێ:

[ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ][٢٥] .

واتە:( بپاڕێنەوە لە پەروەردگارتان بە گەردن کەچی‌و بە نهێنی).

وە پاڕانەوە بە نهێنـی باشـترە لەبـەر نیەت پاکی ، چونکە پاڕانەوە بـە نهێنـی دوورت دەخاتەوە لە ڕیابازی ، وە کاتـێ کـە هـاوەڵان دەنگیـان بـەرزکردەوە لـە کاتی پاڕانەوە دا پێغەمبـەر ﷺ پـێی فەرمون : (يا أيها النـاس اربعـوا علـى أنفسكم فإنكم لا تدعون أصم ولا غائبـا، إنه معكم ، إنه سميع قريب )[٢٦] .

واتە : (ئـەی خەڵکینـە دابمرکێنـەوەو هێدی ببنـەوەو ڕوحـم بـەخۆتان بکـەن" چـونکە ئێـوە هـاوار ناکەنـە کـەڕێك یـا کەسـێکی ون ، بـەڵکو ئـەوەی ئێـوە هاواری دەکەنێ لە گەڵتاندایـە بـەزانیاری خۆی ، وە ئەو بیسەرەو نزیکە ).

**نۆیەم / بیدعەی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی یادی غەزای بەدر:**

وە هەروەها ئەوەی کە داهێنراوە لەم مانگە پیرۆزەدا بریتی‌یە لە یاد کردنەوەی غـەزای بـەدر ، ئەمـەش لەشـەوی حەڤدەهەمی ئەم مانگەدا دەکرێت . لـەم کاتەدا خەڵك کۆدەبنەوە لە مزگـەوت کـە زۆربـەیان خـەڵکی (عـەوام)ن ، وە هـی واشیان تێدایە ئیدديعای زانست دەکات . وە ئاهەنگەکەیان بە خوێندنەوەی چـەند ئایەتێك دەسـت پـێ دەکـات، لـە پاشـان

---

[٢٥] (سورة الأعراف:٥٥).

[٢٦] البخاري (٢٢٩٢).

باسی چیرۆك و بەسەر هاتی شەڕی بەدر دەكرێت . وەباسی پاڵەوانیەتی هاوەڵان — خوا لێیان ڕازی بێت — دەكەن و زیادەڕەوی دەكەن لەم باس كردنەش ، وە هەروەها چەند هۆنراوەیەك ڕێك دەخەن بەم بۆنەیەوە .﴿ **وە وتار بێژی واش هەیە بە وتارە ئاگرینەكانی (الخطب الناريّة)، تیایدا هانی گەنجانی هەرزەكارو دڵگەرم دەدات بۆ كاری حەماسی وتوندو تیژی وناحەكیمانە ! . وەوادەزانن خوا پێویستی كردووە لە هەمان ڕۆژدا هەموو ساڵێك موسوڵمانان غەزابكەن !** ﴾.

وە لە هەندێ ولاتی موسوڵماناندا دەوڵەت بە شێوەیەكی ڕەسمی بەم بۆنەیەوە ئاهەنگ دەگێڕێت و یەكێك لە بەرپرسانی دەوڵەتیش ئامادە دەبێت .

وە هیچ شارەوا نییە كە ئەم جۆرە ئاهەنگانە چەندین شتی خراپی لێ دەكەوێتەوە، وەك كۆبونەوە لە مزگەوتەكاندا بەمەبەستی غەیری خوا پەرستیو یادكردنی ، وە هەروەها ئەم كۆبوونەوانە دەبنە هۆی دروست بوونی دەنگە دەنگ و ژاوە ژاو، كە پێویستە ماڵەكانی خوای گەورەی لێ بپارێزرێ . وە هەروەها هەندێك كەسی بێ دین و دوور لەخوا دێنە ناو مزگەوت . وە هەروەها وێنەگران دێنە ناو مزگەوت بۆ وێنە گرتن ، سەرەڕای ئەمەش ، ئەم كارە هەموو ساڵێك لەو ڕۆژەدا ، یان لەو شەوەدا دووبارە دەبێتەوە .

كەواتە تایبەت كردنی ئەم شەوە — شەوی حەڤدەهەمی مانگی ڕەمەزان — بە كۆبونەوەو یادكردنی خواو خوێندنەوەی هۆنراوەو، كردنی بە بۆنە(مناسبە)یەكی شەرعی، هیچ ئەسڵێكی نییە، نە لە قورئان و نە لەسوننەتدا ، وە لە هاوەڵەكان — خوا لێیان ڕازی بێ — و تابیعی و پێشینە چاكەكان وەرنەگیراوە.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیە) — ڕەحمەتی خوای لێبێ — دەفەرمێ : (پێغەمبەر ﷺ چەند وتار و پەیمان و ڕووداوی هەیە لە چەند ڕۆژێكی دیاری كراودا كە تێیاندا باسی بنچینەكانی دین دەكات .: وەك لە ڕۆژی بەدرو ، حونەین و ، خەندەق ، ............و ئازاد كردنی مەككەو، كاتی كۆچ كردنی و چوونی بۆ ناو شاری مەدینە .

لە پاشان پێویست ناكات ئەم ڕۆژانە بكرێن بە جەژن ، بەڵكو ئەمە گاورەكان دەیكەن ، ئەوانەی كە ڕووداوی ڕۆژگارەكانی (عیسی علیه السلام) یان كردووەتە چەند جەژن و ئاهەنگێك، وە بەهەمان شێوەش جوولەكەكان ئەمە كاریانە . بەڵكو جەژن شتێكە دەبێت

شەرع دای بنێ ، وە ئەوەی کە شەرع دایبنێ و بڕیاری لەسەر بدا ، ئەوا شوێنی دەکەوین ، ئەگەر نا هیچ شتێك نابێ لە دیندا دابهێنرێ کە تێیدا نەبێ [٢٧].

کەواتە : خۆ خەریك کردن بەم شتانەو هاوشێوەی ئەمانە هەر هەمووی شتی داهێنراوە کە بونەتە هۆی دوورخستنەوەی خەڵکی لەوەی کە خواو پێغەمبەر ﷺ بۆیان داناوین وەك : زیندووکردنەوەی شەوەکانی ڕەمەزان بە نوێژوو زیکر.

وە گەورەترین بەڵاو مەترسی لەسەر موسوڵمانان بریتی‌یە لە وازهێنان لە شتە شەرعی‌یەکان و کردنی شتە ناشەرعی‌یەکان و داهێنراوەکان.

والحمد لله

## ﴿من أقوال السلف﴾

١. ( **أسرَع النَاس رِّدَةً أهــل الأهــواء** ) /. واتە : خێراترین خەڵکان کە پاش گەزدەبنەوە لە ئیسلام کەسانی شوێنکەوتەی دەستەو تاقمە ئارەزووبازەکان . الحسن البصري (رحمه الله)

٢.( **إجتنِبْ مَنْ يُعادي أهلَ الكتابِ والسنة لِـئلا يُعـديكَ خُسرانه** ) / الامام ابن القيم الجوزية . واتە : دووربکەوە لەوە کەسەی دژایەتی شوێن کەوتوانی قورئان و سونەت دەکات بۆ ئەوەی درم و نەخۆشی‌یەکەی نەت گرێتەوە .

٣.( **عليك بأثار من السلف وإنْ رَفَضَكَ النَـاس ، وإيّـاكَ وآرآء الرِّجال وإنْ زَخرفوه لك بالقول ، فإنَّ الأمرَ يَنجَلِيْ وأنتَ على طريق مسـتقيم** ) / الامام الاوزاعي (رحمه الله) . واتە : ڕێگە و ئاسەواری پێشین بگرە گەر خەڵکیش تۆیان نەویست ، وەدوورکەوە لە ڕاو بۆچوونی پیاوان گەر بە ووتەی جوانیش بۆیان ڕازانیتەوە ، چونکە گەر وابکەیت تەمەکانت لێ دەڕەوێتەوە و بە ئاینی خۆت ئاشنان دەبیت و لەسەر ڕێگەی ڕاست دەبیت .

[٢٧] اقتضاء الصراط المستقيم (٢/٦١٤، ٦١٥).

# ریوایەتە لاوازو هەڵبەستراوەکان لەسەر ڕۆژوو و ڕەمەزان

پێویستە لەسەر موسوڵمان کە تەئکید لەسەر ڕیوایەتی فەرمووده بکات و سور بێت لەسەر فەرمووده ڕاستەکان، وە دوور بکەوێتەوە لەفەرموودەی لاواز و دانراو و درۆ . وە زانایانی فەرمووده بەباشترین شێوە هەوڵیان داوە بۆ جیاکردنەوەی فەرموودەی ڕاست لەلاواز.

وە لەبارەی مانگی ڕەمەزانەوە چەند فەرموودەیەکی لاواز بڵاوبوونەتەوە لەنێو بانگەوازی کاران و وتار بێژان و خەڵکدا ، لەبەر ئەوە پێویستە ئاگاداری ئەم فەرموودانە ببین لەوانە :

١ـ فەرموودەی (( صوموا تصحوا )) واتە: بەڕۆژو ببن لەش ساغ دەبن. فەرموودەیەکی لاوازە هەرچەندە ماناکەشی ڕاست بێت !. زانای فەرمودەناس( العراقی ) لە (تخریج الإحیاء) (٣ / ٧٥) دا دەفەرمووێت:

(طبرانی) ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە لەکتێبی ( الأوسط )دا . ( أبو نعیم )لەکتێبی ( الطب النبوي )دا، لە(أبو هریرة )وە، بەسەنەدێکی لاواز ڕیوایەتی کردووە .

٢ ـ لە سەلمانی فارسییەوە ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی : پێغەمبەر (ﷺ) لەڕۆژی کۆتایی لەمانگی شەعبان وتاری بۆ داین و فەرمووی : (( ئەی خەڵکینە وا مانگێکی گەورە باڵی بەسەرتاندا کێشا ، مانگێکە شەوێکی تێدایە خێترە لەهەزار مانگ ، خوای گەورە ڕۆژوەکەی کردۆتە پێویست ( فەرز ) و نوێژ کردن لەشەوەکەیدا کردۆتە سوننەت . هەر **کەسێك خێرێك بکات لەو مانگە ئەوە وەکو فەرزێکی کردبێت جگە لەو مانگەدا وەهەر کەسێك فەرزێك بەجێ بگەیەنێت ئەوە وەکو ئەوە وایە حەفتا فەرزی بەجێ گەیاندبێت لەمانگەکانی تردا .** ئەم مانگە مانگی ئارام گرتنە وە ئارام گرتنیش پاداشتەکەی بەهەشتە . وە مانگی ئاشت بوونەوەیە مانگێکە کە ڕزقی باوەڕداری تێدا زیاد دەبێت ، وە هەر کەسێك خواردن بدات بە مرۆڤی بەڕۆژوو ڕۆژووەکەی لا بشکێنێت ئەوا خوای گەورە لەتاوانەکانی خۆش دەبێت. وە ئازاد دەکرێت لە ئاگر، وە هەروەها پاداشتی ئەو کەسەی هەیە کە بەڕۆژوو بووە بەبێ ئەوەی کە

لەپاداشتەکەی کەم بێتەوە ، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا هەموومان ئەو خواردنەمان دەست ناکەوێت کە بیدات بەو کەسەی کە بەڕۆژووە ؟.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ئەو پاداشتە دەدرێتە هەر کەسێك کە ئەگەر شیر یان خورما یان قومێك ئاو بدات بە ڕۆژووەوان ٠ وە هەر کەسێك ڕۆژووەوانێك تێر بکات خوای گەورە لەحەوزی کەوسەر ئاوی دەداتێ کە تینوی نابێ هەتا دەچێتە بەهەشت ، وە **ئەم مانگە مانگێکە سەرەتاکەی ڕەحمەتە و ناوەڕاستەکەی لێ بووردنە و کۆتایەکەشی ڕزگار بوونە لە ئاگر** ، لەبەر ئەوە چوار شت زۆر بکە لەو ڕۆژەدا " دوو شت لەوانە خوای پێ ڕازی دەکەن وە دوو شتەکەی تریش لێی بێ پێویست نابن ٠ وە ئەو دوو شتەی کە خوای پێ ڕازی دەکەن بریتییە لە شایەتی دان بە ( لا اله الا الله ) و داوای لێبوردن کردن لە خوا ٠ بەڵام دوو شتەکەی تریش کە لێی بێ پێویست نابن بریتییە لەداوا کردنی بەهەشت و پەنا گرتن بەخوا لە ئاگر)) .

ئەم فەرموودەیە( منكر)ە چونکە لەسەنەدەکەیدا (على بن زيد بن جدعان) هەیە ٠ وە فەرموودەیەکی لاوازە هەروەکو ئیمامی أحمد ئاماژەی بۆ کردووە ٠ وە ئیمام ابن خزيمە دەڵێت : ( لا احتج به لسوء حفظه ) ٠

٣. ئەگەر مانگی رەجەب دەهات پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو : (( اللهم بارك لنا في رجب وشعبان وبلغنا رمضان )).

ضعيف : رواه البزار فى سنده والطبراني في الاوسط والبيهقي في فضائل الأوقات عن أنس وضعفه ابن حجر في تبيين العجب(٣٠-٣٢ ) ٠

٤. (( هەر کەسێك ڕۆژویەك بشکێنێ لە ڕەمەزاندا بەبێ عوزر و نەخۆشی ، ئەگەر ساڵەکە هەمووی بەڕۆژو بێت جێگەی ئەم ڕۆژوەکە ناگرێتە وە )) ٠

رواه الترمذی و أبو داود وهو ضعيف وذكر ابن حجر في فتح الباري ( ٤ / ١٦١ ) أن هذا الحديث فيه ثلاث علل.

٥. (( ئەگەر بەندەکان بیان زانیایە چی لەڕەمەزاندا هەیە ئەوە نەتەوەکەم ئاواتی دەخواست کە ساڵەکە هەمووی ڕەمەزان بووایە ، پیاوێك لەتیرەی خزاعە ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا بۆمان باسی بکە ، پێغەمبەریش فەرمووی : بەهەشت لەسەرەتای ساڵەوە تا کۆتایی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ ڕەمەزان ، وە ئەگەر یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان هات بایەك هەڵدەکات لەژێر حەرشەوە وە گەڵای بەهەشت دەوەرێنێت و حۆرییەکان سەیری ئەمە

دەکەن و دەڵێن: ئەی خوایە هەندێك لەبەندەکانت لەو مانگەدا بکە بە مێردی ئێمە بۆئەوەی دڵمان پێیان ئارام بگرێ و ئەوانیش دڵ ئارام بن بە ئێمە ٠ لەبەر ئەوە هەر کەسێك ڕۆژێك لەو مانگە بەڕۆژوو بێت ئەوا خوای گەورە ئافرەتێکی لە( حور العين ) دەداتێ ـ کە لەناو خێوەت دان ـ کە خوا ڕازاندونیەوە:

(حور مقصورات في الخيام) سورة الرحمن / ٧٢

هەر ئافرەتێك حەفتا خشڵی پێوەیە کە هیچیان ڕەنگیان لەوی تر ناچێت ٠ وە حەفتا بۆنیان پێ دراوە کە بۆنی هیچیان لەیەکتر ناچێت ٠

٦. (( خەوتنی ڕۆژەوان خوا پەرستیە و بێ دەنگیەکەی تەسبیحاتە وە کردەوەکەی دوو قاتە و پاڕانەوەکەی گیرایە و تاوانەکەی بوردراوە )).

رواه ابن منده والبيهقي وضعفه العراقي في إحياء علوم الدين ( وانظر ضعيف الجامع / ٥٩٧٢ / ص ٨٦ .

هەروەها لەبارەی شەوی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژەکەیەوە چەند حەدیسێکی دانراو بەدەم پێغەمبەرەوە هاتوون، لەوانە:

١. حەدیسی : (هەرکەسێ لە شەوی جەژنی ڕەمەزاندا سەد ڕەکعەت نوێژ بکات وە لە هەر ڕەکعەتێك سورەتی (الحمد لله) جارێك و (قل هو الله احد)یش جارێك بخوێنێت.......هەتا کۆتایی)[1].

٢. وە حەدیسی : (هەرکەسێك لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا دوای نوێژی جەژن چوار ڕەکعەت بکات ، وە لەسەرەتای ڕەکعەت دا سورەتی فاتحە بخوێنێ ...ئەوە وەکو ئەوە وایە کە هەموو ئەو کتێبانەی خوێندبێتەوە کە خوای گەورە بۆ سەر پێغەمبەرەکانیدای بەزاندوون)[2].

٣. وە حەدیسی : (سوننەتە دوازدە ڕەکعەت نوێژ کردن لە دوای جەژنی ڕەمەزان وە شەش ڕەکعەتیش لە دوای جەژنی قوربان)[3].

٤. وە حەدیسی: ((هەرکەسێك ئەم چوار شەوە زیندوو بکاتەوە بە خوا پەرستی ئەوە بەهەشتی بەدەست هێناوەو مسۆگەری کردووە:

ليلة التروية ، وە شەوی عەرەفە، ليلة عرفة و شەوی جەژنی قوربان (ليلة النحر) و شەوی جەژنی ڕەمەزان (ليلة الفطر )) (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة) رقم (١٥٠) هەڵبەستراوە.

---

(١) ((ابن الجوزي))لە (الموضوعات) (٢/١٣٠/١٣١)) وەئیمامی (الشوكاني) لە کتێبی (الفوائد المجموعة)صـ٥٢ ، حـديث رقـم (١٤٩) فەرموودەیەکی دانراوە (الموضوع).

(٢)سەیری ((الموضوعات)) (٢/١/١٣١/١٣٢) لابن الجوزي ، والفوائد المجموعة حديث رقم (١٥٠).للشوكاني بکە.

(٣) ((الفوائد المجموعة )) للشوكاني ، حديث رقم (١٥١)بکە.

# مانگی ڕەمەزان و دەزگاكانی ڕاگەیاندن

م. أحمد میزارۆستەمی

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(( ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەرگاكانی ئاسمان و ڕەحمەت و بەهەشت دەكرێنەوە )) و هی دۆزەخیش دادەخرێن و شەیتانەكانیش زنجیر پێچ دەكرێن )) أخرجە البخاري ومسلم .

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان كە چاودێری ئەم مانگە پیرۆزە بكەن ، وە هەر شتێكیش كە زیان بە ڕۆژووەكەی بگەیەنێت .

كەواتە پێویستە لەسەر دەزگاكانی ڕاگەیاندن كە لە خوا بترسن بە چاودێری وڕێزگرتنیان لەبەندە بەڕۆژووەكانی خوا.

وە كاتێك موسوڵمانان پێشوازی دەكەن لەو مانگە بە قورئان خوێندن وزیكر وپەرستن و نوێژ كردن دەبینین دەزگاكانی ڕاگەیاندن بە تایبەتیش كەناڵە ئاسمانیەكان پێشوازی لەو مانگە دەكەن بە زنجیرە فلیمی خراپ كە ڕۆژووی موسوڵمانان بەتاڵ دەكەنەوە لەبەر زۆری ڕەقس و گۆرانی و فلیمی بێ شەرعی كە ئەمانە پێچەوانەی خووڕەوشتی ئیسلامن، وە گومانیشی تێداغ نیە كە ڕەقس و گۆرانی و خۆ ڕووت كردنەوەی ئافرەت حەرامە ، بەڵام لەوەش مەترسی زیاتر بریتیە لە گاڵتە كردن بە دینی خوای گەورە و بریندار كردنی هەستی موسوڵمانان بەهۆی ئەم فلیم و شانۆ بێ شەرعیانە وە هەروەها خۆ چواندن بە داب و نەریتی بێ باوەڕان و كاریگەر خستنە سەر نەوەی موسوڵمانان .

وەگومانی تێدا نیە كەئەم زنجیرە فلیمانە دژو پێچەوانەی ئیسلامن، لەبەر ئەوە داوا لە بەرپرسان دەكەین كە لە خوای گەورە بترسن وزۆر گرنگی بدەن بەبەرنامەی ئایینیو وانەی فیقهی وكۆڕی ئایینی وبەرنامەی پەروەردەیی دوور لە بێ نرخی و گاڵتە كردن .

شێخ ( صالح بن فوزان )دەڵێت:(وا ڕەوایە بۆ موسوڵمانان چ پیاو بێ چ ژن كە ڕێز لە مانگی ڕەمەزان بگرێت ، وە خەریك بێت بە خوا پەرستی و دوور كەوتنەوە لە تاوان و خراپەكاری لە هەموو كاتێكدا بەڵام زیاتر لە مانگی ڕەمەزاندا لەبەر ڕێزی ئەم مانگە ).

وەشەونخونی كردن بەدیار فلیم و زنجیرە شانۆكان كە لە تەلەفزیۆن وسەتەلایتەكانەوە پێشكەش دەكرێن، یان گوێ گرتن لە شتی مسیقاوگۆرانی ئەمانە هەموویان حەرامن و سەرپێچی كردنە لە مانگی ڕەمەزان و جگە لە ڕەمەزانیش، بەڵام لەو مانگەدا تاوانی زیاترە

وە سەرەڕای خۆ خەریك كردن بە و شتە حەرامانە ئەگەر واجباتەكانی لەدەست داو، ڕۆژ خەوت و نوێژەكانی نەكردن ئەمانەش تاوانێكی‌ترن چونكە تاوان تاوان ڕادەكێشێت)

[ تَقَبَّلَ اللّهُ مِنَّا وَمِنْكُم ]

# جەژنی موسوڵمانان لە قورئان و سوننەتدا

پوختەیەك لەكتابی

[أحكام العيدين في السنة المطهرة]علي الحلبي

ئومێد محمد حسين / رانيه.

## ئیسلام

## بەرنامەیەكی هەمەلایەنەیە و هیچ بوارێكی فەرامۆش نەكردووە

ئایینی ئیسلام ئاینێكە خوای پەروەردگار بەدواترینی پێغەمبەرانیدا كردویەتیە دیاری بۆ تەواوی خەڵكی، كێن یا لە هەركوێن، دیاریەكیش لەلایەن خوای بەندەكانەوە بێت شتێكی بەڵگەنەویستە بێ زیاد و كەم و تێرو تەواوە گونجاوە بۆ هەموو كات و سەردەمێك دانراوە بۆ سەرجەم بوارەكانی ژیان بۆ بەڕێوە چوونمان لە بواری بیرو باوەڕدا لە بواری هەڵس و كەوت لەگەڵ یەكتری و لە بواری ئاشتی و شەڕدا لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەمان ﷺ تەواوی شتێكی بۆ ڕوون كردوینەوە جولەكە بەدڕەوشتەكان وەكو سیفەتی هەمیشەیی خۆیان لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ حەسودیان بە موسوڵمانەكان دەبردو دەیان وت: ئەو پێغەمبەرە چ پێغەمبەرێكە گرنگی بە هەموو بوارێك دەدات و هەموو شتێك فێری شوێن كەوتوانی دەكات، هەتا چونە سەرئاویش ، بەڵێ چونە سەرئاویش شێوازو تایبەت مەندی چۆی هەیە چ جای لایەنەكانی تر كە پەیوەستن بەكۆمەڵەوە لەوانەش جەژن .

## ﴿ مانای جەژن ﴾

جەژن (عید): بۆیە پێی دەوترێ (عید) لەبەر ئەوەی هەموو ساڵێك بە خۆشیو شادی تازەوە دەگەڕێتەوەوە ، یاخود لەبەر ئەوەی چاكەو بەخششەكانی خودای گەورەی تێدا

دەگەڕێتەوە بەرامبەر بەندەکانی لەو چاکانەش ڕێدانە بە خواردن و خواردنەوە دوای قەدەغە کردنی وەخێری سەرفترە هەروەها تەواو کردنی حەج بە تەواف و سەردانەوە، وەگۆشتی قوربانی و غەیری ئەوانە، خوای پەروەردگار لە حاجی و ڕۆژوەوانان خۆش دەبێ و بەزەیی و ڕەحمەتی خۆی بەسەر بەندەکانی دا دەڕژێنێ ، نەریتیش وایە لە جەژناندا خۆشی و شادی و ئاسودەیی دەر ببڕدرێت ، لەهەندێ ناوچەی کوردەواریدا بە (جێژن)ناو دەبرێ ، کوردان بەڕۆژی بەتاڵەو خۆشیان گوتووە جەژن.

### ﴿جەژنی ساڵانە تەنها دوون و بەس﴾

ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك چووە مەدینە خەڵکی ئەوێ دوو ڕۆژیان هەبوو (النيروز و المهرجان) یاریان تێدا دەکردوو کەیف سازی خۆیان نیشان دەدا لە جاهیلەتیدا ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی هاتم ئێوە دوو ڕۆژتان هەبوو یاریتان تێدا دەکرد لە جاهیلەتەتدا خوای گەورە بۆی گۆڕیون بە چاکتر لەوانە (يوم النحر والفطر) ڕۆژی قوربان و ڕۆژی ڕەمەزان .

سەرنج: وەکو دیارە تەنها ئەو دوو جەژنەن کەساڵانە خوای گەورە بۆ ئەو ئوممەتەی قەرار داوە بەڵام لەو ڕۆژگارەدا جێی داخە زۆر شتی تر جەژنی بۆ درووست کراوە کە خوای گەورە ڕێی پێ نەداوە و بەلادانی لە قەڵەم داوە لەوانە سەری ساڵی زایینی .

### ﴿خۆ شوشتن بۆ جەژن﴾

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بۆ جەژنەکان خۆی دەشوت و لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەك هاتوون ئەگەرچی هەندێکیان ناکرێن بە بەڵگە ، بەڵام لە عەبدالله ی کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە بەر لە دەرچوونی بۆ نوێژی جەژن خۆی شۆردووە ئەو هاوەڵە بەڕێزەش یەکێك بووە لەوانەی کە زۆر پابەند بووە بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ .

### ﴿ خۆ ڕازاندنەوە بۆ جەژن ﴾

بەیهەقی بە سەنەدێکی سەحیحەوە لە ابن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژانی جەژندا چاکترین و جوانترین پۆشاکی لەبەر دەکرد وە ئیمامی مالك فەرموویەتی : گوێ بیستی ئەهلی عیلم بووم کە بۆنی خۆش و خۆڕازاندنەوەیان لەهەموو جەژنێکدا بەلاوە پەسند بووە ٠

### ﴿چ کاتێك خواردن دەخورێ لەجەژندا﴾

لە جەژنی ڕەمەزاندا پێغەمبەر ﷺ بەر لە دەرچوونی چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد بەلاّم لە جەژنی

قورباندا هیچی نەدەخوارد تا لە(مصلی) نەگەڕابایەوە پاش گەڕانەوەی لە قوربانیەکەی دەخوارد ٠

### ﴿سوننەتە نوێژ لە(مصلی)دا بکرێت﴾

پێغەمبەر ﷺ نوێژەکانی جەژنی لە مزگەوتدا ئەنجام نەدەدا لە جەژندا فەرمانی بە خەڵکی دەکرد و دەیبردنە دەرەوەی ماڵەکانی شاری مەدینە بەرەو ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینە بە کۆمەڵ نوێژی پێ دەکردن لە شوێنێکی تایبەتی کە بە ( مصلی ) ناودەبرا تایبەت کرا بوو بە نوێژی جەژنەکان ، دەگێڕنەوە کە تەنها جارێك نوێژی جەژنی لە مزگەوتدا کردووە٠ ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە باران بووە و بواری نەبووە لە دەرەوە جێ بەجێی بکەن ٠ شایانی باسە : کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بە ئافرەتانیش کە لە (حیض) دان بێنە دەرەوە و گوێ لە وتارەکەی بگرن ، نەك هەر ئافرەتان بەڵکو منالانیشی دەبردە دەرەوە ٠ پێغەمبەر ﷺ بەپێ دەڕۆیشت بەرەو ( مصلی ) وە لە بەردەمی خۆی گۆچانێکی دەچەقاند و دەیکرد بە بەربەست بۆ نوێژەکەی ، وە لەو سەردەمەدا ( مصلی ) دەشت بوو هیچ دیوار و خانوویەکی لێ نەبوو هەندێ جاریش حەربەکەی دەکرد بە بەربەست ٠ (سترە) ٠

### ﴿الله أكبر کردن لە جەژنەکاندا﴾

لە پێغەمبەرەوە ﷺ چەسپاوە کە لە جەژنی ڕەمەزاندا لەگەڵ دەرچوونی لە ماڵەوە بەرەو(مصلی) الله أكبری کردووە تاوەکو نوێژەکەی کردووە دوای نوێژەکە وازی لە الله أكبر کردن هێناوە. بەڵام لە جەژنی قورباندا لەبەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە تا کۆتایی ڕۆژەکانی تشریق (چوارەم ڕۆژی جەژنی قوربان) الله أكبری دەکرد ، جمهوری سەلەف لەسەر ئەو ڕایەن لە هەموو کاتێکدا نەك تەنها لەدوای نوێژەکان ، وەنابێ بە کۆمەڵ الله أكبر بکرێ. وە ئافرەتان لە پاش ئەبانی کوڕی عوسمان و عومەری کوڕی عەبدول عەزیز لە شەوانی جەژنی قوربان لە مەزگەوتدا لەگەڵ پیاوان الله أكبریان کردووە وە چاك وایە بە دەنگەوە الله أكبر بکرێ ئەگەر چی بەداخەوە موسوڵمانان پشت گوێیان خستووە ، شایەنی باسە الله أكبر کردن لە دوای خوێندنی ئایەتێك لەسەر بڵندگۆکانەوە بە کۆمەڵ پێچەوانەی سوننەتە ٠

### ﴿نوێژی جەژنەکان بێ بانگ و قامەتە﴾

پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کە دەگەیشتنە شوێنی نوێژ کردن بێ ئەوەی بانگ بدرێ و قامەت بکرێ بەکۆمەڵ نوێژیان دەکرد و نەشیان دەوت : (الصلاة جامعة).

## ﴿ كاتی نوێژی جەژن ﴾

زانایان فەرموویانە سەرەتای کاتی نوێژی جەژنەکان دوای دەرکەوتنی خۆر و بەرز بوونەوەیەتی بە ئەندازەی ڕمێك وە ئەو کاتە درێژەی هەیە تاوەکو خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان نزیك دەبێتەوە و لادەدات ، شێخ ئەبوبەکری جەزائیری فەرموویەتی : چاك وایە کە نوێژی جەژنی قوربان لە سەرەتای کاتەکەی دا ئەنجام بدرێ تا خەڵکی بتوانن قوربانیەکانیان سەر ببڕن وە چاك وایە نوێژی جەژنی ڕەمەزان لە سەرەتای کاتەکەیدا ئەنجام نەدرێ و دوابخرێ بۆ ئەوەی خەڵکی بتوانن زەکاتی سەرفترە بەجێ‌ی خۆی بگەیەنن ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنی ڕەمەزانی دوا دەخست و نوێژی قوربانی لە یەکەمی کاتەکەیدا ئەنجام دەدا ٠

### ﴿ نوێژی جەژن هیچ نوێژێکی لە پێش ناکرێ بە پێچەوانەشەوە ﴾

ئیبن عەباس رضي الله عنه فەرموویەتی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی جەژنی ڕەمەزانی کردووە هیچ نوێژێکی نەکرد بەر لە کردنی ئەو نوێژە. وە لە دوای نوێژی جەژنیش بەهەمان شێوە هیچ نوێژێکی تری نەکرد (بوخاری ڕوایەتی کردووە)٠

## ﴿ حوکمی نوێژی جەژن ﴾

ئیمامی شەوکانی فەرموویەتی : نوێژی جەژن ( واجبە ) پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك بە پێویستیەکی عەینی و داکۆکی لەسەر کراو بە کردنی هەندێك لە خەڵکی لەسەر ئەوانی تر لاناچێ ، بەڵگەش بۆ ئەوانە :

١ـ گەر لەگەڵ جومعەدا لە ڕۆژێکدا بوون ئەوا پێویستیەتی جومعە ناهێڵێت و دەتوانرێ تەنها نوێژی جەژن بکرێ وەکو لە فەرمودەیەکی ئەبو هورەیرەدا رضي الله عنه هاتووە ٠

٢ـ پێغەمبەری خوا ﷺ تا مردنی بەردەوام بووە لەسەر ئەو نوێژە بەکۆمەڵ لەو ڕۆژەوەی کراوەتە دیاری بۆ ئەو ئوممەتە ٠

٣ـ لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیشی بە خەڵکی کردووە کە بێنەدەر لە ماڵەکانیان بۆ ئەو نوێژە وەکو پێشتر باسمان کرد ، ئەوانە بەڵگەن لەسەر پێویستی‌یەتی ئەو نوێژە ، ئەوەش بۆچوونی شێخ الإسلام ئیبن تەیمیە و ئەبی حەنیفەو ڕایەکی ئیمامی شافیعی و ڕایەکی ئیمامی ئەحمەدیشە ٠

جێگەی داخە لەناو ئێمەدا واباوە کە لە بری کردنی نوێژی جەژن نوێژی چوو بە خەڵکی دەگێڕنەوە وێڕای لە

دەستدانی ئەو نوێژە ئەوەشی لە کیس دەدەن، دەبا هەموو بزانین کە ئەو کارە پێچەوانەی سوننەتە ٠

## ﴿ چۆنیەتی نوێژی جەژن ﴾

نوێژی جەژن دوو ڕکاتە و لە یەکەمیان دا پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار الله أكبرى دەكرد جگە لە الله أكبرى نوێژ دابەستن وە لە دووەمیاندا پێنج جار الله أكبرى دەكرد جگە لە الله أكبرى چوونە ڕکوع و بەر لە خوێندنی فاتیحا لە نێوان الله أكبرەكاندا كەمێك بێ دەنگ بووە وە هیچ ویردێكی دیاری كراو نەهاتووە لە نێزانیاندا ، بەڵام لە عبداللەی کوڕی مەسعودەوە بیستراوە کە لەنێوان الله أكبرەكاندا سوپاسی خوای گەورەی کردووە و سەڵاواتی لە پێغەمبەر داوە لەگەڵ خوێندنی الله أكبرەكاندا دەستی بەرز نەكردۆتەوە ، وە لەهاوەڵە بەڕێزەكانیشەوە نەبینراوە كە دەستیان بەرز کردبێتەوە ، كاتێك لە الله أكبرەكان تەواو دەبوو فاتیحای دەخوێند و پاش فاتیحا لە ڕکاتی یەكەمدا سورەتی (ق)ی خوێندووە وە لە ڕکاتی دووەمیشدا سورەتی (القمر)ی خوێندووە ، هەندێك جاریش لە ڕکاتی یەكەمدا سورەتی ( الأعلى )ی خوێندووە، وە لە ڕکاتی دووەمیشدا سورەتی (الغاشية )ی خوێندووە وە كاتێك لە خوێندنەوە دەبووەوە دەچووە ڕکوع و پاشان هەڵدەستایەوە و كڕنوشی دەبرد لەهەر ڕكاتێكدا دوو جار كڕنۆشی دەبرد لە ڕکاتی دووەمدا دوای كڕنوشەكان ( تەحیاتی ) دەخوێند و پاشان سەلامی دەدایەوە ٠

**سەرنج :** هەر كەسێك نوێژی جەژنی بە كۆمەڵ نەكرد و لە كیسی چوو ئەوا بۆ خۆی دوو ڕكات نوێژەكە دەكات بە تەنها ، ئەوە بۆچوونی ئیمامی شافیعی و بوخاریە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ٠

## ﴿وتاری جەژن و ئامۆژگاریەكانی پێغەمبەر ﴾

پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك نوێژی تەواو دەكرد ڕووی دەكردە خەڵك و ڕادەوەستا و ئەوانیش بەڕیزەوە لەبەردەمی دادەنیشتن پاشان وتارەكەی بە ( خطبة الحاجة ) دەست پێ دەكردو داكۆكی نەدەكرد لەسەر دانیشتنیان بۆ گوێ گرتن لە ووتارەكەی دەیفەرموو : هەركەسێك ئارەزوویەتی دانیشێت گوێ بگرێ با گوێ بگرێ هەر كەسێكیش دەیەوێت بڕواتەوە ئەوا ئێمە بەرگری لێ ناكەین ٠ دوای ئەوە دەستی دەكرد بە ئامۆژگاری كردنیان لەو شوێنەی كە وتارەكەی ئاراستە دەكردن هیچ

مینبەرێکی لێ نەبوو ، میمبەری مزگەوتی مەدینەشیان نەدەبرد بۆ ئەو شوێنە هەروەها فەرمانی پێ دەکردن کە ماڵ ببەخشن ، لەو ڕۆژەدا ئافرەتان زیاتر خێریان دەکرد ، هەیانبوو ئەنگوستیلەی خۆی دەبەخشی ٠

**﴿سوننەتە وتاری جەژن دوای نوێژ بێت﴾**

ئەبو داود بە سەحیحی ڕوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژ وتاری خوێندۆتەوە ، وە هیچ فەرموودەیەك بە سەحیحی نەهاتووە کە بڵێ وتاری جەژنەکان دوو وتارن و دانیشتن هەیە لەنێوانیاندا وە بە الله أكبر دەستی پێ نەکردووە وەکو لە هەندێك ناوچەدا کردوویانەتە باو ، دواخستنی نوێژ بۆ دوای وتار بیدعەیە و پێچەوانەی سوننەتە ٠

**ڕێ گۆڕین و چۆنیەتی چوون بۆ (مصلی).**

لە ڕۆژی جەژندا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێ گۆڕی دەکرد ، واتە لە ڕێیەکەوە بۆ (مصلی) دەچوو وە لە ڕێگایەکی ترەوە دەگەڕایەوە ٠

بۆخاری لەو بارەیەوە لە جابرەوە فەرموودەیەکی بۆ ریوایەت کردووین وە ترمزی بە سەنەدێکی حەسەنەوە لە ئیمامی عەلی ریوایەتی کردووە کە سوننەت وایە بە پێ بەرەو (مصلی) بچن

وە ئیمامی بەغەوی فەرموویەتی : چاك وایە دوای کردنی نوێژی بەیانی خەڵکی بچن بۆ (مصلی) ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی دەکرد کە بەچەکەوە بچن بۆ ئەو شوێنە وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە ٠

**﴿ شێوازی جەژنە پیرۆزە ﴾**

جوبەیری کوڕی نوفەیر فەرموویەتی : هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە لە ڕۆژی جەژنا بە یەکتری دەگەیشتن دەیان ووت : ( تقبل الله منا ومنك ) ٠

سوننەتە لە کاتی بەیەك گەیشتن ئەوە بووترێت ، بەڵام بەداخەوە ئەم سوننەتەش وەك زۆرێك لە سوننەتەکانی تر زیندە بەچاڵ کراوە و ووتەی داهێنراوی جۆراو جۆری لە شوێن دانراوە، کە جێی ئەو ناگرنەوە و ئەو ئەجر و پاداشتە وەدەست ناهێنن ٠

**﴿ڕێ دراوە بە بیستنی دەنگی دەف کە کچۆڵە لێی بدەن ﴾**

بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە فەرموودەیەکیان ریوایەت کردووە کە لە ڕۆژانی جەژندا لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ کچۆڵە دەفیان لێ داوە و پێغەمبەری خوا بەرهەڵستی نەکردوون ، وە بە ئەبوبەکریشی فەرمووە : وازیان لێ بهێنە

چونکە هەموو گەلێك جەژنی خۆیان هەیە و جەژنی ئێمەی موسوڵمانیش ئەمەیە ٠

**سەرنج :** لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ تەنها بۆ جەژن و ژن و ژن خوازی دەف ڕێ پێ دراو بووە و تەنها کچۆڵە و ئافرەتانیش لێیان داوە ، بەلام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەندێك پیاو جێی ئەوانیان گرتۆتەوە و لە شوێنی تریشدا بەکاری دەهێنن ، وە لەوەش سەیرتر هەندێك کەس لە دەشەوەکانی کۆتایی ڕەمەزاندا لە جیاتی زیکر و دوعا و نوێژ لە مزگەوتەکاندا موسوڵمانانی پێ سەرقاڵ دەکەن و لە عیبادەتی خوا لەو دە شەوەدا مەحرومیان دەکەن ٠

ڕۆژو گرتن لە ڕۆژانی جەژندا حەرامە

پێغەمبەری خوا نەهی کردووە لەوەی کە موسوڵمانان لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان وڕۆژانی جەژنی قوربان بەڕۆژوو بن، وە دەیفەرموو ئەو ڕۆژانە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن .

هەندێك لەو کارە بەدانەی کە لە جەژندا دەکرێن

ڕۆژانی جەژن ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو یادکردنی خوان، نەك سەرپێچی وتاوان و یاخی بوون لەخوا بەم شێوانەی خوارەوە:

١. ریش تاشین " چونکە حەرامەو قەدەغەیە بە بەڵگەی چەندان فەرموودەی ڕاست، وە بەگوێرەی مەزهەبی خودی ئیمامی شافیعی و زۆر لە ئیمامەکانی تریش.

٢. تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتی نا مەحرەم وبێگانە، چونکە حەرامەو هەڕەشەی توندیش هاتووە لەم بارەیەوە.

٣. لاسایی کردنەوەی بێ باوەڕان لە جل وبەرگ و تێکەڵاو بون و...هتد " چونکە مرۆڤ خۆی لە هەر قەومێك بچوێنێ ئەوە لەوانە، وە لەحەدیسی صەحیحدا هاتووە(من تشبّه بقوم فهو منهم).

٤. زیادە مەسرەفی و زیادە ڕەوی کردن لەو شتانە کە هیچ بەرژەوەندییەکیان تێدا نییە.

٥. چونە سەر قەبران لە یەکەمین ڕۆژی جەژندا، وە چواندنی نوێژی جەژن لەبەر ئەمە، وێڕای ئەو هەموو بەرەڵایی و تێکەڵ بونەی لەنێوان پیاوان وئافرەتاندا روو دەدات لە گۆڕستانەکان.

٦. تایبەت کردنی شەوی جەژن بە هەندێ پەرستنی بێ بنەماو داهێنراو.

٧. فەرمان کردن بە واز هێنان لە نوێژی جەژن و گێڕانەوەی نوێژە چووەکان لەبری ئەو!.

٨. تایبەت کردنی زەکاتی سەرفیترە بە کەسانێکی دیاری کراو ئەگەر هەمووشیان شیاوو شایستەش نەبن!.




## سوننەتی شەووال

لە (ثوبان)ەوە دەگێڕنەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە لـە پێغەمبـەری گێڕاوەتـەوە ﷺ کە فەرمویەتی :

(( من صام رمضان فشهر بعشرة أشهر، وصيام ستة أيام بعد الفطر فذلك تمام صيامه السنة )) [١]

**(هەرکەسـێک ڕەمـەزان بـە ڕۆژوو بێـت، ئـەوە ئـەو مانگـە بـە دە مـانگ حیسابە ، وە بەڕۆژو بونی شەش ڕۆژیش دوای جەژن لـە مـانگی شـەووال ، بـە شەسـت ڕۆژ حیسـابە ، ئـەوە دەکاتـە تەواوی بەڕۆژوو بوونی ساڵەکە).**

**چونکە یەک خێر بە دە حیسابە، بە فەزڵ و کەرەم و ڕەحمەتی خوا.**

**والحمد لله**




## لەبیدعەکانی شەووال

١- بەواجب زانینی شـەش ڕۆژوەکـەی مانگی شەووال .

٢- بـەواجب زانینـی بـەدوای یەکـدا گرتنی شەش ڕۆژوەکەی مانگی شەووال .

وەیـەکێکی تـر لـە سەرپێچـی‌یەکان ئەوەیەکـە هەنـدێك کـەس لەسـەر خـۆی واجـب کـردووە کـە دەبێـت شـەش ڕۆژوەکەی شەووال بەدوای یەکدا بگرێت، ئەوەش لەسەرخۆ قورس کردنـەو شـەرع دانانە کەخوای گەورە ڕێگەی پێ نەداوە. بـەڵکو دەتـوانی بەویسـتی خـۆت حـوت ڕۆژی لێك دوور لەو مانگەدا هەڵبژێریت.

٣ - باوەڕ بوون بەوەی کـە گـەورەیی ئەم شـەش ڕۆژووە لەوەدایـە کەیەکسـەر لـەدوای جەژنـەوە بگیرێـت . ئـەوەش لەسەر خۆ گران کردنە ، بەڵکو دەتـوانی یەکسەر دوای جەژن بـەڕۆژوو بێـت یـان لەناوەڕاستی مانگەکەدا، یان لەکۆتاییدا






(١) ((رواه أحمد في المسند)) (٥/٢٨٠) . وابن ماجه ، حديث رقم (١٧١٥)وابن خزيمة ، حديث رقم (٢١١٥).

# نماذج من الشرك
# التي حذَّر منها علماءُ الشافعية

الدكتور: محمد الخُمَيِّس

جاء عن الإمام الشافعي رحمه الله تعالى وبعض أتباعه النهي عن أنواع الشرك الأكبر والأصغر: كالدعاء والاستغاثة بغير الله[1]. والسجود لغير الله[2]، والركوع لغير الله[3]، والنذر لغير الله[4]، والذبح لغير الله[5]، أو اعتقاد أن أحدا يعلم الغيب[6]

---

(١) لقوله تعالى: ﴿إذ تستغيثون ربكم فاستجاب لكم﴾ (سورة الأنفال، الآية: (٩)). ولقوله تعالى: ﴿وقال ربكم ادعوني أستجب لكم إن الذين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين ﴾ (٦٠) (سورة غافر، الآية (٦٠). قوله تعالى: ﴿ ومن أضل ممن يدعوا من دون الله من لا يستجب له إلى يوم القيمة وهم عن دعائهم غافلون﴾ (سورة الأحقاف، الآية: (٥) .وقول النبي ﷺ: **((إن الدعاء هو العبادة))**.

ولمزيد من التعرف على أقوال الشافعية: انظر الإعلام بقواطع الإسلام لابن حجر المكي ص (٩٥، ٧١)والعقد الثمين، وتطهير الجنان ص (٣٨).

**وأما ما حكى بعضهم عن الشافعي انه قال: ((إذا نزلت بي شدة أجيء فأدعو عند قبر أبي حنيفة فأجاب ))** قال الآلوسي الحنفي: **هذا كذب معلوم كذبه عند من له معرفة بالنقل**؛ فإن الشافعي لما قدم بغداد لم يكن ببغداد قبر ينتاب للدعاء عنده البتة، بل و لم يكن عند عهد الشافعي معروفا وقد رأى الشافعي بالحجاز واليمن والشام والعراق ومصر من قبور الأنبياء والصحابة والتابعين من كان أصحابها عنده وعند المسلمين أفضل من أبي حنيفة وأمثاله من العلماء، فما باله لم يتوخَّ الدعاء إلا عنده ؟ ثم أصحاب أبي حنيفة الذين أدركوه مثل أبي يوسف ومحمد وزفر والحسن بن زياد وطبقتهم لم يكونوا يتحرون الدعاء لا عند قبر أبي حنيفة ولا عند قبر غيره، ثم إن الشافعي قد صرح في بعض كتبه بكراهة تعظيم القبور خشية الفتنة بها، **وإنما** يضع مثل هذه الحكايات من يقلُّ علمه ودينه **وإما** أن يكون المنقول من هذه الحكايات عن مجهول لا يعرف ونحن لو روي لنا مثل هذه الحكايات المسيَّبَة أحاديث عمن لا ينطق عن الهوى لما جاز التمسك بها حتى تثبت بطرق أهل الحديث فكيف بالمنقول عن غيره . **ومنها** ما قد يكون صحابي قاله أو فعله باجتهاد يخطئ ويصيب أو قال بشروط وقيود كثيرة على وجه لا محذور فيه فحرف النقل عنه كما أن النبي ﷺ: **لما أذن فى زيارة القبور بعد النهي فهِم المبطلون أن ذلك هو الزيارة التى يفعلونها من حجها للصلاة عندها والاستغاثة بها.**

**ثم سائر هذه الحجج دائرة بين نقل لا يجوز إثبات الشرع به، أو قياس لا يجوز استحباب العبادات بمثله مع العلم بأن الرسول ﷺ لم يشرعها** )).فتح المنان ص (٣٧٢– ٣٧٣).

(٢) لقوله تعالى: (يمريم اقنتي لربك واسجدي واركعي مع الراكعين (٤٣)) ﴿ سورة آل عمران، الآية: (٤٣)﴾.ولمعرفة موقف الشافعية انظر روضة الطالبين (٢٨٣/٧، ٢٨٤)، والجمل على شرح المنهج (١٢٤/٥) ومغني المحتاج (١٣٦/٤)، والإعلام بقواطع الإسلام (٩٥، ٦٣، ١٩، ٩٣، ٩٨ ، ٢٠، ٢١، )، وتطهير الجنان ص (٣٧).

(٣) لقوله تعالى: ﴿ يمريم اقنتي لربك واسجدي واركعي مع الراكعين (٤٣)﴾ (سورة آل عمران، الآية: (٤٣) ). ولمعرفة موقف أئمة الشافعية . انظر الجمل على شرح المنهج (١٢٤/٥).

(٤) لقوله تعالى: ﴿وليوفوا نذورهم ﴾ [سورة الحج، الآية: (٢٩)]. **فالنذر عبادة لا تنبغي إلا لله تعالى .**

ولمزيد التعرف على أقوال الشافعية انظر: المجموع (٤٣٥/٨)، ومغني المحتاج المجيد ص (٢١٣)، وقرة عيون الموحدين ص (٩٦، ٨٦).

(٥) لقوله تعالى: ﴿ قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين (١٦٢)﴾ (سورة الأنعام، الآية: (١٦٢)].

**فالذبح عبادة لا تنبغي إلا لله وعلى اسم الله ولا يجوز أكل ما لم يذكر اسم الله عليه .**

ولمعرفة أقوال أئمة الشافعية انظر: روضة الطالبين (٢٨٤/٧)، والزواجر (١٦٧/١)، والعقد الثمين ص (٢٢٢)، وتطهير الجنان ص (٣٧).

(٦) لقوله تعالى: ﴿علم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا (٢٦)﴾[سورة الجن، الأية: (٢٦)]. وقوله تعالى : ﴿ قل لا يعلم من في السموات والأرض الغيب إلا الله﴾[سورة النمل، الآية: (٦٥)].

والحلف بغير الله [(٧)]، وقول ما شاء الله وشئت[(٨)]، واعتقاد أن السحر له تأثير بذاته[(٩)]

### قال الشافعي:

(ومن حلف بشيء غير الله جل عز مثل أن يقول الرجل: ((والكعبة، وأبي، وكذا و كذا مكان، فحنث فلا كفارة عليه، ومثل ذلك قوله: لَعمري لا كفارة عليه، وكل يمين بغير الله فهي مكروهة منهي عنها من قبل قول رسول الله ﷺ ((إن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم فمن كان حالفاً فليحلف بالله أو ليسكت ))[(١٠)] أخبرنا ابن عيينة، قال: حدّثنا الزهري، قال: حدّثنا سالم عن أبيه قال: سمع النبيّ ﷺ عمرَ يحلف بأبيه فقال: ((ألا إن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم قال عمر -رضي الله عنه- والله ما حلفت بها بعد ذلك ))[(١١)]

### وقال الشافعي -رحمه الله -:

((فكل من حلف بغير الله كرهت له وخشيت أن تكون يمينه معصية))[(١٢)]

### وقال ابن حجر الهيتمي المكي:

(( الكبيرة السابعة والستون بعد المائة: الذبح باسم غير الله على وجه لا يكفر به، بأن لا يقصد تعظيم المذبوح له، كنحو التعظيم بالعبادة والسجود إلى أن قال: وجعل أصحابنا مما يحرم الذبيحة أن يقول باسم الله واسم محمد أو محمد رسول الله بجر أسم الثاني أو محمد إن عرف النحو فيما يظهر أو يذبح كتابي لكنيسة أو لصليب أو لعيسى ومسلم لكعبة أو لمحمد ﷺ أو تقرب بالسلطان أو غيره أو للجن فهذا كله يحرم المذبوح وهو كبيرة))[(١٣)]

---

ولمعرفة أقوال الشافعية: انظر الإعلام بقواطع الإسلام ص(٦٩، ٧١)، العقد الثمين، البغوي (٤/٤٠٥-٤٠٦).

(٧) لقوله ﷺ: ((من حلف بغير الله فقد أشرك)) وفي لفظ: ((فقد كفر)).

ولمعرفة أقوال الشافعية: انظر الأم (٦١/٧) المجموع ص (١٩، ٢٢٧ – ٢٢٨)، شرح السنة (٩/١٠)، إحكام الأحكام لابن دقيق العيد (١٤٤/٤)، حلية العلماء (٢٤٦/٧)، ومغني المحتاج (٣٢٤/٤)، والجمل على شرح المنهج (٢٨٨/٥)، وفتح الباري (٥٠٣/١١-٥٣١).

(٨) **لقول النبي ﷺ: ((أجعلتني لله ندا ؟ قل ما شاء الله وحده )) وذلك لمن قال له ما شاء الله وشئت .**

ولمعرفة موقف الشافعية انظر: شرح السنة (٣٦٠-٣٦١).

(٩) لقوله تعالى: ﴿ فلما ألقوا سحروا أعين الناس واسترهبوهم وجاءوا بسحر عظيم ﴾ ﴿سورة العراف، الآية: (١١٦)﴾ وقوله تعالى : ﴿إنما صنعوا كيد سحر ولا يفلح الساحر حيث أتى﴾ [سورة طه، الآية: (٦٩)]. وانظر موقف الشافعية في كتاب الإعلام بقواطع الإسلام ص (٩٨).

(١٠) أخرجه البخاري (٥٣٠/١١) ح (٦٦٤٦) في الأيمان والنذور باب لا تحلفوا بآبائكم، ومسلم في الأيمان (١٢٦٦/٣) ح (١٦٤٦) باب النهى عن الحلف بغير الله، والنسائي (٤/٧) في الأيمان باب الحلف بالآباء وأبو داود (٥٦٩/٣) ح (٣٢٤٩)، في الأيمان باب في كراهية الحلف.

(١١) أخرجه أبو داود (٥٧٠/٤)، في الأيمان باب في كراهية الحلف بالآباء، والنسائي كتاب الأيمان باب الحلف بالآباء (٤/٧) ح (٢٧٦٦) وابن ماجة في الكفارات (٦٦٧/١) ح (٢٠٩٤) من رواية سالم عن أبيه عن عمر رضي الله عنه . (١٢) كتاب الأم (٦١/٧).

(١٣) الزواجر (٢٨٤/١-٢٨٥).

وقال الرافعي في شرح المنهاج:

((وأما النذر للمشاهد التي على قبر ولي أو شيخ أو على أسم من حلها من الأولياء أو تردد في تلك البقعة من الأولياء والصالحين فإن قصد الناذر بذلك —وهو الغالب أو الواقع قصود العامة—تعظيم البقعة أو المشهد أو الزاوية أو تعظيم من دفن بها أو نسب إليه أو بنيت على اسمه، فهذا النذر باطل غير منعقد فإن معتقدهم أن لهذا الأماكن خصوصيات ويرون أنها مما يدفع بها البلاء، ويستجلب بها النعماء، ويستشفى بالنذر لها من الأدواء حتى إنهم ينذرون لبعض الأحجار لما قيل لهم إنه استند إليها عبد صالح، وينذرون لبعض القبور السرج والزيت، ويقولون: القبر الفلاني أو المكان الفلاني يقبل النذر، يعنون بذلك أنه يحصل به الغرض المأمول من شفاء مريض، أو قدوم غائب، أو سلامة مال، وغير ذلك من أنواع نذر المجازات، فهذا النذر على هذا الوجه باطل لا شك فيه، بل نذر الزيت والشمس ونحوهما للقبور باطل مطلقاً، ومن ذلك نذر الشموع الكثيرة العظيمة وغيرها لقبر الخليل، عليه السلام، ولقبر غيره من الأنبياء والأولياء، فإن الناذر لا يقصد على القبر إلا تبركاً وتعظيماً ظاناً أن ذلك قربة، فهذا مما لا ريب في بطلانه، والإيقاد المذكور محرّم سواءً انتفع به هناك منتفع أم لا))(١٤)

وقال **النووي** : ((إذا نذر المشي إلى مسجد غير المساجد الثلاثة، وهي: المسجد الحرام، والمدينة، والأقصى لم يلزمه ولا ينعقد نذره عندنا ))(١٥)

وقال **ابن حجر المكي في شرح المنهاج**: ((لا يقول باسم الله واسم محمد )) قال بن حجر ((يحرم عليه ذلك للتشريك؛ لأن من حق الله تعالى أن يجعل الذبح باسمه فقط كما في اليمين باسمه، نعم إن أراد الذبح باسم الله والتبرك باسم محمد كره فقط))

وقال أحمد بن حجر آل بوطامي الشافعي:

((أي لا ينذروا لغير الله، ولا يطوفوا بغير البيت العتيق، فلا يجوز النذر للأولياء ولا للصالحين ولا الطواف بقبورهم كما يفعله الجاهلون بقبر الجيلاني، والحسين، والبدوي، والدسوقي، وغيرهم فإن هذا شرك لا مراء فيه، وكثير من المبتعدين الجاهلين ينذر للصالحين، وبعضهم يرسل أموالاً ... للسدنة ولتعمير القباب كما يفعل ذلك الكثير من الهنود والباكستانيين بنذرهم لعبدالقادر الجيلاني، وإرسالهم إلى ضريحه أموالاً وافرة، هذا ممن زعم أنه من أهل السنة وأما شيعة الهنود والباكستانيين والإيرانيين فإنهم ينذرون أموالاً بقبورهم أهل البيت في النجف وكربلاء وخراسان وقم، ويشدون الرحال من مختلف الأقطار

(١٤) فتح المجيد ص (٢١٣).

(١٥) المجموع (٨/٤٧١).

إلى تلك القبور للطواف بها، والاستغاثة بساكنها وطلب قضاء الحاجات وتفريج الكربات مما لا يقدر عليه إلا خالق الأرض والسماوات، وكذلك لا يجوز النذر لقبور الأولياء والصالحين، فكذا لا يجوز الوقف من بيوت وعقار على قبورهم، فمن نذر لغير الله فلا يجب عليه الوفاء، بل يستغفر الله، ويتوب إليه، ويأتي بالشهادتين لأنه مرتد إن علم أن النذر لغير الله شرك، ومن وقف عقاراً أو حيواناً على قبور الأولياء فوقف باطل، أو وصّى لها فوصيته فوصيَّته باطلة، وذلك العقار أو الحيوان لا زال على ملك صاحبه، نسأل الله لنا ولهم التوفيق.

**وقول بعضهم: إن النذر لله والثواب للولي كلام باطل وضلال عاطل؛ فأيُّ شيءٍ أدخل الولي هنا ؟!** إن كان قصده الصدقة فليتصدق على الفقراء عن نفسه وعن أبويه وأقاربه، **وما يدريه بأن صاحب هذا القبر ولي ! والأمور بخواتيمها فقد يكون ظاهره صديقاً، وباطنه زنديقاً،** ويظهر كذبهم وضلالهم أنهم يأخذون الأغنام ويذبحونها عند القبر، فإذا أنكرت عليهم قالوا الذبح لله والثواب للولي، وليس القصد من هذا إلا التلبيس وقلب الحقائق، وهم لم يقصدوا إلا الولي. على أن العلماء قد صرَّحوا أن لا يذبح لله بمكان يذبح فيه لغير الله للحديث عن ثابت بن الضحاك قال (نذر رجل أن ينحر إبلاً ببُوانةَ فسأل النبي ﷺ فقال هل كان فيه وثن من أوثان الجاهلية يُعبَد؟)) قالوا: لا، فقال رسول الله ﷺ: أوف بنذرك فإنه لا وفاء للنذر في معصية الله ولا فيما لا يملك ابن آدم))[16] ...[17]))

**وقد أجاب أحمد بن حجر آل بوطامي الشافعي عن شبهات القبورية** وهي:

**الأولى:** قول بعض الجاهلين: إن هؤلاء –يعني القبوريين–يقرون بالخالق، ويعتقدون بشرائح الإسلام وبيوم الجزاء، وغاية ما هنالك أنهم يتوسلون بهؤلاء الصالحين، ولا يرضون بلقب الشرك، بل ينفرون منه، فكيف يمكن أن يقال: بأنهم مشركون؟

**الثانية:** أن المشركين كان كفرهم من أجل إنكارهم للربوبية لا من حيث صرف العبادة لغير الله مستدلين بقوله تعالى:

[قَالُوا وَمَا الرَّحْمَنُ][18]

وبقوله تعالى (وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ)[19]

**أجاب بما يأتي:**

---

(١٦) اخرجه أبو داود كتاب الأيمان والنذور باب ما يؤمر به من الوفاء بالنذر (٣/٦٠٧) ح (٣٣١٣) والبيهقي في السنن (١٠/٨٣) والطبراني في الكبير ح (١٣٤١) من حديث ثابت بن الضحاك وصححه الحافظ ابن حجر في تلخيص الحبير (٣١-٣٢).

(١٧) تطهير الجَنان ص (٣١-٣٢).

(١٨) سورة الفرقان ، الآية (٦٠)

(١٩) (الرعد: من الآية٣٠)

الجواب عن الشبهة الأولى: قال فالجواب عن تسميتهم مشركين أن الكفر والشرك شعب وأنواع كما أن الإيمان له شعب، فإذا ما أتى بكثير من شعب الإيمان وأتى معه بشيء من شعب الشرك، فيقال له-مطلقا لا تعييناً-: مشرك. مثلاً لو صلى وصام واعتقد بالرسالة والقيامة واتصف بالزهد ومكارم الأخلاق لكنه اعتقد في كوكب بأن له تأثيرا، أو أن بيده نفعاً أو ضراً، أو اعتقد في ملَك أو رسول ما لا يجوز اعتقاده إلا في الله فنسيمه مشركاً، وإن أتى بتلك الأعمال الصالحة، **وإلا فما معنى كتاب الردة**، ولا يلزم أن يحكم على أحد بكفر أو شرك إلا إذا أتى بجميع خصاله وأنواعه!.

وتوسلهم لاعتقادهم بأنهم مذنبون وهؤلاء أقرب عند الله فيوسطونهم بينهم وبين الإله، هذا هو شرك العرب بعينه.

وأما تشهُّدهم بالشهادتين فهو منتقض بأعمالهم المنافية لهما، كالحدث بعد الوضوء.

وإقرارهم بالخالق لا يفيد لأن المشركين كانوا مقرِّين بالربوبية ولم يُدخلهم في الإسلام .

وأما قول من يقول بأن مشركي العرب كانوا منكرين للبعث .

فالجواب: أن هذا الاعتقاد من جملة المكفرات، والرسول ﷺ كفَّرهم وأباح دماءهم لأمور كثيرة، أعظمها عبادتهم للأوثان ومنها إنكارهم للبعث، ولا يقبل من الإنسان أن يؤمن ببعض ويكفر ببعض، بل واجب عليه أن يذعن معتقداً بكل ما أتى به القرآن وجاء به الرسول ﷺ ويعمل بها، فمن آمن ببعض ولم يؤمن بالبعض الآخر فهو كافر، كما قال الله -تعالى- مخبراً عنهم:

﴿وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾[٢٠]

**ولا ينفعهم مجرد النطق بكلمة الشهادتين حتى يعمل بمقتضاها؛ من البراءة مما يعبد من دون الله، وصرف جميع العبادات كائنة ما كانت إلى الله.**

ولكن هل يحكم على الشخص المعين أو الطائفة المخصوصة المتلوثة بتلك الخصال المنافية للتوحيد بالشرك والكفر؟ مع أنها مؤمنة بالله والرسول، وآتية بسائر الشرائع؟.

الجواب: يقال هذا العمل شرك وكفر مثلاً كالسجود للولي والطواف بقبره أو النذر له، ولكن الشخص المعين أو الطائفة المخصوصة لا نبادرها بالتفكير بل الواجب تبليغها بآيات القرآن وأحاديث الرسول ﷺ المبينة للشرك والمحذرة عنه، وأن ليس لصاحبه نصيب من الجنة، وان هذه الأعمال هي شرك فإذا أصر الشخص المعين أو الطائفة المخصوصة وعاندت ولم تقبل، فعند

(٢٠) (النساء: من الآية ١٥٠)

ذلك يحل إطلاق الشرك عليها أو عليه إن كان فرداً معيّناً.

وليكن الشخص ذا تفرقة بين الشرك الأصغر والشرك الكبر، كالرياء فإنه شرك أصغر، والسجود والنذر لغير الله أكبر ...

فإن قيل يلزم من كلامكم تكفير الأكثرية من الأمة المحمدية حيث إهم يعملون ما تقولون بأنه شرك مثل النذر للأولياء والنحر لهم:

فالجواب: أولاً: أن القول بالعموم مغاير للقول بالخصوص.

ثانياً: غلبة الجهل، وقلة العلم بالتوحيد والسنة المطهرة، ومعرفة الشرك وأقسامه وذرائعه في كثير من الأماكن والبلدان هو المانع من الحكم بالشرك على المعين، إلا من بلغته النصوص وقامت عليه الحجة ثم أصر معانداً فذاك يحكم عليه بالشرك))[٢١]

الجواب عن الشبهة الثانية: ((أن الآية الأولى: فيها استفهام عن الرحمن، والاستفهام عن الشيء لا يكون جحداً له، على أننا لو قلنا استفهام إنكاري فإنه إنكار للتسمية بالرحمن لا غير، كما يوضحه كتابه صلح الحديبية. والآية الثانية: فيها الكفر بالرحمن، والكفر بالشيء لا يكون إنكاراً له؛ تقول لمن فعل فعلاً: كفر فلان، وهذا يدل على أنه منكر للرب، على أنه معارض بالآيات المُنَبِّئة عن اعترافهم بالربوبية ))[٢٢]

**ومن هنا يتبين لنا مدى تحذير علماء الشافعية من الشرك وعاقبته الوخيمة في الدنيا والآخرة ،والله المستعان وعليه التكلان.**



(٢١) العقائد السلفية بأدلّتها النقليّة والعقلية.ص:٣٧-٤٠

(٢٢) المصدر السابق نفسه ص٤٤.